# ناوەرۆك

# ڕێنماییەکانی بڵاوکردنەوە
# لە گۆڤاری (ئەکادیمی کوردی)دا

گۆڤاری ئەکادیمی گۆڤارێکی وەرزییە. لێکۆڵینەوە زانستییەکانی ناوەوە و دەرەوەی هەرێمی کوردستانی عێراق، بڵاودەکاتەوە. بەگوێرەی ڕێنماییەکانی بڵاوکردنەوە، لێکۆڵینەوەکان بۆ پلەی زانستیی سوودمەند دەبن. بۆیە پێویستە لێکۆڵینەوەکان گرفت و ئاریشەکی دیاریکراو یان پێشبینی کراو، چارەسەر بکەن و، بیروهزرێکی ڕەسەن یان تازە لە خۆ بگرن، یان لایەنێکی زانستی بدۆزنەوە. نابێت لێکۆڵینەوەکان لە هیچ گۆڤارێکی دیکە بڵاوکرابنەوە یان پەسەندی بڵاوکردنەوەی لەسەر درابێت. هەروەها، ناشبێت لە بەشێکی نامەی ماجستێر و دوکتۆراە وەرگیرابن، کە لێکۆڵەر پێشتر ئامادەی کردوون.

# ڕێنماییەکانی تایبەت بە شێوە و ناوەرۆك و پێکهاتووی لێکۆڵینەوە

(١) لێکۆڵینەوەکە، بە چوار دانە، لەسەر کاغەزی سپی پێوانە (A4)، بە مەرجێك لە هەر چوار لاوە، دووری (٢,٥)سم بەجێ هێشترابێت، دەنێردرێت. ژمارەی گشت لاپەڕەکانی لێکۆڵینەوەکە، بۆ زانستەڕووتەکان و پراکتیکییەکان لە (٢٠) لاپەڕە تێپەڕ نەکات و، لێکۆڵینەوە زانستەمرۆییەکانیش، بە وێنە و خشتەکانیانەوە، لە (٢٥) لاپەڕە پتر نەبێت.

(٢) لەگەڵ لێکۆڵینەوەکە، هاوپێچێك هەبێت، ناونیشانی لێکۆڵینەوەکە و ناو و شوێنی کارکردن و پلەی زانستی و کار و وەزیفەی لێکۆڵەر، لە خۆ بگرێت.

(٣) زمانی بلاوکردنەوە، زمانی کوردییە، بەلام لێکۆڵینەوە بە زمانی عەرەبی و ئینگلیزیش بلاودەکاتەوە. کورتەی لێکۆڵینەوەکەش Abstract، بە هەر سێ زمان دەبێت.

(٤) ناوەرۆك و پێکهاتەی لێکۆڵینەوەکە بەم جۆرە دەبێت:

أ) ناونیشانی لێکۆڵینەوەکە، بە شێوەیەکی کورت و پوخت و گشتگیر، لە ناوەڕاستی سەرووی لاپەڕەی یەکەم، دادەندرێت.

ب) کورتەی (Abstract) لێکۆڵینەوەکە، بە دوو زمانەکەی تر دەبێت، کە لێکۆڵینەوەکەی پێ نووسراوە، بەمەرجێك لە (١٥٠) وشە تێپەڕ نەکات و ئەو ئامانج و ئەنجامە لە خۆ بگرێت، کە لێکۆڵەر پێی گەیشتووە.

(ج) پێشەکی و ناوەرۆك و ئەنجام.

(٥) شێوازی سەرچاوەکان لە پەراوێزدا:

أ) ئەگەر وەرگرتنی بێ دەستکاریی (الاقتباس) لە کتێب وەرگیرا، ناوی نووسەر یان دانەر بەبێ پاش و پێش، ناونیشانی تەواوی کتێبەکە، ناوی بڵاوکەرەوە، چاپ (جگە لە چاپی یەکەم)، شوێن وساڵی چاپکردن، لاپەڕە، تۆمار دەکرێت.

ب) ئەگەر وەرگرتنی بێ دەستکاریی (الاقتباس) لە لێکۆڵینەوە وەرگیرا، ناوی لێکۆڵەر، ناونیشانی لێکۆڵینەر، ناوی گۆڤار، ژمارەی گۆڤار، شوێن و ساڵی چاپ، لاپەڕە، تۆمار دەکرێت.

(٦) ئەگەر لێکۆڵینەوەکە ساغکردنەوەی دەستنووسێك لەخۆ بگرێت، پێویستە ڕێوشوێنی بنەما و پرۆگرامی زانستی لەگەڵ لێکۆڵینەوەکە، هاوپێچ بکرێت.

(٧) بەڕەچاوکردنی بیرۆکەی بنەڕەتی لێکۆڵینەوەکە، دەستەی نووسەران، ئەو مافەی هەیە دەستکاری هەندێ لایەنی دارشتن بکات بۆ ئەوەی لەگەڵ شێوازی بڵاوکردنەوەیدا، بگونجێت.

(٨) واباشە لێکۆڵینەوەکە لەسەر (CD) تۆمار کرابێت و چوار دانەی ڕاکێشراویش لەگەڵیدا هاوپێچ بکرێت.

(٩) لێکۆڵینەوەکە، نیشانی سێ شارەزای پسپۆری بابەتەکە دەدرێت، ئەگەر پەسەندکرا، ئەوا لەلایەن دەستەی نووسەرانی گۆڤارەکە، ڕەزامەندی لەسەر دەدرێت.

(١٠) ئەو لێکۆڵینەوانەی گۆڤاری ئەکادیمی بڵاویان دەکاتەوە، دەربڕین لە بیروبۆچوونی نووسەر دەکەن، پێویستییەتی دەربڕینی گۆڤارەکە، ناگەیەنن.

سەرنووسەری گۆڤاری ئەکادیمی

**پ. د. موحسین محەممەد حسێن**

# تعليمات النشر
# في مجلة (الاكاديمية الكردية)

المجلة مجلة فصلية. ينشر فيها النتاج العلمي من داخل وخارج اقليم كردستان ـ العراق. وتكون البحوث مستوفية للتعليمات الخاصة بالنشر وتخضع للتقويم العلمي. ويتعيّن ان يتضمن البحث حلاً لمشكلة قائمة أو متوقعة، أو يتضمن فكرة أصيلة أو جديدة أو اكتشافاً علمياً، على ان لايكون منشوراً أو مقبولاً للنشر في مجلة أخرى. كما يتعين ألا يكون البحث مستلاً من رسالة الماجستير أو الدكتوراه، سبق وأن اعدها الباحث.

# التعلميات الخاصة
# بالشكل وترتيب البحث

١ـ يرسل البحث بأربع نسخ على اوراق بيضاء من قياس (A4) مع ترك مسافة ٢,٥سم من الجهات الاربعة، على ان لايزيد عدد الصفحات الكلية للبحث عن (٢٠) صفحة لبحوث العلوم الصرفة والتطبيقية وعن (٢٥) صفحة لبحوث العلوم الانسانية بضمنها الاشكال والجداول.

٢ـ ترفق بالبحث ورقة تتضمن عنوان البحث وإسم الباحث ومركز عمله، ومرتبته العلمية ووظيفته.

٣ـ لغة النشر هي اللغة الكردية، ولامانع لنشر بحوث باللغتين العربية او الانگليزية. وتوضع الملخصات Abstracts باللغات الثلاث.

٤ـ يرتب البحث على النحو التالي:

أـ عنوان البحث: يتوسط أعلى الورقة الاولى، ويفضل ان يكون قصيراً وشاملاً.

ب ـ يكون الملخص Abstract باللغتين الأخريين، على الا تزيد كلماته عن ١٥٠كلمة يوضِّح فيه الباحث الهدف من البحث والنتائج والتوصيات المهمة التي توصّل اليها.

ج ـ المقدمة والمتن والنتائج.

٥ـ اسلوب ترتيب المصادر في الهوامش.

أ ـ إذا كان الإقتباس من كتاب: يدوَّن اسم المؤلف. بدون قلب الاسم، عنوان الكتاب بالكامل، الناشر، الطبعة، (عدا الطبعة الاولى)، مكان وتاريخ الطبع، الصفحة.

ب ـ إذا كان الإقتباس من بحث: يدوَّن اسم الباحث، عنوان البحث، اسم المجلة الناشرة، رقم المجلة أو العدد، مكان وتاريخ النشر، الصفحة.

٦ـ حين يكون البحث تحقيقاً لمخطوطة تتّبع القواعد والمناهج العلمية المعروفة، وترفق بالبحث ست صفحات من المخطوطة.

٧ـ تحتفظ هيئة التحرير بحقّها في أن تحذف أو تعيد صياغة بعض الالفاظ، بما يتلاءم مع اسلوبها في النشر، مع مراعاة المحافظة على الفكرة الأصلية دون المساس بها.

٨ـ يستحسن ارسال البحث على CD وارساله برفقة النسخ المذكورة.

٩ـ يعد البحث مقبولاً للنشر، ويزوِّد الباحث بقرار هيئة التحرير بقبوله بعد عرضه على ثلاثة محكّمين (خبراء) من ذوي الاختصاص.

١٠ـ ماينشر في المجلة يعّبر عن وجهة نظر الباحث، وليس بالضرورة تعبيراً عن وجهة نظر المجلة.

رئيس تحرير المجلة

**أ.د. محسن محمد حسين**

# کتێبی (ئیساغۆجی) و ڕۆڵی لۆجیکی ئەرەستۆتالیسی لە خوێندنی حوجرەکانی کوردستاندا

حەمەکەریم هەورامی

لەوەتـەی حـوجرەی فـەقێ لـە کوردسـتاندا لـە سووچـێکی مزگەوتەکانـدا وەکو خوێندگا و بنکەی ڕۆشنبیری سەردەمی خۆی کەوتووەتـە کـار، بـەپێی ئەو سەرچاوانەی کە دەستمان کەوتوون و لەمەودوا باسیان دەکـەین پـتر لـە هەشت سەد ساڵ دەبێ ئەو حوجرەیە بۆ خوێندنی قورئان و ئاینی ئیسلام لە تەك مزگەوتدا دامەزراوە.

لە ماوەی ئەو مێژووە درێژەیدا بەرنامەی خوێندنی بە شێوەیەکی عـەفوی تایبــەت بــە خــۆی ڕەخســاندووە، خوێنــدن و تــەواوکردنی ئــەو بەرنامەیــە ساڵەهای ساڵی دەخەیاند و پێی وتراوە (دوانزە عیلمەی مەلایان)[*].

ئەوەی ویستبێتی ببێ بـە مـەلا و هەڵسووڕاندنی کاروبـاری ئـاینی بخاتـە سەر ئەستۆی خۆی دەبوو شـارە و شـار بـۆ تـەواوکردنی ئـەو دوانـزە عیلمـە بەشوێن مەلای چـاکدا بگـەڕێ و عـەودال ببـێ، بـۆ ئـەوەی بتـوانێ ئیجـازەی مەلایەتی تیا وەربگرێ.

---

[*] النحو، الصرف، البلاغة، الفقه، اصول الفقه، المنطق، الأدب، علم الكلام والعقائد، التفسير والحديث والميراث.

دیـارترین و بگـره قورسـترین زانسـتی نـاو ئـەو دوانـزە عیلمـە، زانسـتی (لۆجیـك ـ المنطـق) بـوو، لـۆجیکی ئەرەستۆتالیسـی، ئـەو کتێبـەی کـە ئـەو زانستەی تیا دەخوێنرا کتێبی (ئیساغۆجی) و ئەو کتێبانە بوون کە شـرۆڤەی ئەویان دەکرد وەکو (فەنناری) و (مغني الطـلاب) و هـی تـریش کـە لەمـەودوا باسیان دەکەین.

لەو رۆژەوە مزگەوت وەکو پەرستگایەك لە جیهانی ئیسلامدا بنیات نـراوە حوجرە و (کتاتیب)یش لە تەکیدا بۆ خوێندن دامەزراون و زانستی لۆجیك لـە دوو تۆی کتێبی (ئیساغۆجی)دا وەکو بەرنامەیەکی خوێنـدنی بـالآی مزگـەوت کراوە بە ماددەیەکی سەرەکی ئەو خوێندنە، ئێمە لەم باسـەماندا ئـەوەی لـە تواناماندا هـەبێ، بـەپێی ئـەو سەرچـاوانەی بـە دەسـتمان کـەوتوون لەسـەر کتێبـی (ئیسـاغۆجی) دەکۆڵینـەوە، لەگـەڵ خوێنـەری بەڕێزیشـدا پێکـەوە دەستی یـەکتری دەگـرین و دەگەڕێینـەوە بـۆ ئـەو سـەردەمەی کـە پـاڵی بـە ئەرەستۆوە نا کە ئەو زانستە دابنێ، کە چۆن لەدوای ئەو بە هـەموو جیهانـدا بلاوبـۆوە، ئــەمڕۆش هــەموو جیهــانی بیرکــاری و ئەنــدازیاری و زانســتە پراگماتیکیانەی ئەم سەردەمە سوودیان لێ وەرگرتووە و لە بواری بیرکـاری و ئەندازیاریشدا بووە بە هۆی ئەفراندنی لۆجیکی هێماسازی.

لە گۆشەنیگای خوێندن و کارکردنی ئـەو لۆجیکـەوە لەسـەر بـیر و هـزری خوێندکاران و مەلا و زانایانی ئیسلام بە گشتی و مەلا و زانایـانی کـوردەواری بەتایبەتی کارتێکردنی سەرنج راکێش و مـۆرکێکی بەرچـاوی هـەبووە و گـەلێ زانـا و دانـای نـاوداری پێگەیانـدووە و رۆڵێکـی فـرەی لـە هۆشـیاربوونەوەی گەلانی ئیسلامدا بینیوە.

ئەوەی لـەم لێکۆڵینـەوەی ئێمـەدا مەبەسـتە هەوڵـدانێکی دڵسـۆزانەیە بـۆ تیشك خستنە سەر چۆنیەتی پەیدابوونی لۆجیك بەسەر دەستی ئەرەستۆدا و هــاتنی بــۆ نــاو حوجرەکــانی کوردســتان و خســتنە رووی بابەتــە سەرەکییەکانیەتی.

## ئەرەستۆ و زانستی لۆجیك

زانستی لۆجیك هەر وا لـە خـۆڕا بەسـەر دەسـتی ئەرەسـتۆدا نەهاتووەتـە ئاراوە، بەڵکو کۆمەڵە فەلسەفەیەکی هەمەجۆر لە ئـەنجامی ئـەو پێشـکەوتنە هـزری و سیاسـی و ئـابووری و کۆمەڵایەتییـەدا کـە وڵاتـی گریکـی گرتـەوە زەمینەی رەخسان کەوا لە ئەرەسـتۆ بکـات، ئـەو زانسـتە بـۆ ئاراسـتەکردنی فیکری خەڵك دابنێ و زەینیان لە پرت و بڵاوی هۆشکاری بپارێزێ.

بۆیە ئێمە بە پێویستمان زانی ئەو زەمینە لەبارە کە جۆرەهـا فەلسـەفە و بیروڕای تیا هاتە ئاراوە بخەینە بەرچاو.

بــەر لــە شارســتانیەتی گریکــەکان لــە چــەندین شــوێن و کــاتی تــردا شارسـتانیەتی تـر سـەریان هەڵـداوە و هـەوڵی خـۆی بـۆ هۆشـیارکردنەوە و پەیبردن بـە نهێنییـەکانی سروشـت و گـەردوون خسـتووەتە کـار و بۆچـوونی ئاستی فیکری مرۆڤ لەو بارەوە شتێکی بۆ خۆی سازداوە و لـە سـایەیدا دڵـی خۆی ساتۆر کردووە و هۆشی خۆی پێی دامرکاندووەتـەوە و شـتێکی بەشـت کردووە، بەڵام هەموو هەوڵەکان لـە دواییـدا گـیرۆدەی نـاو تـەپوتۆزی ئـاین و میتۆلۆژیا بوون و لەناو ئەواندا تواونەتەوە.

هەروەها گەلانی تر بەر لە گـەلی گریـك هـەوڵی شـرۆڤەکردنی سروشـت بـە گشتی و دیاردە سروشتییەکان بەتایبەتی داوە و لـەو بوارانـەدا هـەنگاوی بـە پێـز نـراوە بـەڵام سـەرجەمی ئـەو هەوڵـە فیکرییانـە نـەیانتوانیوە دەرگـا داخراوەکـانی ئـاین بکەنــەوە و لێــی دەربــازبن، ئیــدی ئــەوەی هــاتووە و رەخساوە کراوە بە کاڵایەك بە باڵای خوا هەمەجۆرەکاندا براوە.

ئـەوەی بـۆ هـەموو کـەس ئاشـکرا و روونـە ئەوەیـە (ئـەیونیا ـ Ionia) گریکەکان بۆ یەکەم جار توانییان، بەپێی بۆچوونی تایبەت بە خۆیان دیـاردە و رووداوە دژوارەکـانی گــەردوون دوور لــە ئــاین بکــەن و پێشکەشــی بــە مرۆڤایەتی بکەن.

لـە (سروشتناسـی ـ کۆسمۆلۆجیـا)دا تۆژینـەوەی وردیـان لەسـەر ئـەو هۆیانــەش کــردووە کــە کــار دەکەنــە ســەر سروشــت و بــەرەو گــۆڕان و رووداوەکانی دەبەن.

هەروەها لە هزرەکاری و فەلسەفەیشدا بیر و هۆشی خۆیان بـۆ تێگەیشـتن و پـەیبردن بـە نهێنییـەکانی (بـوون)ی گـەردوون خسـتووەتە کـار و، ئـەوەی باوەڕیـان لەسـەری سـەقامگیر بـووە وەکـو بیروبـاوەڕێکی فەلسـەفی لـە بەرنامەیەکدا دایان رشتووە و نەیان هێشتووە تێکەڵاو بـە ئـاین و میتۆلۆجیـا ببێت و بە خەڵکیشیان راگەیاندووە کە ئەمە بووە بە هۆی مانەوەی.

## چۆن فەلسەفە لە یۆناندا پەیدا بوو؟

بەر لـە (ئەرەسـتۆ ـ ٣٨٤ ـ ٣٢٢ پ.ز) و لـە سـەردەمی ئەویشـدا چـەندین فەیلەسووف وڵاتی گریکیان کردبووە چـراخانی هـزر و روونـاکبیری و فیکـری خەڵکیان بەرەو ئازادبوون ئاراستە دەکرد.

ئەوانە ئەو حەوت فەیلەسووفە بوون کە بـەر لـە هـاتنی ئەرەسـتۆ ڕێگـەی بیرکردنەوەیان بۆ عەقڵی مرۆڤ خۆش کرد.

## ١ـ (تالیس ـ Thales ـ ٦٢٤ـ ٥٤٦ پ.ز)

ئەم زانایە بە باوکی فەلسەفەی گەردووونناسـی دەناسـرێ. "یەکـەم کـەس بووە کە بەدوای هۆیەکانی "بـوون"دا بگـەڕێ"[1] ئـەو فەیلەسـووفە خـەڵکی وڵاتەکەی خـۆی (ماڵتیـا) بـەوە سەرسـام کردبـوو، کـە پێـی دەوتـن (خـۆر و ئەستێرەکان شایەنی بەندەگی نین، هەریەك لەوانە کۆگایەکی ئاگرینن)[2].

ئەو ئاوی بە توخمێکی میتافیزیکی بوونی ژیان دادەناو پێـی وابـووە، ئـاو سەرچاوەی سەرەکی ژیانە.

"ئاو بناغەی بوونی هەموو بوونەوەرێکـە، لـەوەدا هـیچ جیـاوازی لـەنێوان مرۆڤ و ڕووەك و بەردێکدا نییە، جیاوازییان تەنیا لە بـوونی زۆر و کـەمی ئـەو ئاوەدایە کە لێی پێك هاتووە، ئەی ئەوە نییە ئاو لە چەندین قەبارە و دۆخـدا دەبینرێ، لـە ئاسمانـدا هەڵمـە، لـە زەویـدا بارانـە، لـە زسـتاندا بەسـتەڵەکە، هەموو شتەکانی بوون لەو سێ دۆخەدان: (هەڵم، شل، ڕەق)[3].

---

[1] (کێشەی بوون لە مێژووی فەلسەفەدا ـ بەرگی یەکەم) د. محەمەد کەمال، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ٢٠٠٢، سلێمانی، ل٢٤.

[2] (قصة الحضارة) تأليف ول ديورانت، الجزء الثاني من المجلد الثاني (حياة يونان) ترجمة محمد بدران، جامعة الدول العربية، ١٩٦٨، ص ١٧٨.

[3] (قصة الفلسفة اليونانية) تصنيف: احمد امين ـ زكي نجيب محمود، الطبعة السابعة، القاهرة، مطبعة التأليف والترجمة والنشر، ١٩٧٠، ص١٤.

## ٢ـ (ئەناكسمانس ـ Anaximene ـ ٤٥٠ پ. ن)

پێی وابووە، ئەسڵی شتەکان لە سەرەتای بوونیاندا پارچە شتێکی نەرم و بێگەرد بوون، لەدواییدا یەکیان گرتووە و بوون بە (هەوا) هەواکەش بووە بە هەور، هەورەکەش بووە بە گڵ، کەواتە مادده لە سەرەتادا ئەو سێ قۆناغەی (گاز ـ شلە ـ بەستراو) بڕیوە و ئەوجا چووەتە ناو دۆخی رەقییەوە و لەو گۆڕاندنەدا گەرما و سەرما یارمەتییان داوە.

هەروەها لەو باوەڕەدا بووە، هۆی روودانی بوومەلەرزە خزینی ئەو خۆڵەیە کە لە ئەسڵدا شلۆك بووە، ژیان و گیان یەك شتن، ئەو هێزەی کە ژیان دێنێتە ئاراوە فراوانە و لە هەموو کات و شوێنێکدا هەیە.

## ٣ـ (ئەناكساگۆراس ـ ٥٠٠ ـ ٤٢٨ پ. ن)

ئەم زانایەش پەی بەڕاستی روودانی دیاردەی مانگ و خۆر گیران بردووە، پێی وابووە مانگە دەبێتە هۆی گیرانی خۆر و زەوییە دەبێتە هۆی گیرانی مانگ.

هەروەها پێی وابووە زەوی خڕە و بەسەر پێنج دەڤەری گەورەدا دابەش بووە.

هەروەها ئەوەی زانیوە کە رووە روناکەکەی مانگ هەمیشە رووی لە زەوییە[4].

## ٤ـ (ئەنكسماندەر ـ ٦١٠ـ٥٤٠ پ. ن)

[4] (قصة الحضارة) ل١٧٨.

قوتابی تالیس بووە، یەکەم کەس بووە نەخشەی جوگرافی بۆ زەوی و ئەستێرەناسی بۆ گەردوون ناسی داناوە.

پێی وابووە هەموو گەردوون لە سەرەتادا یەك شت بووە و لە یەك توخم پێك هاتووە لەدواییدا توخمەکانی تر پەیدا بوون و لە یەك جیا بوونەتەوە.

هەروەها لای وابووە: هەموو ئەستێرەکان لە سەرەتای بونیادا هەریەك تۆپەڵە شلۆکێك بوونە، لەژێر تینی کاریگەری خۆردا لەسەریان وشك هەڵگەڕاون.

هەروەها وتوویەتی: (ژیان لە سەرەتادا لە دەریاوە دەستی پێکردووە)[5].

## ٥- (هێرا کلایدیس - Heraclitus - ٥٤٠ - ٤٧٥)

دیووت:

هەموو شتەکان لە جووڵە و بزاوتن ناکەون. گەردوون خۆی هەمیشە لە دەوران و سووڕاندایە، دەوەران سووڕان خەسڵەتێکی دینامیکی هەمیشەییە بە (بوون) بەخشراوە. واتە بڕوای بە وەستان نەبووە، لە وتە بەناوبانگەکەیدا کە دەڵێ: (مرۆڤ ناتوانێت لە ڕووبارێکدا دووجار خۆی بشوا) تیۆرەکەی بەرجەستە دەبێ.

ئەو سەرچاوەی (بوون)ی گەڕاندووەتەوە سەر توخمی ئاگر: (ئاگر ئەزەلییە و کەس دروستی نەکردووە، لەسەر پێوەر و یاسایەکی تایبەتی خۆی دەکوژێتەوە.

---

[5] قصة الفلسفة اليونانية، ل١٦.

جیهان هەر بووە و هەر دەبێت و کۆتایی نایەت[6].

## ٦ـ (ئەمبا دۆکلیس ـ ٤٤٥ پ. ز)

ئەم زانایەش تیۆری ئەفراندن و رەخساندنی (النشؤ)ی ئەندامانی لەشی زیندەوەرزانی هێناوەتە ئاراوە و دەڵێ: لەناو تاقیگەی سروشتدا بڕیار لەسەر چۆنیەتی فۆرم و شێوەی هەمەجۆری ئەندامانی لەشی زیندەوەران دراوە، لەناو ژینگەدا خەملاوە، دانراوە، کام فۆرم لەبار و سەرکەوتوو بووە و توانیویەتی بە ئاسانی کارسازی خۆی ئەنجام بدا و رووبەڕووی ژینگە بێتەوە و بەسەریا زاڵ بێ ئەوە هەڵبژێردراوە. ئەوانەش کە کاریان بە ئاسانی پێ ئەنجام نەدراوە وەدەر نراون، ئیدی پاش بەسەراچوونی رۆژگارێکی دوور و درێژ ئەندامە لەبارەکانی لەش جێی خۆیان گرتووە و لەگەڵ ژینگەدا تەبا بوونە.

## ٧ـ (دیموکریتیس ـ ٤٦٠ ـ ٣٦٠)

دەڵێ:

(هەموو شتێ ئەوەی هەیە و ئەوەی دەبێ بەرەو پێشەوە پاڵنراوە و دەڕوا، شتەکانی ناو گەردوون بێ ئەژمارن، هەموو سات و کاتێ خۆ بەیەکدا دەدەن و لەناو دەچن، جیهانی نوێ لەناو باژەڵی ئەو پێکدادانەدا پەیدا دەبن، گەردیلەی خود بزوێنەری قەبارە هەمەجۆر و وەك یەك پەیدا دەبن، هیچ

---

[6] کێشەی بوون لە مێژوودا. محەمەد کەمال. ل٢٨.

نەخشە و تەگبیرێکی پێشەکی لە خولقاندنی جیهانەدا نییە، گەردوون بەخۆی بەشێوەیەکی ئالیی میکانیزیکی دەڕوا و دەجوولێ)[7].

وەك بینیمان بیروڕا و تیۆرەکانی ئەو کۆمەڵە فەیلەسووفە کە بەر لە ئەرەستۆ هاتبوون چۆن رابەری فیکری خەڵکیان کردبوو، چەندین تیۆری جیا جیایان لەمەڕ گەردوون و سروشت و (بوون) هێنابووە ئاراوە.

دیموکراتیەت و ئازادی تاکە کەس و پێشکەوتنی باری ئابووری و سیاسی و بازرگانی وڵاتی گریکی بردبووە پایەیەکی بەرزەوە.

لەکاتی ئەرەستۆشدا سۆفیستەکان هاتنە ناو مەیدانی فیکر و زانستەوە، ئەوەندەی تر عەقڵی خەڵکیان بەرەو ناخی هزرکاری و تێڕوانین قووڵ کردەوە.

بۆیە بە پێویستمان زانی کورتە باسێکیش لەمەڕ ئەو سۆفیستانە بخەینە ڕوو، وا بە پوختی باری بۆچوون و تیۆرەکانیان لە خوارەوە باس دەکەین:

## سۆفیستەکان

سۆفیستەکان: کۆمەڵە مامۆستایەکی هزرڤانی مۆدێرن بوون. خەڵکی ئەثینا نەبوون لە دوورگەکانی گریکەوە هاتبوونە ئەوێ.

نازناوی (سۆفەستا) واتە: (مامۆستای حیکمەت)یان لێ نرابوو، ئەگەر لە کوردیدا ناوەکەیان ورد بکەینەوە (مامۆستای باڵا) دەگەیەنێ. کە دەکاتە مامۆستای زانکۆی ئەمڕۆ. لە هەموو ناسیاو و ناودارتریان ئەمانە بوون:

---

(7) (قصة الفلسفة) ول ديورانت، مكتبة المعارف، بيروت، ١٩٧٢، ص ٨٤-٨٥.

## ١- پرۆتۆگۆراس - Protagors

ئەم فەیلەسووفە، کەسانێکی رەوشت پاك و بە نموود بووە.

ئەفلاتوون کە بۆ یەکەم جار دیدەنی کردووە بە کەسێکی مۆرال بەرز باسی لێوە دەکات.

ئەو بیر و رایانە کە پرۆتۆگۆراس بلاوی کردنەوە، گشت بیروباوەڕ و بەها و نەریتێکی ئەو سەردەمەی هێنایە لەرزین و هاژین.

کارێکی گەورەی کردە سەر رەوتی فیکری گریکەکان. بۆ نموونە:

أ - بناغەی رێزمان و زانستی سیمنتاکسی دارشت.

ب - یەکەم زانا بوو کە رێزمانی داهێنا و ناوی بەسەر نێر و مێ و بێ لایەندا دابەش کرد.

پ - هەر ئەو بوو کاتی فەرمانەکانی دیاری کرد و رستەی بەسەر رستەی هەواڵدەر و مەرجیدا دابەش کرد.

ج - پێنج هەستەکەی مرۆڤ تاکە رێگەی پەیبردنن بەڕاستی.

نووکلی لەوە کردووە کە هیچ حەقیقەتێك لە سەرووی هۆشەوە هەبێ و هەستەکان پەی پێ نەبەن.

چ - راستی رەها هەبوونی بۆ نییە.

د - راستییەکان هەموویان بە خێر و ناخەیر و جوانی و ناشیرینی و شەڕ و بەدی چەند شتێکی رێژەیی و کەسانین.

ز - (مرۆڤ تەنیا خۆی پێوەری هەموو شتێکە، هەر خۆی بڕیاری لەسەر ئەو شتانە داوە کە هەن، هەیە، یان ئەو شتانەی کە نین، نین)[8].

---

[8] (قصة الحضارة)، ول ديورانت، الجزء الثاني من المجلد الاول، ص ٢١١–١١٤.

## ٢- گورگیاس - Gorgias

وتوویەتی:

(گەردوون و ئەوەی لە گەردووندایە، بە زیندەوەر و ڕووەك و بێ گیان و گیانداریەوە، لە خۆڕا بوون و هیچ عیللەتێکی پەی پێبەر و ژێر لە پشت دروستبوونیانەوە نییە.

هەروەها وتوویەتی:

(ئەگەر ڕاستەقینەیەکیش هەبێت ئێمە بیزانین ئەوا ناتوانین بە خەڵکی رابیگەیەنین، چونکە کەرستەی دەربڕین و راگەیاندنمان زۆر لاوازە و ناتوانین ئەوەی دەیزانین کتومت لە چوارچێوەی زماندا دایڕێژین)[9].

## ٣- هیباس ئەلیسی - Hibas Elis

ئەم زاتە زانایەکی ئەنسۆکلۆپیدی سەردەمی خۆی بووە، لە زۆر بواری زانیاریدا دەستی باڵای هەبووە، خەڵکی فێری ئەستێرەناسی و بیرکاری کردووە. چەندین لێکۆڵینەوەی لەسەر ئەندازیاری داهێناوە، شاعیر و مۆسیقازان و وتاربێژێکی زمان پاراو و بەدەم و دوو بووە، خەڵکی فێری وتاردان لە ئەدەب و ڕەوشت و سیاسەت و مێژوو و قانوندا کردووە، لە هونەری شێوەکاری و نمایشکردندا دەستی هەبووە، لەناو زانایان و فەیلەسووفەکاندا وەکو ئەو ڕەوشت باش و دەروون ساف نەبووە، بڕوای بە شتی پڕوپووچ نەبووە، کەسانێکی ماتریالیستی بووە.

---

[9] کێشەی بوون لە مێژوودا، محەمەد کەمال، ل٤٧. هەروەها بڕوانە: فجر الفلسفة اليونانية، احمد فؤاد الاهواني، ل٢٥١–٢٥٢.

### ٤ـ ترازیماكۆس

خاوەنی واچەی: (راستی توانایە).

سەركەوتنی كەسانی بەدخوو و خوێڕی گومانی دەربارەی بوونی خواكـان لا دروست كردووە.

### ٥ـ لیسیاس

دەیوت:

كۆمەڵێك هەیە باوەڕیان بە خواكان نییە، یانەیـەكیان هەیـە، ناویـان نـاوە (یانەی ئەهریمەنەكان).

ئەو كۆمەڵە لە رۆژە پیرۆزەكانی رۆژووگرتن بۆ خواكان ئـەوان لـەو یانـەدا كۆ دەبنەوە، خواردن و خواردنەوە دەخۆنەوە.

* * *

سۆفیسـتەكان بـە هەموویانـەوە كـارێكی گـەورەیان كـردە سـەر فیكـری یۆنانییەكان و بەرەو بـواری وردبوونـەوەتر و لێتۆژینـەوەی بـوون بـە گشـتی ئاراستەیان كرد.

لێرەدا دەتوانین هەندێ لەو كارانەی كە خسـتیانە سـەر هـزر و زانیـاری و بوارەكانی تر بە كورتی بیانخەینە ڕوو:

١ـ ئەوان دەرگای پەیدابوونی رێزمان و لۆجیكیان كردەوە.

٢ـــ ئـەوان هونـەری كێشـمە (الجـدل) و دایلۆگیـان خسـتە نـاو قـاڵبێكی ناسكەوە و خەڵكیان فێركرد چۆن هەڵە و ڕاست لە گفتوگۆدا جیا بكەنەوە.

٣ـ پەخشانیان کرد بە بەشێك لە ئەدەب و کردیان بە هۆی گوزارشتدانەوە لە فەلسەفە.

٤ـ لێکۆڵینـەوەیان بـۆ سـۆراخکردن و بـۆ بەدواداچـوونی راسـتییەکان لـە هەموو بوارێکدا داهێنا.

٥ـ داب و نەریتـەکانیان بـە چـاوێکی پـیرۆز و گـەورە تەماشـا نـەدەکرد، لۆجیك و هەستەکانیان دەکردنە بەڵگە لە دژیان[10].

## ئەرستۆ و زانستی لۆجیك

ئـــەو بـــیروڕا فەلســـەفی و زانیارانـــە کـــە لـــە ســـەردەمی (تـــالیس) و سۆفیستەکاندا هاتنـە ئـاراوە، ـ وەکـو لـە پێشـەوە خرانـە روو ـ ئاژاوەیـەکی فیکری و گۆڕانێکی کەم نەبوو تووشی بەها و بیروڕا و ئەو شتە پیرۆزانە بوون کە بیروباوەڕی خەڵکی ئەتینیایان لەسەر دامەزرابوو. ئەوەی لە بواری ئەدەب و هونەر و ئاین و سیاسـەت و فەلسـەفە و زانسـت و قانونـدا هـەبوو هـەمووی کەوتنە بەر نەشتەری تیژی نەشتەرگەریی بیری نوێ و لێکۆڵینەوە.

هەرچەند ئەو تیۆر و بیروڕا نوێیانە پڕاو بوون و نەبووبوونـە بەرنامەیـەکی یەکگرتوو، بەڵام زەمینەیان بۆ ئەفراندن و خۆ ئامادەکردنێکی تری زانستی و فیکری رەخساندبوو، لەو کاتەدا ئەرستۆ یەکێك بوو لەو فێرخوازە بیر تیژانـە کە هۆش و بیری خۆیان بـۆ ئـەو بـیروڕا و زانیارییـە نوێیانـە خسـتبووە کـار، ئەوەی لەناو چەند و چوونی و دیلۆگەکاندا دەوتران و دەردەبـڕان، گـوێی بـۆ

[10] قصة الحضارة، ول ديورانت، الجزء الثاني من المجلد الثاني (حياة يونان)، ل٢١٧–٢١٨.

دەگرتن و لەناو هۆشی خۆیدا خڕی دەکردنەوە و تاوتۆیانی پێدەکردن و لای خۆی خەزنی دەکردن.

لەو هەموو بیرۆکە تازانەوە، لەناو خەرمانەی ئەو هەموو تیۆرە هەمەجۆرانەوە توانی فەلسەفەیەکی تایبەت بە خۆی لێیانەوە هەڵبهێنجێ.

لە هەمووی دیارتر ئەو شێوە ئاخاوتنانە بوون کە لە دایلۆگەکاندا بەکاردەهاتن و پەیوەندییان بە لۆجیکەوە هەبوو، ئەوانەی لەبەر چاوگرتن، بەرنامە رێژییەکی مەحکەمی بۆ سازدان لە کۆتاییدا توانی وەکو زانستێکی نوێ بیانهێنێتە ئاراوە، بۆ ئەوەی فیکری ئەوانە کە ئاخاوتن سەبارەت بە بابەتە هەمەجۆرەکان دەکەن لە هەڵە بپارێزێ و رەوتی قسەکردن راگرێ.

ئالێرەوە بوو ئەرەستۆ (لۆجیك)ی وەکو زانستێك ئەفراند.

لەو بارەوە دوکتۆر عەلی وەردی نووسیویەتی و دەڵێ:

(ئەو بابەتەگەلەی کە سۆفیستەکان هێنایانە ئاراوە، ئەو دایلۆگ و کێشمە کێشانەی کە لە یۆناندا بەرپایان کردن، وای کرد جۆرە پێوەرێك بێتە ئاراوە کە بتوانێ زەینی مرۆڤ لە هەڵزەنین و کەوتنە ناو هەڵەوە بپارێزێ، ئەرەستۆ هات، ئەو پێوەرانەی کە هەبوون کۆی کردنەوە و کتێبێکی رێکوپێکی سەر سوورهێنەری لێ تۆمار کردن، ئێمە لێرەدا ناتوانین نووکلی لە بلیمەتی ئەرەستۆ بکەین کە توانی ئەو بیرۆکە سەر بە لۆجیکانە کۆ بکاتەوە و زانستێکیان لێ دروست بکات)[11] کە زانستی لۆجیکە.

* * *

---

[11] اسطورة الادب الرفيع، الدكتور علي الوردي، منشورات: سعيد جبير، الطبعة الاولى، ٢٠٠٠، ل ١٧٣-١٧٤.

(ویل دیورانت ـ ١٨٨٥–١٩٦٣) لەبارەی لۆجیکەکەی ئەرەستۆ دەدوێ و دەڵێ:

(ئەو جیابوونەوە مەزنەی کە ئەرەستۆ لە پێشینان جیا بکاتەوە دانانی زانستێکی نوێ بوو کە بە (لۆجیك) ناسرا. کەواتە بەر لە ئەرەستۆ کەس بەرنامەیەکی زانستییانەی بۆ لۆجیك دانەڕشتبوو، نەبووبوو بە زانستێکی خاوەن بابەت و لق و پۆپداری یەکگرتوو، ئەو بە جۆرێك ئەو زانستەی رێکخست کە بیر و هۆشی یۆنانییەکان لە نائارامی و گەرەلاوژە دوور بخاتەوە.

لەدوای هاتنی ئەو زانستە رێگە بۆ هۆش و مێشك واز بوو کە چۆن بەرەو گەیشتن بە راستییەکان هەنگاو بنێن، هەر چەند زانستەکە بە تەواوی نەیتوانی جەڵەوگیری مرۆڤ بکات، لەگەڵ ئەوەشدا تاڕادەیەك ئاژاوە هزرییەکانی دامرکاندنەوە.

دوای (ئەرەستۆ) گریکەکان لەبارەی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە تووشی داوەشان و شێواوی بوون و لاوازی هۆشیاری کەوتە ناو فیکریانەوە، بەڵام پاش هەزار ساڵی دواکەوتن و کەوتنە ناو تاریکی نەزانی بە هۆش هاتنەوە و توانییان ئاوڕێك لە رابردووی خۆیان بدەنەوە، ئیدی ڕوویان بەلای بەهرەکانی ئەرەستۆدا وەرچەرخاندەوە، لە ساڵی (٤٧٠–٥٢٥)ی زاینیدا (بیوتیوس) ناوێك لۆجیکەکەی ئەرەستۆی وەدەست خست و وەری گێڕایە سەر زمانی رۆمانی ـ ن ـ).

لەو کاتەوە لۆجیکی ئەرەستۆتالیسی سەری هەڵدایەوە و بوو بە نموونەی راستراگیری و پێوەری بیر و هزری راست و ڕەوان) زانای ناوبراو درێژە بە وتەکانی لەو بارەوە دەداو دەڵێ:

لۆجیك هونەرێكە یارمەتی مێشكی مرۆڤ دەدا كە چۆن بیری بخاتە كار، یاسایە شێوازێكی زانستییانەی هەیە. هەم هونەرە، هەم یاسایەكی فیكرییە، هەم زانستێكی مۆسیقا ئامێزە. لۆجیك هۆیەكانی بیركردنەوە راست و دروست رادەگرێ، بۆ هەڵسەنگاندنی راست و چەوتی بابەتە كۆسمۆلۆجییەكان و بیر و هزرە ئەبستاكە رەهاكان سەنگ و ترازوو و پێوەر دادەنێ.

رێگەی دیالێكتیك كە بە پێناسە دەستی پێ دەكرد و بە دایلۆگ تەواو دەبوو، سوكرات و ئەفلاتوون بەكاریان دەهێنا، ئەوە بوو سوكرات دەیوت: ئەوەی دەیەوێ لەگەڵ مندا لەسەر بابەتێك بدوێ با لەپێشەوە پێناسەی بۆم بكات.

ئەو كە پێناسەكەی شی دەكردەوە و، چی وردیاتی بابەتەكە و ئەو شتانەی كە پێوەی دەنووسان و لەو نەبوون لێكی جیا دەكردنەوە و لە رێگەی خوێندنەوەی وردەكارییەكانیەوە دەگەیشتە (بەر ئەنجام - الاستقراء).

بەو جۆرە پێناسەكە هەموو وردیاتەكەی خۆی لە خۆ دەگرتن و ئەوەی لەو بەدەر بوون وەدەری دەنان.

بەو جۆرە شێوازە دەوترا (دیالێكتیك) واتە دەرهێنانی شتێكی راست لە چەند شتێكی ترەوە.

لێرەدا رێگەی دیالێكتیكی سوكرات ئەو واچە و پێناسانەی لێ كەوتەوە كە لەناو لۆجیكەكەی ئەرەستۆدا بوون بە دارەڕای راگرتنی پەیكەری زانستەكەی)[12].

---

[12] قصة الفلسفة، ول ديورانت، ل٨٠.

دیارترین بابەت بۆ گەیشتن بە بەڵگەی یەقینی لە لۆجیکەکەی ئەرەستۆدا (مەسەلەی پێواندن ـ القیاس)ە. کە ئەویش لە خۆیدا پێنج لکی لێ دەبێتەوە کە پێیان دەوترێ: (پێنج بەڵگەسازەکان ـ الصناعات الخمس).

هەر چێوەیەکی ئەندازەش لە سێ واچە پێك هاتووە.

**بە یەکەم دەوترێ واچەی گچکە**. وەکو بڵێی ⟵ ئازاد مرۆڤە.

**بە دووەم دەوترێ واچەی گەورە**. وەکو بڵێی ⟵ هەموو مرۆڤێك ژیرە.

**بە سێیەم دەوترێ ئەنجام**. وەکو بڵێی ⟵ ئازاد ژیرە.

ئەنجام لە هەردوو واچەکەی پێشەوە هەڵدەهێنجرێ.

بەڵام ئەرەستۆ دەیوت: بۆ ئەوەی ئەنجامی ئەندازەکە بە هەڵە بەسەر واچەکەی پێشەوەیدا کە واچەی گەورەیە نەشکێتەوە دەبێ ئەو واچەیە بە رێگەی (بەرئەنجام) وردەکاری لق و هەندەکانی بخوێنرێنەوە و لێیان دڵنیا بین، بۆ ئەوەی ئەنجامەکە بەڕاست دەرچێ و هەڵەی تێ نەکەوێ[13].

## ناوی ئەم زانستە

ئەم زانستە لە سەردەمی ئەرەستۆدا ناوی لۆجیك نەبووە. ئەرەستۆ خۆی وشەی: (ئەنالۆتیکا ـ شیکردنەوە)ی لەجیاتی لۆجیك بەکارهێناوە، واتە شیکردنەوەی چالاکی بیر[14].

---

[13] قصة الحضارة، ل٤٩٧.

واچە: مقولة.

هەندەکان: جزئیات.

[14] (سەرەتایەك لە فەلسەفەی کلاسیکی یۆنان، حەمید عەزیز، چاپخانەی زانکۆی سلێمانی، ل٢٧٦.

(شیشـرۆن ـ ١٠٦–٤٣ پ.ز) وشـەی ئـەنالۆتیکای بـە مانـا (دیالێکتیـك) بـەکارهێناوە، بـەڵام ئـەوەی بـە لۆجیـك بـەکاری هێنـا (ئەسـکەندەری ئەفرۆدیسی) بوو[15].

زانایانی ئیسلامیش بەو زانستەیان وتووە (المنطق).

مەنتیق لە ڕووی زمانەوانییەوە (چاوگێکی میمییە) بە مانا (نطـق ـ گۆ) و ئاخاوتن دێ، چونکە زانینی ئەو زانستە زەیـن دەکاتـەوە کـە زەیـن کرایـەوە هێز بە گۆکردن دەبەخشێ و سافی دەکات.

مـەنتیق لـە ڕووی زاراوەسـازییەوە وا پێناسـەیان کـردووە: (ئـامێرێکی قانوونییە، زەینی مرۆڤ لە بە هەڵەچوونی بیردا دەپارێزێ)[16].

## لۆجیکی فۆرمی و لۆجیکی هێمایی

لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا لۆجیك لە بـواری ماتماتیـك و ئەندازیاریـدا پەرەی سەندو لە ئەنجامدا بوو بە دوو بەشەوە:

١ـ لـۆجیکی ئەرەستۆتالیسـی کـە پێـی دەوتـرێ لـۆجیکی (ڕووکەشـی ـ صوري) چونکە پشت بە ڕێژە زمانییەکان دەبەستێ. بـۆ نموونـە بـا سـەیری ئەم گۆتەیە بکەین:

---

[15] ئەسکەندەری ئەفرۆدیسی، فەیلەسووفێکی یۆنانی بووە لە سەدەی دووەمی زاینیدا ژیاوە، یەکێك بووە لە شرۆڤەکارانی زانستەکانی ئەرەستۆ، کتێبەکانی لەناو موسڵمانان و عەرەبدا بڵاو بوونەتەوە و سوودیان لێ وەرگیراوە، (ئەبی عەلی سینا) پشتی بە بیروڕاکانی بەستووە و بە زانایەکی گەورەی زانیوە. بڕوانە: المنجد في الادب والعلوم (٢٠).

[16] مغني الطلاب في علم المنطق، المؤلف العلامة محمود ابن حافظ حسن المغنيني، ص٩.

– گۆتە: القضية.

– هەمەکی: کلي.

– ئەرێ: ایجاب.

(ئەگەر ژمارەیەك لە ژمارەیەکی تـر بـدەین، ئەنجامەکـەی هـەمان ئـەنجام دەبیٚ کە ژمارەی دووەم لە یەکەم بدەینەوە)

٢×٤= ٨

٤×٢= ٨

٢ـ لۆجیکی هێمایی، لەجیاتی وشە و فریز هێمـای ماتمـاتیکی بـەکاردێنیٚ، بۆ ئەو هاوسەنگەی پێشەوە لەجیاتی زمان هێما بەکاردێنیٚ.

(س، ص). س. ص= ص س

نموونەیەکی تر: با دابنێین (أ) گۆتـەیەکی هەمەکی ئەرێیە. دەیکـەین بـەم رێژەیە: أ = ب جـ

کەواتە لەو رێژەدا (أ) لە یەك کاتدا دوو خەسڵەتی هەیە وەکو بڵێی:

(مرۆڤ + زیندەوەرە + وێژەرە). یان (مرۆڤ = زیندەوەر × وێژەر. کەواتە مرۆڤ = زیندەوەری وێژەرە).

کەچی لـە لـۆجیکی رووکەشـیدا وشـە و فریـز دەبنـە بڕبڕاگـەی داڕشـتنی چێوەی گوتەکان وەکو:

| هەموو کانزایەك | بە گەرمکردن دەکشیٚ. |
| --- | --- |
| هەموو ئاسنێك | کانزایە |

کەواتە: هەموو ئاسنێك بە گەرمکردن دەکشیٚ.

دەتوانین ئەو هاوکێشە لۆجیکییە بەشێوەی لۆجیکی هێمایی دەربڕین:

ژ . ڤ ] یە.

پ . ژ] یە.

کەواتە: پ ڤ ] یە.

## وتەیەکی پێویست

لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا کە لۆجیکی ئەرەستۆتالیسی لە بواری ماتماتیك و ئەندازیاریدا خرایە کار و لێکۆڵینەوەی لەسەر کرا دەرکەوت کە ئەگەر ئەو لۆجیکە لەو قاڵبە رووکەشییەی خۆیدا بمێنێتەوە نەك یارمەتی بیری مرۆڤ بە تەواوی لەسەر دۆزینەوەی راستی و راستگۆیی نادات بەڵکو لەبەر گەلێ بیرۆکەی چەسپێنراوی کۆن کە لە زمانەوە سەرچاوە دەگرن بە هەڵە لە مێشکدا دەچەسپێن، لەبەر ئەوە لۆجیك لەبەر کارهێنانی زمانی یاسایی لای دا و رووی بەلای بەکارهێنانی هێماسازی و لۆجیکی تر بەناوی (لۆجیکی هێماسان) لە بواری ماتماتیك و ئەندازیاریدا هاتە وەرچەرخان.

ئەو جۆرە لۆجیکە نوێیە لەسەر بنچینەکانی لۆجیکی کۆن دامەزراوەو مەبەستە سەرەکییەکانی خۆی دێنێتە دی و دانان و بەرهەمدانی نوێی لە ئاقاری پراکتیکییەت و کردەی مەیدانیدا سەلماندووە[17].

## ئیساغۆجی کێ دایناوە؟

بەگوێرەی ئەو پێشەکییە سێ دێڕەی ئیساغۆجی بێ، کە لە پێشەوە پێوەی نووساوە و لەگەڵیدا چاپ کراوە[18] دەبێ: (ئەسیرەدینی ئەبهەری)[19] دایناوە.

---

[17] دراسات في المنطق ـ مع نصوص مختارة، الدكتور عزمي اسلام، ١٩٨٥، ص٧٤-٧٩.

[18] ئیساغۆجی لەگەڵ (فەنناری)دا کە شرۆڤەکاریەتی و لەگەڵ پەراوێزەکانی (قول احمد)دا کە لەسەر (فەناری)یە، لە ساڵی (١٣١٢)دا بۆ دووەم جار لە چاپخانەی (عەبدوڵڵا ئەفەندی) ناوێك بە یەکەوە بە چاپی بەرد و زەنگۆگراف کراون و بەناو حوجرەکانی وڵاتانی ئیسلامدا بڵاو بوونەتەوە.

بـه بـڕوای هەنـدێ لـەو مەلایانـە کـە ئـەو کتێبـەیان خوێنـدووە و بـە فەقێیانیشـیان وتووەتـەوە، ئیسـاغۆجی بـە دانـراوی خـاوەنی خـاوەن ئـەو پێشەکییەی دەزانن.

هەندێکی تریان بە کارتێکردنی ئەو وردە (بەند و تەزبیب و پەراوێزانە) کە لە قەراغ مەتنەکەی (فەنناری) و (مغنی الطلاب)دا هەن و نووسـیویانە: گوایـا (فۆرفۆریـۆس) ناوێـك داینـاوە. بـەڵام باسـی ئـەوە ناکـەن، جـا ئەگـەر (فۆرفۆریۆس)دایناب ئەی ئەسیرەدینی ئەبهەری چی کردووە؟

ئێمە لێرەدا ئەوەی لەو بارەوە بە دەستمان کەوتبێ دەیخەینـە بەرچـاوی خوێنەر بۆ ئەوەی لەو بارەوە بە یەکەوە بگەینە ئەنجامێك یان نەگەین.

ڕای خۆمان دەدەین دەستەوسـان ڕاناوەسـتین و چـاوەڕوانی دەرکـەوتنی ڕاستیش دەکەین.

١ـ ئەسـیرەدینی ئەبهـەری لـە پێشـەکییەکەیدا وا دەڵـێ: (ئـەوەی بـۆ فێربوونی ئەم زانستە پێویست بووبێ تیایدا دامان ناوە.)

٢ـ (کشف الظنون)[20] لە باسکردنی (ئەبهەری)دا لیستێك لەو کتێبانە کـە ئەو دایناون دەخاتە بەرچاو لە ناویاندا (ئیساغۆجی) ناوی نییە.

لێرەدا بیری مرۆڤ بۆ ئەوە دەچێ کە (ئیساغۆجی) لە دوور و نزیکـەوە بـە دانـــان و وەرگێڕانـــەوە پەیوەنـــدی بـــە (ئەبهـــەری)یـــەوە نـــەبێ، دەنـــا

---

[19] (ئەسیرەدینی ئەبهەری) ناوی (محەمەدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی محەمەدی کوڕی ئەبوبەکری ئەبهەری مالیکی)یە و لە ساڵی (٢٧٨)ی کۆچیدا لە دایك بووە و لە ساڵی (٣٧٥)دا مردووە. بڕوانە: کشف الفنون، جیلدی شەشەم.

[20] من کتاب کشف الظنون عن اسامي الکتب والفنون، للعلامة المولی مصطفی عبدالله القسطنطیني الرومي الحنفي الشهیر بالملا کاتب الچلبی ـ المعروف بحاجی خلیفة ـ المجلد السادس، ص ٥٠.

(ئیساغۆجی)یەك بەو ناوداریییەوە کە لە سەرانسەری حوجرە و پەرستگاکانی ئیسلام و مەسیحییاندا بخوێنرێ و ئەو هەموو دایلۆگ و بگرە و بەردەیەی لەناو مەلایاندا بنێتەوە، یان کتێبێك ئەو هەموو شرۆڤە و پەراوێزە و داوێنەی لەسەر نووسرابێ و سەنگی مەحەکی زانین بێ و بە لۆجیکی (مامۆستای یەکەم) بناسرێ[21] چۆن ئەنسۆکۆپیدیا نووسێکی وەکو (حاجی خەلیفە) خاوەنی (کشف الظنون) ناوی نابات؟!

٣ـ کتێبی (الموسوعة العربية الميسرة) لەو بارەوە دەڵێ: (ئیساغۆجی) مانای (دەروازە)یە، ناوی ئەو کتێبەیە کە (فۆرفۆریۆس)ی (الصوری) لەسەر (واچەکان ـ المقولات)ی ئەرەستۆ داینـاوە (هەمەکییەکان ـ کلیات)ی ئەرەستۆی تیا باس کردووە، کە لای ئەرەستۆ هەمەکییەکان چوارن کەچی ئەو واتە (فۆرفۆریۆس) هەمەکییەکی تری خستووەتە پاڵیان و بوون بە پێنج کە (جۆر ـ النوع)ە.

ئەرەستۆ (جۆری) بە یەکێك لە هەمەکییەکان ئەژمار نەکردووە، چونکە ئەحکامی زانستی بەسەر جۆردا دەدرێ نەك تاك وەکو بڵێی ـ سوکرات مرۆڤە ـ ئەو واتە فۆرفۆریۆس کتێبی (ئیساغۆجی) لەسەر شێوەی (تێهەڵکێش و ناوەخن و شرۆڤە) کردووە بە عەرەبی[22].

٤ـ (المنجد في الأدب والعلوم)ی پاڵ (المنجد في اللغة والأدب والعلوم)ەکەی لوێس مەعلووف، لە دوو شوێندا ئاماژەی بە (ئیساغۆجی) داوە.

---

[21] (ئەرەستۆتالیس ـ ٣٨٤-٣٤٧ پ.ز) لەناو زانایانی ئیسلام و مەسیحییاندا بە (مامۆستای یەکەم) ناسراوە. چونکە لۆجیکی داهێناوە.

[22] بڕوانە: الموسوعة العربية الميسرة، دار الشعب، بالقاهرة، الطبعة الثانية، ١٩٨٢، ص٢٨٥.

أ ـ دەڵێ: (ئیساغۆجی ـ Isagoge) بەشێکە لە فەلسەفە بە ناوی (پێنج واچەکان ـ المقولات الخمس)ەوە ناسراوە. (فۆرفۆریۆس)ی (الصوری) کە یەکێك بووە لە قوتابییەکانی ئەفلۆتین دایناوە.

ئەو کتێبە کورتە باسێکە، دەدرێتە پاڵ (ئەسیرەدینی ئەبهەری) (کشف الظنون) وشەی (ئیساغۆجی) یۆنانییە و مانای (دەروازە)یە[23].

ب ـ (المنجد)ی ناوبراو لە شوێنێکی تریشدا کە باسی (فۆرفۆریۆس ـ porphyry ـ ٢٣٣–٣٠٤) دەکات و دەڵێ:

(فۆرفۆریۆس، فەیلەسووف بووە، لە شاری صور لە دایك بووە، یەکێك بووە لەوانەی کە لەسەر رێبازی ئەفلاتوونیەتی نوێ رۆیشتووە، شاگردی ئەفلۆتین خۆی بووە، لە رۆما خوێندوویەتی، رۆڵێکی بەرچاوی لە بڵاوکردنەوەی بیروراکانی مامۆستاکەی ئەفلۆتین گێڕاوە، بەتایبەتی لە بڵاوکردنەوەی (ئینیادە)دا[24]. یەکێك لە شاگردەکانی تری ئەفلۆتین (جامبلیك)ی فەیلەسووف بووە کە کتێبی (ئیساغۆجی) هەیە و، عەرەب وەریان گێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی)[25].

* * * * * *

---

(23) المنجد في الأدب والعلوم، بيروت، الطبعة الثانية عشر، ل٥٢.

(24) دیارە هەڵەی چاپ کەوتووەتە ناو (المنجد في الأدب والعلوم)ەوە. چونکە (ئینیادە ـ Eneide) داستانە و هی شاعیری بەناوبانگ (فرێجیل ـ Virgile ـ ٧١–١٩ پ. ز)ە.
کتێبەکەی (ئەفلۆتین ـ ٢٠٥–٢٧٠) ناوی (ئینادس ـ Enneades)ە، کتێبێکی فەلسەفییە و شەش بەرگە و هەر بەرگەی نۆ وتارە. بۆ زێدە زانیاری بڕوانە: قصة الفلسفة اليونانية ـ تصنيف ـ أحمد أمين ـ زەکی نجيب محمود، ١٩٧٠، ص ٢٣١. هەروەها بڕوانە: المنجد في الأدب والعلوم، ل٤٣.

(25) المنجد في الأدب والعلوم، ل ٣٨٧.

## وردبوونەوەیەك

بـە وردبوونـەوە لەسـەر تێكسـتی ئـەو سەرچـاوانەی پێشـەوە كـە باسـی (ئەسیرەدینی ئەبهەری) و كتێبی (ئیساغۆجی)یان كرد مەزەندەیەكی پتەو لە بیر و بۆچـووندا دروست دەبـێ كـە رەنگـە مەبەسـتی ئەبهـەری لـە رسـتەی: (ئەوەی پێویست بووبێ تیایدا دامان ناوە) پێكەوەنانەوە (تصنیف) بێ، واتە ئـەو كتێبــە دانــراو بــووە بــەڵام مــن لەگــەڵ فیكـر و ســەلیقەی عەرەبیــدا گونجاندوومــە و ســەرلەنوێ بــە جــۆرێكی تــر دامرشــتووەتەوە.. یــان وەری گێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی. بـەو وەرگێڕانـە دەسـكارییەكی گونجـاوی تیـا كردووە، دەسكارییەكەش لە چەند روویێكەوەیە:

١ــ گــەلێ لــە نموونــەكانی بابەتــەكانی لەگــەڵ نموونــەكانی نــاو كتێبــە عەرەبییەكانــدا كــە بــاو بــوون، گونجانــدووە بــۆ نموونــە لــەجیاتی نــاوە یۆنانییەكان ناوی (زید و عمر و بەكری) داناوە، كە ئەو ناوانە لەگەڵ میزاجـی ئەدەبی و فیكری مەلا و قوتابییەكانی ناو مزگەوتەكاندا گونجـاو و هاوچەشـن بوون و هەمیشە لە زەینیاندا ئامادەگییان هەبووە.

٢ـ كە دەگاتە سەر بابەتی (متواترات) كە یەكێكە لـە پێـنج بەڵگەسـازەكە دەیكات بە بەڵگە لەسەر راستگۆیی پێغەمبەری موسڵمانان.

ئا لەو روانگـەوە وتەكـەی راسـتە كـە دەڵـێ: (ئـەوەی بـۆ فێربـوونی ئـەم زانستە پێویست بووبێ تیایدا دامان ناوە).

٣ـ وەكـو رابـورد (الموسـوعة العربیـة)دا وتـرا: (فۆرفۆریـۆس) ئیسـاغۆجی داناوە.

٤ــ هــەروەها لــە (المنجـد في الأدب والعلـوم)دا جارێـك وتــی: ئیسـاغۆجی (فۆرفۆریۆس) دایناوە و دراوەتە پاڵ (ئەبهەری). (تۆ سـەرنجی ئـەو رسـتەی

دواوه بدەن) جارێکی تر دەڵێ: (ئیسـاغۆجی) جامبلیـك کـە یـەکێك بـووە لـە قوتابییەکانی ئەفلۆتین دایناوە[26].

لە هەر دوو جاردا دانانی ئیساغۆجی نەدراوەتە پاڵ (ئەبهەری).

ماوەیە سەر ئەوەی کە (ئەبهەری تەنیا دەسکاری کردن ئـان داڕێشـتنەوە و وەرگێڕانی بۆ سەر زمانی عـەرەبی بـۆ مایـەوە. ئـەو زانایـە (فۆرفۆریـۆس، جامبلیك) هەردووکیان شاگردی یەك مامۆسـتا بووینـە کـە (ئـەفلۆتین)ە، جـا هەر کامێك لەو دووە ئیساغۆجی دانـابێ بەشـی (ئەبهـەری) هـەر ئەوەیـە کـە وتمان.

ماوەتەوە سەر ئەوەی کە ئایا ئیسـاغۆجی بـە کـام زمـان بـۆ یەکـەم جـار دانراوە؟

ئایا بە زمانی یۆنانی بووە؟ هـەروەکو (منجـد في الأدب والعلـوم) و (مغـني الطلاب)ەکەی سەر ئیساغۆجی دەیڵێن.

یان بە زمانی رۆمانی لاتینی بووە؟

---

[26] (ئەفلۆتین ـ ٢٠٥–٢٧٠ز) لە شاری ئەسکەندەرییەی وڵاتی میسر بووە، رێبازێکی نوێی فەلسەفی داناوە کە بە ناوی (ئەفلاتوونیەتی نوێ the new platonists) ناوبانگی دەرکردووە. بڕوای بە تیۆری ئایدیالیستی ئەفلاتوون هەبووە. بەڵام بەو تیۆرە نەگەیشتووەتە یەقین و پەنای بردووەتە بەر سرۆش و تەلیسم و نزا و سیحر و شتی ئەفسانەیی. لەگەڵ بیروڕاکانی ئەفلاتوونی یۆنانیدا تێکەڵاوی کردوون.

دوو قوتابی هەبوون، هەردووکیان بوون بە فەیلەسووف، یەکێکیان (فۆرفۆریۆس) بووە، ئەویتریان (جامبلیك) گوایا ئەم دووانە دەستێکی باڵایان لە زیندوو کردنەوەی کەلتووری یۆنانیدا هەبووە، کتێبەکەی (ئەفلۆتین)ی مامۆستایان کە ناوی (ئینادس) بووە. ئەوان رەواجیان پێ داوە.

بۆ زێدە زانیاری بڕوانە: (قصة الفلسفة اليونانية)، نووسینی: أحمد أمين ـ زكي نجيب محمود، القاهرە، ١٩٧٠، ل ٢٣٠–٢٣٥.

یـان بـە زمـانی (سـریانی) کـە هەنـدێ وردە پـەراوێزی سـەر شـرۆڤەکانی ئیساغۆجی وای بۆ دەچن.

ئێمـە وەرامێکـی دوور لـە گومانمـان لا نییـە. بـەڵام دەرفـەتی گـەڕان بـە شـوێنی وەرامـی پـڕ لـە یەقینـدا لـەم بـوارەدا ئاقـارێکی بـەربڵاوی هەیـە و دانەخراوە.

* * *

ئیساغۆجی هەر کامێك لە فۆرفۆریۆس یان جامبلیك دایان نابێ بیر بـە لای ئەوەشدا دەچێ کە رەنگە بە زمانی رۆمانیی لاتینـی نووسـرابێتەوە، چـونکە لەو سەروبەندەدا کە فۆرفۆریۆسی تیـا ژیـاوە، کـەلتوور و فیکـری گریکـەکان ببـوو بـە پێـوەر و سـەنگی مەحـەکی زانسـت و زانیـاری، ئـەدەب و هونـەر و فەلسەفە بە زمانی رۆمانی دەنووسران، چونکە ئـەودەم رۆمـانی زمـانی ئـاین بـوو، هـەروەکو لـە جیهـانی موسڵمانانیشـدا تـەنیا بـە زمـانی عـەرەبی شـت دەنووسرا.

گومانی ئەوەش دەکرێ کە رەنگە ئیساغۆجی بە زمانی لاتینی یان یۆنانی نووسرابێتەوە و بۆ خوێندکارانی کلیسەکانی رۆژهـەڵات کرابـێ بـە (سـریانی) ئـەوجا لـەوێوە کرابـێ بـە عـەرەبی، چـونکە پـاش بـەرین بـوونی رووبـەری فتوحاتی ئیسلامی چەندان زانا و زمان زانی سـریانی هاتنـە نـاو ئیسـلامەوە، ئەوەی دەیانزانی کردیانە عەرەبی.

* * *

أحمد أمين لە (فجر الاسلام)دا کـە باسـی فەلسـەفەی یۆنـان و کاریگـەری لەسەر فیکری ئیسلامی دەکات، دەڵێ:

(... بەسەر دەستی قەشە نەسرانییەکاندا گەلێ لە فەلسەفەکانی یۆنان کرانە سریانی و لەوێوە وەرگێڕدرانە سەر زمانی عەرەبی...) کە دێتە سەر ئەوانەی کە دەستێکی بالآیان لەو بوارەدا هەبوو دەڵێ: (بەناوبانگترین زانا کە کتێبە یۆنانییەکانیان وەردەگێڕانە سەر زمانی سریانی "سەرجیسی رەسعەنی" بوو، کە لەساڵی ٥٣٦ز مردووە، گەلێ کتێبی یۆنانی کردوون بە سریانی کە تا ئێستاش لە مۆزەخانەکانی بەریتانیادا پارێزراون، لەوانەی کە لە یۆنانییەوە کردوونی بە سەریانی چەند نامەیەکی (ئەرەستۆ و فۆرفۆریۆس و جالینۆس)ن. "سەرجیس" نامەیەکی لە لۆجیکدا داناوە، باسی دە واچەکە ـ المقولات العشر ـ دەکات، بەلآم تەواو نییە[27].

نووسینەکەی (احمد امین) بە تێکڕایی ئەمە دەگەیەنێ:

١ـ زۆرینەی ئەو کتێبانە کە لەسەر فەلسەفەی یۆنان بوون و پێویست بوو زانایانی عەرەب بیانزانن کە دەکرانە عەرەبی لە زمانی سریانییەوە وەردەگێڕدران. بەلآم ناوی هیچ لەو کتێبانە نابات.

٢ـ وتەکە ئەو ختوورەش دەخاتە دڵەوە کە (سەرجیسی رەسعەنی)[28] لە سەردەمی خۆیدا ئیساغۆجی فۆرفۆریۆسی وەرگێڕابێتە سەر زمانی عەرەبی، یان کتێبێکی دیکە وەکو ئەوی کردبێتە عەرەبی.

* * *

---

[27] فجر الاسلام، احمد امين، ص١٣٢.

[28] (سەرجیس رأس العینی) ئەم زانایە لە ناو مێژوونووسانی عەرەبدا وا ناوی نووسراوە یان بە (سەرجیس رەسعەنی) نووسراوە لە راستیدا ناوی ـگورگیسی کانیاوی) بووە و یەکێکە لە زانا کوردەکانی سەردەمی خۆی.

ڕەنگە گومانی ئەوەش بکرێ کە ئیساغۆجی ئەگەر بە زمانی ڕۆمانی یان یۆنانی لە سەرەتادا نووسرابێتەوە، لەوانەیە کرابێ بە (سریانی) و ئەوجا لەوێوە کرابێ بە عەرەبی، چونکە زۆرینەی ئەو زانا نەسرانی و جوولەکانە کە پاش بەرینکردنی رووبەری ولاتی موسڵمانان دەیان لەو زانایانە کە هاتنە ناو ئیسلامەوە زمان زانی سریانی بوون، ئەوەی لەمەڕ فەلسەفەی یۆنانی دەیانزانی کردیانە عەرەبی[29].

یەکێك لە توێژەرانی عەرەب کە باسی کاریگەری فیکری گریك لەسەر کەلتووری عەرەب دەکات بەم جۆرەی خوارەوە دەڵێ:

"شاری (جوند نیساپور) لە زەمانی شاپووری دووەمدا کرا بە بنکەی کۆکردنەوەی یەخسیرە ڕۆمانییەکان لە ساڵی (٥٣١-٥٨٧)دا، لەوێ پولسی فارسی کتێبێکی لۆجیکی بە زمانی سریانی بۆ خەسرەوی یەکەم دانا، بۆ ئەوەی لە زانینی ئەوەوە لە فەلسەفە و لۆجیکی ئەرەستۆ و (ئیساغۆجی) کە هی (فۆرفۆریۆس)ە تێبگات" هەروەها دەڵێ: (بزووتنەوەی وەرگێڕانی فەلسەفەی گریك لە پێشەوە بۆ زمانی سریانی بووە ئەوجا کراوە بە فارسی و بە زمانی ڤەهلەوی، لەو شارەدا رووناکبیری فارسی و هیندی گریکی یەکیان گرتووە)[30].

کەواتە بەر لە بزووتنەوەی دانان و نووسینی عەرەبی کە لە سەدەی دووەمدا بەتایبەتی لە سەردەمی مەئموونندا پەرەی سەند، بەر لەوە

---

[29] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ١٦١.

[30] الاثر الاغريقي في البلاغة العربية من حافظ الى ابن المعتز، تاليف مجيد عبدالحميد فاجي، مطبعة الآداب، النجف الاشرف، ١٩٧٦، ص٣٥-٣٦.

(ئیساغۆجی) ئامادەگی لەناو زانایان و خوێندکاراندا هەبووە، ئیتر چ بە زمانی سریانی بووبێ یان بە زمانی فارسی.

زۆربەی سەرچاوەکان وا دەگەیەنن کە فیکری ئەگریکی ئەو مەسیحییانە کە زمانی سریانییان زانیوە، ئەوان گواستوویانەتەوە سەر زمانی سریانی و لەوێشەوە بۆ سەر زمانی فارسی و ئەوجا بۆ زمانی عەرەبی.

بەهۆی وەرگێڕانی فەلسەفە و لۆجیکی یۆنانەوە لە نێوانیاندا جۆرە تێکەڵاوییێکی وا رووی دا کە بە ئەستەم لە یەك جیا دەکرێنەوە[31].

## لۆجیك و هزری ئیسلامی

لەو کاتەوە کە بزووتنەوەی نووسینی کتێب دانان لە سەدەی دووەمی کۆچیدا لە ئەنجامی بەرگری کردن لە ئیسلام و بۆ هوشیار بوونەوەی موسڵمانان هاتە ئاراوە.

بۆ بەرگری کردن لە قورئان و فەرموودەکان زانایانی ئیسلام بە ناچاری پەنایان بردە بەر فەلسەفە و فیکری ئەو میللەتانە کە ئیسلام لە ناویاندا بڵاو کرایەوە.

---

[31] بزووتنەوەی وەرگێڕان لە سەردەمی (ابو جعفر المنصور)ەوە کە دەستی پێکرد سێ قۆناغی بڕی:

١ـ لە ساڵی (١٣٦هـ)وە تا ساڵی (١٩٣) سەردەمی خەلافەتی منصور و رەشید.

٢ـ لە ساڵی (١٩٣)وە تا ساڵی (٣٠٠) لە سەردەمی مەئمووندا.

٣ـ لە ساڵی (٣٢٠) تا ساڵی (٣٦٠).

لەو سێ قۆناغەدا زۆربەی کتێبەکانی ئەرەستۆ لە لۆجیك کۆسمۆلۆجیادا، وەرگێڕدرانە سەر زمانی عەرەبی. بۆ زێدە زانیاری تەماشای (ضحى الاسلام) ل٢٠٤–٢٠٥ بکە. هەروەها تەماشای (التمدن الاسلامي) جورجی زەیدان بکە.

شارەزایانی ئەو میللەتانە لە زۆر رووی ئاینی و ئایدیالییـەوە کێشـمەکێش و مشتومڕی هزرییان لە تەکدا دەکردن و دەستەپاچەیان دەکردن، بۆ ئەوەی ئەوانیش بتوانن بەرگری لە بیروڕای خۆیـان بکـەن، هـەمان چـەکی زانیـاری و فەلسەفی لە دایلۆگەکانیانـدا بخەنـە کـار، پـەنایان بـۆ ئـەو زانیـاری و بـیروڕا فەلسەفییانە دەبرد کە بەرگری ئاینەکەی خۆیانی پێ بکەن.

فیکـری یۆنـانی بـە گشـتی و لـۆجیکی ئەرەستۆتالیسـی لـە زۆر رووەوە تێکەڵاو بە فیکری ئیسلامی کرا و تـوانی تـا رادەیـەك فیکـری ئیسـلامی لـە شـێوازی وەرگـرتن لـە پێشـینانەوە و لـە بیروبـاوەڕێکی لـە خـۆڕا چەسـپاوی ئاساییەوە بەرەو بیروباوەڕێکی لەسەر فیکر و زانیاری دامەزراو ببات.

هزر و فەلسەفەی یۆنانی کە کەوتە ناو فیکـری ئیسـلامییەوە تـەنیا بـەوە رانەوەستا بـەرگری پـێ بکـرێ، بـەڵکو هـەموو رووبـەرێکی فیکـری ئیسـلامی تەنییەوە و بوو بە رێنمایی کار و هەوێنی هەموو زانیارەکانی بواری ئەدەب و هونـەر و زمـان و رێزمـان و رەوانبێـژی و عـەرووز و زانسـتی کـەلام و فیقـه و شەریعەت. بۆ نموونە (پێناسە ـ الحد) بەو مانایە کە هەموو وردەکـانی خـۆی بگرێتەوە و دەرگاش لەسـەر شـتی غـەوارە رەپـێش بکـات. (الجـامع المـانع) بەشێکە لە لۆجیکی ئەرەستۆتالیسی کەچـی بناغـەی لـەناو (اصـول الفقـه)ی ئیسلامیدا داکوتاو، بووە بە ئامێرێکی دەستەبەر و ئەنجامدەر و گەڵاڵـەدەر و پێناسەکاری ئەحکامی شەرعی.

پێوانـدن (القیـاس)یـش کـە یەکێکـە لـە (بنـەما یەقینییـەکان ـ مبـادیء التصدیقات)ی لۆجیکەکەی ئەرەستۆ زۆر لە ئەحکامی فیقه و شـەریعەتی پـێ هەڵدەهێنجرێ. تەنانەت (القیاس) بووە بە سەرچـاوەیەك ئـەحکامی شـەرعی پێ ئەنجام بدرێ.

سەرچاوەی سەرەکی شەریعەتی ئیسلام: (قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر و کۆڕای موسڵمانان و "القیاس"ە)[32].

دوکتۆر عەلی وەردی دەڵێ: (ڕێزمان زانەکانی بەسرە بەوە ناسراون کە یاسا ڕێزمانەکانیان بەر (پێواندن ـ قیاس) دەخست، هەر وشە و ڕستەیەك بەر ئەو قیاسەیان نەکەوتبایە وەدەریان دەنا)[33].

(کە موسڵمانەکان لەگەڵ مەجوسی و یەهوود و نەسرانیدا تێکەڵاو بوون، دییان ئەوان بە چەکی فەلسەفەی یۆنانییەکان لەگەڵیان دەکەونە قسەکردن ئیدی ئەمانیش ناچار بوون پەنا بەرنە بەر هەمان فەلسەفە و لۆجیك)[34].

* * *

## هەڵوێستی زانایانی ئیسلام بەرامبەر بە لۆجیك

هەڵوێستی زانایانی ئیسلام لەمەڕ لۆجیکی ئەرەستۆتالیسی و فەلسەفەی یۆنان بەگشتی هەڵوێستێکی یەکگرتوو نەبووە، بەڵکو زانایان لە چەند هەڵوێستێکدا بیروڕای خۆیان لەو بارەوە دەربڕیوە، دەکرێ لەم خاڵانەی خوارەوەدا کورتیان بکەینەوە:

١ـ هەڵوێستی پەسەندکردنی لەگەڵ لەسەر زیادکردن و دەسکاری کردنی.

٢ـ هەڵوێستی ڕەتکردنەوە و وەرنەگرتن و بە حەرام زانینی.

٣ـ هەڵوێستی ڕەتکردنەوە، دوای ڕەخنە لێگرتن و بەربادکردنی.

---

[32] الانموذج ـ في اصول الفقه، تألیف الدکتور فاضل عبدالواحد عبدالرحمان، مطبعة المعارف، بغداد، الطبعة الاولی، ١٩٦٩، ص ١٠٤.

[33] اسطورة الادب الرفيع، دکتور علي الوردي، ص١٨٦.

[34] ضحی الاسلام، احمد امین، ص٢٨٨.

هەندێ لەو زانایانە کە دەربارەی فەلسەفە و لۆجیکی ئەرەستۆتالیسی هەڵوێستی پەسەندکردن و لەسەر زیادکردن و دەسکاری کردنیان نواند، ئەم زانا ناودارانەی خوارەوە نموونەی ئەوانە بوون:

### أ ـ فارابی (٨٧٣–٩٥٠)[35]

ئەم زانایە گەلێ بایەخی بە فەلسەفەی یۆنان و لۆجیکی ئەرەستۆتالیسی داوە، چەندین کتێب و نامەی لەسەر فەلسەفە و لۆجیك داناون.

هەوڵی ئەوەی داوە کە فەلسەفەی یۆنانی لەگەڵ بنەماکانی ئایینی ئیسلامدا بگونجێنێ و جۆرە هۆشمەندییەکی فیکرییانەی زانستییانە بخاتە ناو بیروڕاکانی ئیسلامەوە، تەنانەت هەوڵی ئەوەشی داوە بەراوردکارییەك لەنێوان (رێزمانی عەرەبی و لۆجیك)دا بکات[36].

### ب ـ ابن سینا (٣٧٠–٤٢٨ك)[37]

---

[35] فارابی پاش ئەوەی موسڵمان بووە ناوی نراوە (ابونصر محمد الفارابی) لە رەچەڵەکدا تورك یان فارس یان ئەرمەن بووە، فەلسەفەی بەسەر دەستی زانا نەسرانییەکاندا خوێندووە و دەستێکی باڵای تیایدا پەیدا کردووە، هەوڵی داوە فەلسەفەی ئەفلاتوون و ئەرەستۆ بە یەکەوە گرێ بدا.

نزیکەی دوانزە کتێبی لەسەر فەلسەفە داناون، لەناو زانایانی ئیسلامدا دوای ئەرەستۆ بە (مامۆستای دووەم) ناسراوە، لە دیمەشق لە ساڵی (٩٥٠ز) مردووە.

[36] دراسات في المنطق ـ مع نصوص مختارة، الدكتور عزمي اسلام، جامعة الكويت، ١٩٨٥، ص١٢.

[37] ناوی تەواوی (ابن سینا) ابو علی کوڕی عبدالله کوڕی حسن کوڕی علی بن سینا، کە بە (الشیخ الرئیس) نازناوی براوە، نازناوی (الشیخ) لەبەر ئەوە بووە لە فەلسەفەدا زانایەکی مەزن بووە، نازناوی (الرئیس)یش لەبەر ئەوە بووە لە سیاسەتدا ئیشی کردووە و چەندین جار پۆستی وەزیری پێدراوە، لە ساڵی (٤٢٨ك)دا لە هەمەدان کۆچی دوایی کردووە و گۆڕەکەی لەوێیە. پتر لە سەد کتێبی دانراوی هەن.

ئـەو زانایـە گرنگییـەکی زۆری بـە فەلسـەفە و لـۆجیکی ئەرەستۆتالیسـی داوە، گەلێ شرۆڤە و لێکۆڵینەوەی لەسەر نووسیون، ئـەوەی کتێبـەکانی ئـەو زانایە بخوێنێتەوە خۆی لەبەردەم سەرچـاوەیەکی لـە بـن نـەهاتووی فیکـری فەلسەفیدا دەبینێتەوە، بـە تایبـەتی کتێبـی (الشـفاء)ی کـە لـە چـوار بـەش (لۆجیك، کۆسمۆلۆجیا، بیرکاری، لاهووت) پێك هاتووە[38].

لە بەڵگەکاریدا هەمیشە پەنای بردووەتە بەر فیکری فەلسەفی و لـۆجیکی ئەرەستۆتالیسی.

بـۆ خـۆی فەلسـەفەیەکی تـەبا و گونجـاوی لەگـەڵ بنـەما و پرنسـیپەکانی ئیسلامدا بنیات ناوە.

## پ ـ الغزالی (١٠٥٩–١١١١)

ئەم زانایە بەرگری زۆری لە لۆجیك کـردووە، گـەلێ بایـەخی پێـداوە، پێـی وابووە: (هەر کەسێك لەو زانستەدا زانیاری نەبێ پشت بە زانستی نابەسترێ، ئەوەی پێی وایە لۆجیك کوفرە یان حەرامە، ئەوە نەزان و نەفامە)[39].

ئەو زانایە هەر چەند لە بیست و یـەك مەسـەلەی فەلسـەفیدا رەخنـەی لـە فەیلەسـووفەکانی یۆنـان گرتـووە لـەو بـارەوە کتێبێکـی بـە نـاوی (تهافـت الفلاسفة)وە داناوە.

---

[38] ابن سینا ـ تیسیر شیخ الارض، دار الشرق الجدید، بیروت، ١٩٦٢، ص١٨٧.

هەروەها: احمد فؤاد الاهواني، ابن سینا، دار المعارف بمصر، ١٩٥٨، ص١٩.

[39] مفتی الطلاب في علم المنطق، للعلامة محمود بن حافظ حسن المفتیني. ل٩.

لەگەڵ ئەوەشدا خوێندنی فەلسەفەی بە پێویست زانیوە و لۆجیکی بە دەروازەی ئەژمار کردووە[40].

## ج ـ ابن حزم (٩٩٤–١٠٦٤)[41]

ئەم زانایەش بایەخی بە لۆجیکی ئەرەستۆتالیسی داوە، هەوڵی ئەوەشی داوە کە هاوگونجاندنێك لەنێوان بیری ئیسلامی و لۆجیکی ئەرەستۆدا واربێ. کتێبێکی لەو بارەوە داناوە ناوی (التقريب لحد المنطق)[42].

لەناو زانا بەناوبانگەکانی ئیسلامدا نموونەی ئەو زانایانە زۆرن کە فەلسەفە و لۆجیکیان لا پەسەند بووە، چەندین کتێبیان لەو بوارەدا داناون و فیکری ئیسلامییان پێ دەوڵەمەند کردووە.

٢ـ ئەو زانایانە کە فەلسەفە و لۆجیکیان رەت کردووەتەوە. ئەوانە سەبارەت بە حەرامکردنی فەلسەفە گوتەیەکیان هەیە راست و رەوان هەڵوێستەکەیان دەردەبڕێ و دیانوت:

(لۆجیك دەرگای فەلسەفەیە، فەلسەفە خۆی شەڕە، کەواتە دەرگاکەشی شەڕە). بەپێی ئەو گۆتەیە دەیانوت: "ئەوەی دەم لە لۆجیك بدا زەندەگەیە

---

[40] ناوی تەواوی الغزالی (ابو حامد محمد الغزالی)یە و لە ساڵی (١٠٥٩)دا لە خۆراسان لە شاری تووس لە دایك بووە، یەکێکە لە زانا بەناوبانگەکانی جیهانی ئیسلامی، گەلێ کتێبی داناون، لە هەموویان بەناوبانگتر (المنقذ من الضلال) و (تهافت الفلاسفة) و (احياء علوم الدين)ە.

[41] ابن حزم لە ئەندەلوس لە دایك و باوکێکی مەسیحی بووە ، لە فیقهی ئیسلامی و پزیشکی و شیعر و فەلسەفە و مێژووناسیدا دەستێکی باڵای هەبووە، لەبەر ئەوەی سیاسەت زان بووە کراوە بە وەزیر لە دواییدا وازی لێ هێناوە و خۆی بۆ نووسین تەرخان کردووە.

ئەم کتێبانەی هەن: (طوق الحمامة)، (الفصل في الملل والاهواء والنحل).

[42] دراسات في المنطق، دکتور عزمي اسلام، ل١٣.

(من تمنطق فقد تزندق)"[43] واتـه ئـهوهى زانسـتى لۆجيـك بخـوێنىٚ دهبێتـه زهندهگه چونكه دهكهوێته ناو (گێژاوى پێوانـدن و ئهنجامهكانيـهوه، ئـهوهى كهوته ناو ئهو شتانهوه بيروباوهڕى ئايينى لهق دهبىٚ و تووشى سـهرگهردانى دهبىٚ، چونكه ئاين لهسهر خۆ دانه بهدهستهوهيه نهك بيركردنهوه).[44]

ئهم زانايانهش لهوانهن كه لۆجيكيان به حهرام زانيوه:

## أ ـ أبى الحيان التوحيدى

يـهكێك بـووه لـه زانايـانى (كـهلام) ئـهو لـهو بـاوهڕهدا بـووه كـه زانايـانى (المتكلمين)[45] ئاينيـان بـه لۆجيـك تێكـداوه، سروشـتى ئـاين لهسـهرخۆ بـه دهستهوهدان يهقين دامهزراوه، بهلاّم ئهو زانايانـه كـه فهلسـهفه و لۆجيكيـان هێنـا و خسـتيانه نـاو ئاينـهوه خـهڵكيان تووشـى سـهر لىٚ شـێواندن كـرد، مادامهكى ئاين لهسهر ترس و خۆ به دهستهوهدانى خوا راوهسـتاوه، كهواتـه زانايانى (المتكلمين) گهلىٚ له ئاينهوه دوورن.

---

[43] زهندهگه به وانه وتراوه كه لهسهر بيروباوهڕى (زهند ئاوێستا)ن، بهلاّم به رهواڵهت خۆيان به موسڵمان دهنواند. بڕوانه: دراسات في المنطق، دكتور عزمي اسلام، ص١٣.

[44] المنجد في اللغة والادب والعلوم، الطبعة الثانية عشر، ص٣٠٨.

[45] دوو زاراوه بۆ زانايانى ئيسلام بهكارهاتوون، يهكهم زاراوهى (ئههلى كهلام) به وانه وتراوه كه تهنيا له ئهحكامى ئايندا پشتيان به قورئان و فهرموودهكان و شتى نقلّى دهبهست و پێيان وابووه تهنيا (نقلّ) مرۆڤ به يهقين دهگهيهنىٚ نهك عهقلّ. دووهم (المتكلمون) پێشيان دهوترا (الحكماء) ئهوانه ههموو حوكمێكى شهرعيان دهدايه بهر تيشكى عهقلّ و رووێكى فهلسهفييان دهدايه. گروهى (المعتزلة) لهوانه بوون.

هەروەها دەیوت: (ئەوەی خەریکی فەلسەفە دەبێ، دەشێ واز لە ئایین بێنێ، ئەوەش ئایینی بووێ دەبێ واز لە فەلسەفە بێنێ).

**ب ـ الشافعی (٧٦٧-٨٢٠)**

ئەمیش خوێندنی فەلسەفە و لۆجیکی بە باش نەزانیوە و وتوویەتی: (خەڵك چەند نەزانن، زمانی عەرەبیان وەلا ناوە و روویان کردووەتە زمانی ئەرەستۆتالیسی)[46].

بەلای ئەوەوە دەبێ: (یان پشت بە لۆجیك ببەسترێ و واز لە شێوازی قورئان بهێنرێ، یان شێوازی قورئان وەربگیرێ و واز لە لۆجیکی ئەرەستۆ بهێنرێ). دیارە شافعی لۆجیکی دژ بە شێوازی قورئان زانیوە.

٣ـ ئەوانەی کە دوای رەخنە لێگرتن و هەڵسەنگاندنی رەتی دەکەنەوە.

نموونە بۆ ئەم گروپە ئەم زانایانەن:

**أ ـ ابن تیمییە (١٢٦٣-١٣٢٩ز)**

ناوی تەواوی (تقی الدین ابو العباس احمد بن تیمییە)یە. لە شاری (حەڕان) لەدایك بووە.

هەڵوێستی ئەم زانایە لە هەڵوێستی (غەزالی) دەچێ، هەردووکیان فەلسەفەیان خوێندووە و رەتیان کردووەتەوە، بەلاّم (غەزالی) لەسەر لۆجیکی ئەرەستۆتالیسی ماوەتەوە، کەچی (ابن تیمییە) پاش خوێندنی فەلسەفە و لۆجیك هەردووکیانی رەت کردوونەتەوە.

---

[46] جلال الدين السيوطي، (صون المنطق والكلام عن فن المنطق والكلام)، نشر د. علي سامي النشار، القاهرة ١٩٤٧.

ب ـ (ابن قيم الجوزيه) و (جلال الدين السيوطى) و هى تريش هەڵوێستيان لەمەڕ فەلسەفە و لۆجيك لە هەڵوێستى (ابن تيمييه)وە نزيكە.

* * *

# خوێندنى ئيساغۆجى

ئيسـاغۆجى ئـەو كتێبـە بچـكۆلە گـران بـەها و سـەنگينەيە كـە بنـەما لۆجيكييەكانى ئەرەستۆتاليسمان فێر دەكات.

لەوەتەى حوجرەى فەقىێ لـە مزگەوتـەكانى كوردسـتان بـووە بـە شـوێنى خوێنـدن بگـرە لـە هـەموو حـوجرە و (كـەتاتيب)ى مزگەوتـەكانى جيهـانى ئيسلامدا خوێنراوە.

ئەو شاگرد و فەقێيانە توانيبێتيان لە خوێنـدنى ئـەو مـاددەدا رەت بـبن و لێى تێگەيشتبن توانيوێتيان بە ئاسانى لـە ماددەكـانى ديكـەدا تێپـەڕن و لـە پايەى مەلايەتى و ئيجازە وەرگرتن نزيك دەبوونەوە.

هەروەها ئەو مەلايەى لەو ماددەدا دەسـتى زانينـى هەبوايـە و بـە جـوانى بيتوانيبايە فەقىێ تێبگەيەنىێ لەناو حوجرەكانى كوردستاندا ناودار دەبـوو لـە هەموو شوێنێكەوە فەقێى زيـرەك روويـان تـىێ دەكـرد و، هـەر ئـەو مەلايـەش دەكرا بە وانەبێژى مزگەوتـە ناودارەكـان و مـافى ئيجـازەدانى فـەقێيانى پـىێ دەبەخشرا. دەبىێ بە خاوەن پايە و سايەى ناو كۆمەڵ.

ئەو كتێبە گران و سەنگينە كە لـەم لێكۆڵينەوەمانـدا باسـى دەكـەين، بـۆ ئاسـانكردنى و لىێ تێگەيشـتنى گـەلىێ (شـرۆڤە و قەيـد و تـەزبيب و داوێـن و پـــەراوێز)ى لەســـەر نووســـراون بـــە هـــۆى ئـــەو نووســـراوانەوەى قـــەراغ

مەتنەکەیەوە، ئاسانکارییەك بوو مـەلاکان بـە یارمـەتی ئەوانـەوە دەیـانتوانی تاڕاددەیەك فەقێیەکانیان تێبگەیەنن و حاڵییان بکەن، هەر چەند ئەو داوێن و پەراوێزانە وەکو باژەل و ئاڵۆز بـوونێکی لێکچـزراوی مەتنەکـە بـوون و دایـان دەپۆشی. بۆیە هەندێ جاریش وا کەوتووەتەوە سەریان لە مامۆستا و فـەقێ شێواندووە، لەگەڵ ئەوەشدا کتێبی بێ لەو وردە نووسینانەی دەور مەتنەکـە لای مەلا و فەقێ پەسەند نەبووە.

ئێمە لێمان روونە لەو رۆژەوە حوجرە لە پاڵ مزگەوتـدا بـووە بـە شـوێنی خوێنـدن بـۆ روونـاکبیری سـەردەمی خـۆی. هـەر لـەو رۆژەوە (ئیسـاغۆجی) ماددەیەکی سەرەکی خوێندنی بالاّی ئەو حوجرانە بووە.

بـەلاّم تائێسـتا بـە تـەواوەتی بـۆ ئێمـە سـاغ نەبووەتـەوە کـە ئایـا لـە چ بەروارێکەوە حوجرەی فەقێیان وەکو خوێندنگایەك لە تەنیشت مزگەوتەکانی کوردستاندا دامەزراوە.

ئـەوەشمان لا روون و دیـارە کـە ئیسـاغۆجی و هـەموو کتێبـەکانی نـاو حـوجرە بـە سـەدان سـاڵ بـەر لـە پەیـدابوونی چـاپ بـە دەسـتنووس نووسراونەتەوە و هەر خوێندکارێك بە هـەر جـۆر بـووە کتێبـی دەستنووسـی وەدەسـت خـۆ خسـتووە و وەکـو چـاوی خـۆی پاراسـتوویەتی یـان لەبـەری کـردووە، ئـەو کاتـەوە تـاکو ئـەم سـەردەمەش کتێـب لای ئـەهلی مزگـەوت بەهایەکی هێژای هەیە، کتێبی ئیساغۆجی لەبەر ئەوەی کتێبێکی بچووکە بـە ئاسانی نووسراوەتەوە و دەستکەوتووە، حاشیەکانی بە دەوریدا بە خـەتێکی سفت و ناسك نووسراون و ئەسڵی مەتنەکەیان رازاندووەتەوە.

هەروەها ئەوەشمان لێ ئاینە کە (ئیساغۆجی) بە چەند سـەدەیەك بـەر لـە موسڵمان بوونی کورد و کردنەوەی مزگـەوت بـۆ خواپەرسـتی موسـڵمانان لـە

پەرستگا و شوێنە ئەکادیمیاکانی دەوروبەری کوردستان لە کوردستانیشدا خوێنراوە. گەلێ بەڵگەی باوەڕپێکراو لەبەر دەستایە ـ کە لێرەدا شوێنی باس لێوەکردنیان نییە ـ ئەوە دەسەلمێنن کە لە شاری "راها ـ الرّها" کە لە جزیرەی بۆتانە و نزیك شاری "هەڕان ـ الحران" و "نەسێبین ـ نصیبین" قەشەیەکی گەورەی نەستوورییەکان کە ناوی (هۆباب ـ حببە) بووە کتێبەکانی (تیودۆر) و (ئیساغۆجی)ی کە هی (فۆرفۆریۆس)ە لە لۆجیکی ئەرەستۆوە وەری گێڕاوەتە سەر زمانی (سریانی) و لە پەرستگاکانی ئەو شارانەی سەرەوەدا خوێنراون. لەوێوە بەرەو ئەکادیمیەکانی نەستوورییەکان و جندنیساپور[47] چووە و لە ناو خوێندکاراندا پەخش و بلاّو بووەتەوە.

ئەمە بەر لەوەی (ئیساغۆجی) لە سەردەمی خەلیفە مەئموونی عەباسیدا وەربگێڕدرێتە سەر زمانی عەرەبی. ئەم سەرچاوەیەی کە ئێمە ئەو وتەی سەرەوەمان لێ وەرگرت دەڵێ: (ئەنۆشیروان ـ کەیخەسرەو، ٥٣١–٥٨٧ز) کە جندنیساپوری کرد بە بنکەی رووناکبیری بۆ بە یەکگەیشتنی هزر و بیری فارسی و هیندی و گریکی، خۆی ئیساغۆجی کە لۆجیکی ئەرەستۆیە خوێندوویەتی و خۆیشی بە خوێندکارانی وتووەتەوە)[48].

---

[47] (جندنیساپور لە دەڤەری ئیلامە، ئێستا بە ئێرانە) وشەکە لە بنەڕەتدا (گوند شاپوور)ە و لە نووسینی پیتی عەرەبیدا بووە بە جندنیساپور! لە سەردەمی ئەنۆشیروانادا کراوە بە بنکەی زانست و زانیاری، بۆ زێدە زانیاری بڕوانە: مدارس العراق قبل الاسلام، تألیف رفائیل بابو اسحق، ١٩٥١.

[48] اثر الاغریق في البلاغة العربیة من جاحظ الی ابن المعتز، مجید عبدالحمید ناجي، مطبعة الآداب، النجف الاشرف، ١٩٦٧، ص٣٥–٣٦.

کەواتە بەو سەرچاوانەدا دەردەکەوێ کە لۆجیکی ئەرەستۆ بەهۆی کتێبی (ئیساغۆجی)یەوە بەر لە هاتنی ئیسلام و دامەزراندنی مزگەوت لە کوردستان و دەوروبەری کوردستاندا خوێنراوە.

***ئەم پرسیارە وەرامی دەوێ...***

ئایا ئەو کتێبەی ئۆساغۆجییەی ئەو کات کە گەلێ سەرچاوە باسی لێوەدەکەن ئەم ئیساغۆجییەیە کە ئەمڕۆ کراوە بە عەرەبی و لە حوجرەی مزگەوتەکان و ئەبریشمەکانی پەرستگا مەسیحیەکاندا دەخوێنرێ کە باسی (پێنج واچەکان ـ المقولات الخمس)ەی لۆجیکی ئەرەستۆتالیسی دەکات؟

وامان لا پەسەند بوو دەقی ئەو (ئیساغۆجی)یەی کە لە ناو حوجرەکانی مزگەوتەکاندا خوێندنی باوە و وەکو بەشێکی گرنگی بەرنامەی خوێندنی ئایینی لێ هاتووە و یەکێکە لە دوانزە زانستەی مەلایان، بخەینە بەرچاوی خوێنەران.

* * *

وامان پێ باش بوو بابەتە سەرەکییەکانی ئیساغۆجی بخەینە بەرچاو بۆ ئەوەی خوێنەر پێشەکی بیرۆکەیەك لەبارەی لۆجیکەوە وەربگرێ و بزانێ چۆن لە دەروازەکانیەوە دەچێتە ناو وردەکاری بابەتەکانی.

**لێرەدا پرسیارێك هەیە:** ئایا کەی مزگەوت لە کوردستاندا بنیات نراوە؟ کەی قورئان هاتە کوردستان و دەست بەخوێندنی کرا؟

وەرامدانەوەی ئەو پرسیارە لەوانەیە سەرەتایەکی مێژوویی پتەو بۆ سەرهەڵدانی دامەزراندنی حوجرە وەکو خوێندگایەك لە کوردستاندا

دەستنیشـان بکـات. ئـەو کـات رەوتـی ئـەو خوێندنگایـە دەزانـرێ کـە چـۆن هەنگاوی ناوەوە و بەرنامەکانی چۆن چۆنی هاتوونەتە ئاراوە.

مامۆستا محەمـەد عـەلی قـەرەداغی لـەو لیسـتەدا کـە سـاڵی دامەزرانـدنی مزگەوتـەکانی کوردسـتانی تیـا خسـتووە روو لەوێـدا کـۆنترین مزگـەوتی بـە مزگەوتێکی رەواندوز داوەتە قەڵەم کـە مێـژووی بنیاتنـانی دەگەڕێتـەوە بـۆ ساڵی (٦٧٩)ی کۆچـی، کەچـی دوکتـۆر موحسـین محەممـەد لـە کتێبەکەیـدا (اربیل فی عهد الاتابکی)دا مێژووی بنیاتنانی یەکـەم مزگـەوت لـە کوردسـتاندا دەگەڕێنێتەوە بۆ ساڵی (٤٨٧ھ = ١٠٨٥م).

بە هەر حـاڵ ئـەو پرسـیارە رووبـەڕووی خوێنـەران دەکەینـەوە بەڕێگـەی گۆڤاری ئەکادیمی کوردی ئاگادارمان بکەنەوە[49].

* * *

[49] بڕوانە: بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد لە رێگەی دەستخەتەکانیانەوە، دانراوی محەمەد عەلی قەرەداغی، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، ١٩٩٨، ل٩٥. هەروەها بڕوانە (اربیل فی عهد الاتابکی)، د. محسن محمد حسین، ل٢٤٧.

## بابەتەکانی کتێبی (ئیساغۆجی)

کتێبی ئیساغۆجی بریتییە لە چوار دەروازە و سێنزە بابەت کە ئەمانەن:

**دەروازەی یەکەم:** لە پێنج هەمەکەکان (الکلیات الخمس) پێکهاتووە:

١- مۆرك (الجنس)
٢- جۆر (النوع)
٣- جیاکار (الفصل)
٤- وارسی تایبەت (العرض الخاص)
٥- وارسی گشتی (العرض العام)

ئەمانە بنەماکانی وێناندنن (مبادیء التصورات)

**دەروازەی دووەم:**

واچەی راڤەکار (قول الشارح) ⟵ ئاکامی وێناندن (مقاصد التصورات).

**دەروازەی سێیەم:**

گوتەکان (القضایا) ⟵ بنەمای یەقینەدەرەکان (مبادیء التصدیقات)

گوتەکان ئەم بەشانەی هەیە:

أ - ئەحکامی گۆتەکان (احکام القضایا)
ب - دژایەتی (التناقض)
ج - بەرواژیکردنەوە (العکس)

**دەروازەی چوارەم:**

پێواندن (القیاس) ⟵ ئاکامی یەقینداره‌کان (مقاصد التصدیقات)

پێواندن ئەم بەشانەی هەیە پێیان دەوترێ پێنج هونەرەکە (الصناعات الخمس):

٥- بەڵگە (البرهان) ⟵ یەقین بەرهەم دەدا.

٦- وێژاندن (الخطابة) ⟵ سەلمێنراو بەرهەم دەدا.

٧- کێشمە (الجدل) ⟵ ئەجیا (الظن) بەرهەم دەدا.

٨- هۆنراوە (الشعر) ⟵ ئەندێشە بەرهەم دەدا.

٩- هەڵەبازی (المغالطة) ⟵ گومان بەرهەم دەدا.

بەو بۆچوونەی سەرەوە ئیساغۆجی لە نۆ دەروازەی سەرەکی پێك هاتووە.

## القضايا

حاك بالطبع

القضية قول يصح ان يقال لقائله انه صادق فيه او كاذب فيه وهي اما حملية كقولنا زيد كاتب واما شرطية متصلة كقولنا ان كانت الشمس طالعة فالنهار موجود اما شرطية منفصلة كقولنا العدد اما ان يكون زوجا او فردا والجزء الاول من الحملية يسمى موضوعا والثاني محمولا والجزء الاول من الشرطية يسمى مقدما والثاني تاليا القضية اما موجبة كقولنا زيد كاتب واما سالبة كقولنا زيد ليس بكاتب وكل واحد منهما اما مخصوصة كما ذكرنا واما محصورة وهي اما كلية مسورة كقولنا كل انسان كاتب ولا شيء من الانسان بكاتب واما جزئية مسورة كقولنا بعض الانسان كاتب وبعض الانسان ليس بكاتب واما ان لا يكون كذلك تسمى مهملة كقولنا الانسان كاتب الانسان ليس بكاتب والمتصلة اما لزومية كقولنا ان كانت الشمس طالعة فالنهار موجود واما اتفاقية كقولنا ان كان الانسان ناطقا فالحمار ناهق والمنفصلة اما حقيقية كقولنا العدد اما زوج واما فرد وهي مانعة الجمع والخلو معا واما مانعة الجمع فقط كقولنا هذا الشيء اما شجر واما حجر واما مانعة الخلو فقط كقولنا زيد اما ان يكون في البحر واما ان لا يغرق فقد تكون المنفصلات ذوات اجزاء كقولنا العدد اما زائد او ناقص او مساو

## التناقض

وهو اختلاف القضيتين بالايجاب والسلب بحيث يقتضي لذاته ان يكون احديهما صادقة والاخرى كاذبة كقولنا زيد كاتب زيد ليس بكاتب ولا يتحقق ذلك الا بعد اتفاقهما في الموضوع والمحمول والزمان والمكان والاضافة والقوة والفعل والجزء والكل والشرط ونقيض الموجبة الكلية انما هي السالبة الجزئية كقولنا كل انسان حيوان وبعض الانسان ليس بحيوان ونقيض السالبة الكلية انما هي الموجبة الجزئية كقولنا لا شيء من الانسان بحيوان وبعض الانسان حيوان والمحصورات لا يتحقق التناقض بينهما الا بعد اختلافهما في الكلية والجزئية لان الكليتين قد تكذبان كقولنا كل انسان كاتب ولا شيء من الانسان بكاتب والجزئيتين قد تصدقان كقولنا بعض الانسان كاتب وبعض الانسان ليس بكاتب

## العكس

وهو ان يصير الموضوع محمولا والمحمول موضوعا مع بقاء السلب والايجاب بحاله والتصديق والتكذيب بحاله والموجبة الكلية لا تنعكس كلية لانه يصدق قولنا كل انسان حيوان ولا يصدق كل حيوان انسان بل تنعكس جزئية لانا اذا قلنا كل انسان حيوان يصدق قولنا بعض الحيوان انسان فانا نجد شيئا معينا موصوفا بالانسان والحيوان فيكون بعض الحيوان انسانا والموجبة الجزئية ايضا تنعكس جزئية بهذه الحجة والسالبة الكلية تنعكس سالبة كلية وذلك بين بنفسه فانه اذا صدق قولنا لا شيء من الانسان بحجر فيصدق لا شيء من الحجر بانسان والسالبة الجزئية لا عكس لها لزوما لانه يصدق بعض الحيوان ليس بانسان ولا يصدق عكسه

## القياس

وهو قول مؤلف من اقوال متى سلمت لزم عنها لذاتها قول آخر وهو اما اقتراني كقولنا كل جسم مؤلف وكل مؤلف محدث فكل جسم محدث واما استثنائي كقولنا ان كانت الشمس طالعة فالنهار موجود لكن النهار ليس بموجود فالشمس ليست بطالعة والمكرر بين مقدمتي القياس فصاعدا يسمى حدا اوسط وموضوع المطلوب يسمى حدا اصغر ومحمول المطلوب يسمى حدا اكبر والمقدمة التي فيها الاصغر تسمى الصغرى والمقدمة التي فيها الاكبر تسمى الكبرى وهيئة التاليف من الصغرى والكبرى تسمى شكلا والاشكال اربعة لان الحد الاوسط ان كان محمولا في الصغرى وموضوعا في الكبرى فهو الشكل الاول وان كان بالعكس فهو الشكل الرابع وان كان موضوعا فيهما فهو الثالث ومحمولا فيهما فهو الثاني فهذه هي الاشكال الاربعة المذكورة في المنطق والشكل الرابع منها بعيد عن الطبع جدا والذي له طبع مستقيم وعقل سليم لا يحتاج الى رد الثاني الى الاول وينتج الثاني عند اختلاف مقدمتيه بالسلب والايجاب والشكل الاول هو الذي جعل معيار العلوم فنورده ههنا

مطلوب وشرط انتاجه ايجاب الصغرى وكلية الكبرى فضروبه المنتجة اربعة الضرب الاول نحو
مؤلف وكل مؤلف محدث فكل جسم محدث والثانى كقولنا كل جسم مؤلف ولا شئ من المؤلف بقديم فلا شئ من الجسم
بقديم والثالث كقولنا بعض الجسم مؤلف وكل مؤلف حادث فبعض الجسم حادث والرابع كقولنا بعض الجسم مؤلف ولا شئ
من المؤلف بقديم فبعض الجسم ليس بقديم والقياس الاقترانى اما مركب من حمليتين كما مر واما من متصلتين كقولنا ان كانت
الشمس طالعة فالنهار موجود وكلما كان النهار موجودا فالارض مضيئة ينتج ان كانت الشمس طالعة فالارض مضيئة // واما
من منفصلتين كقولنا كل عدد فهو اما زوج واما فرد وكل زوج فهو اما زوج الزوج او زوج الفرد ينتج كل عدد اما فرد او زوج
الزوج او زوج الفرد واما من حملية ومتصلة كقولنا كلما كان هذا الشئ انسانا فهو حيوان وكل حيوان جسم ينتج كلما كان
هذا الشئ انسانا فهو جسم / واما من حملية ومنفصلة كقولنا كل عدد اما زوج واما فرد وكل زوج منقسم بمتساويين ينتج
كل عدد فهو اما فرد او منقسم بمتساويين واما من متصلة ومنفصلة كقولنا كلما كان هذا الشئ انسانا فهو حيوان وكل حيوان فهو
اما ابيض او اسود ينتج كلما كان هذا الشئ انسانا فهو ابيض او اسود / اما القياس الاستثنائى فالشرطية الموضوعة فيه ان كانت
متصلة فاستثناء عين المقدم ينتج عين التالى كقولنا ان كان هذا انسانا فهو حيوان لكنه انسان فيكون حيوانا واستثناء نقيض
التالى ينتج نقيض المقدم كقولنا ان كان هذا انسانا فهو حيوان لكنه ليس بحيوان ينتج انه ليس بانسان وان كانت منفصلة
فاستثناء عين احد الجزئين ينتج نقيض الآخر كقولنا هذا العدد اما ان يكون زوجا او فردا لكنه فرد فهو ليس بزوج واستثناء
احدهما ينتج عين الآخر

## البرهان

قال الشيخ الامام [illegible] قياس مؤلف من مقدمات يقينية لانتاج اليقين واما اليقينيات فستة اقسام منها اوليات كقولنا الواحد نصف الاثنين
وجعل الجنة [illegible] اعظم من الجزء ومشاهدات كقولنا الشمس مشرقة والنار محرقة ومجربات كقولنا شرب السقمونيا مسهل الصفراء وحدسيات
رسالة فى [illegible] كقولنا نور القمر مستفاد من الشمس ومتواترات كقولنا محمد عليه الصلاة والسلام ادعى النبوة واظهر المعجزة على يده
وقضايا قياساتها معها كقولنا الاربعة زوج بسبب وسط حاضر فى الذهن وهو الانقسام بمتساويين والجدل
وهو قياس مؤلف من مقدمات مشهورة والخطابة وهو قياس مؤلف من مقدمات مقبولة عن شخص معتقد فيه او
مظنونة والشعر وهو قياس مؤلف من مقدمات تنبسط منها او تنقبض والمغالطة وهو قياس مؤلف من مقدمات
كاذبة شبيهة بالحق او بالمشهورة او مركب من مقدمات وهمية كاذبة والعمدة هى البرهان وليكن هذا آخر الرسالة فى المنطق

التمام

تم بعونه سبحانه طبع هذه الحاشية المرغوبة المنسوبة الى الفاضل النحرير المولى قول احمد عليه رحمة الصمد وشرح
ايساغوجى للفاضل الفنارى افيض على مرقدهما غفران السبحانى والنوال الربانى فى زمن حامى البلاد ومكرم العباد
وملجأ العباد وخاسم عرق اهل الضلال والعناد اعنى به السلطان ابن السلطان السلطان الغازى عبد الحميد خان
صفت رياض دولته بازهار المعارف والعرفان فى مطبعة برهان افندى بالرخصة والامتياز
وقد تصادف ختام طبعها فى اواخر شوال المكرم لسنة
اثنى عشر وثلثمائة والف فى الدفعة الثانية

حرره محمد على الواصف الاسبارطه شفيق
عفى عنهما البارى

## سەرچاوەکان


١ـ قصة الحضارة، تأليف ول ديورانت، الجزء الثاني من المجلد الثاني، حياة يونان، ترجمة محمد بدران، جامعة الدول العربية.

٢ـ قصة الفلسفة اليونانية، تصنيف: أحمد أمين ـ زكي نجيب محمود ـ الطبعة السابعة ـ مطبعة التأليف والترجمة والنشر، القاهرة، ١٩٧٠.

٣ـ كێشەی بوون لە مێژووی فەلسەفەدا، بەرگی یەکەم، د. محەمەد کەمال. لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٢.

٤ـ قصة الفلسفة، ول ديورانت، مكتبة المعارف، بيروت، ١٩٧٢، ص٨٤–٨٥.

٥ـ اسطورة الادب الرفيع، الدكتور علي الوردي، منشورات سعيد جبير، الطبعة الاولى، ٢٠٠٠، ص ١٧٣–١٧٤.

٦ـ سەرەتایەك لە فەلسەفەی کلاسیکی یۆنان، حەمید عەزیز، چاپخانەی زانکۆی سلێمانی، ل٢٧٦.

٧ـ مفنى الطلاب في علم المنطق، للمؤلف العلامة محمود بن حافظ حسن المغنيني، ص٩.

٨ـ دراسات في المنطق مع نصوص مختارة، الدكتور عزمي اسلام، ١٩٨٥.

٩ـ كشف الظنون عن اسامي الكتب والفنون، للعلامة المولى مصطفى عبدالله القسطنطيني الرومي الحنفي الشهير بالملا الكاتب المعروف بحاجي خليفة، المجلد السادس.

١٠ـ الموسوعة العربية الميسرة، دار الشعب، القاهرة، الطبعة الثانية، ١٩٨٢.

١١ـ المنجد في الادب والعلوم، بيروت، الطبعة الثانية عشر، ص٥٢.

١٢ـ فجر الاسلام، احمد امين، ص١٣٢.

١٣ـ اثر الاغريقي في البلاغة العربية من حافظ الى ابن المعتز، تأليف مجيد عبدالحميد ناجي، مطبعة الآداب، النجف الاشرف، ١٩٧٦.

١٤ـ التمدن الاسلامي، جورجي زيدان.

١٥ـ ضحى الاسلام، احمد امين، ص٢٠٤-٢٠٥.

١٦ـ الانموذج في اصول الفقه، تأليف الدكتور فاضل عبدالواحد عبدالرحمان، مطبعة المعارف، بغداد، الطبعة الاولى، ١٩٦٩، ص١٠٤.

١٧ـ ابن سينا ـ تيسير شيخ الارض، دار المعارف، بيروت، ١٩٦٢.

١٨ـ ابن سينا، احمد فؤاد الاهواني، دار المعارف، مصر، ١٩٥٨.

١٩ـ جلال الدين السيوطي، صون المنطق والكلام عن فن المنطق والكلام، نشر د. علي سامي النشاء، القاهرة، ١٩٤٧.

٢٠ـ مدارس العراق قبل الاسلام، تأليف رفائيل بابو اسحق، ١٩٥١.

# ملخص البحث

## منطق الصوري لارسطو وكتاب (ايساغوجي)

حمه كريم هورامي

ذكر في هذا البحث المقدمات ومجمل الظروف التي دفعت الفيلسوف ارسطوطاليس الى وصفه لعلم يصون ذهن الانسان من الوقوع في الخطأ، سماه (أورگانون ـ المنطق) والذي سمي فيما بعد بعلم المنطق الصوري.

انتشر هذا العلم بعد الف سنة من موت ارسطو في جميع ارجاء العالم وخاصة في المدارس المسيحية والاسلامية الملحقة بالمعابد.

كما وانتشر في الشرق عن طريق كتاب يسمى (ايساغوجي) الذي وصفه (فرفريوس) الصوري باللغة السريانية وترجمه الى اللغة العربية (أثيرالدين الابهري).

يحتوي هذا الكتاب ابواباً وفصولاً من المنطق الارسطوطاليسي. والذي صار مادة دراسية اساسية في كتاتيب والحجرات الملحقة بالمساجد ومازال تدريسه جار فيهما. وإن البحث يفند رأيَ هؤلاء الذين يزعمون بأن مؤلف ايساغوجي هو اثيرالدين الأبهري لاغيره، كما ويذكر موقف علماء الدين الاسلامي حول دراسة المنطق، وينتهي القول الى الرأي الراجح المتمثل في مقولة شائقة بين دارسي المدارس الدينية الملحقة بالمساجد ألا وهو (ان كل من لم يدرس المنطق فلا ثقة بعلمه) والمقولة لابي حامد الغزالي.

# چەمك و ڕەگەزەكانی چیرۆكی منداڵان لە ئەدەبی كوردیدا (١٩٩١- ٢٠٠٥)

د. هیمداد حوسێن بەكر

رازاو رەشید صبری

## پێشـــەكی

قۆنـاغی منـداڵێتی، ناسـكترین و گـرنگترین قۆنـاغی ژیـانی ئـادەمیزادە، زۆربـەی زانایـانی دەروونناسـی و پـەروەردەیی جـەخت لەسـەر ئـەم قۆناغـە دەكەنەوە، چونكە دروستی ئەم قۆناغە بەردی بناغەی دروسـتكردنی نـەوەی دوارۆژە، هەر بۆیەش ئەمڕۆكە لە هەموو جیهاندا بایـەخێكی زۆر بـەم قۆناغـە دەدرێت.

ئـــەدەبی منـــداڵیش، یەكێكـــە لـــەو شـــێوازە گرنگانـــەی پـــەروەردە و پێگەیانـدنی منـداڵ، چـونكە لـەرێگای ئـەم ئەدەبـەوە ژیـان بـە هـەموو ڕەهەنـدەكانی رابـردوو و ئێسـتا و داهـاتوو دەبەسـترێتەوە. منـداڵ لـە نـاو ئەدەبـدا ژیانـە فانتازیەكـەی خـۆی دەدۆزێتـەوە، لـەناو ئەدەبـدا هەسـت و تێگەیشتن و پەیبردنی زیاتر دەبێت. بۆیە هـەر میللـەتێك گرنگـی بـەم بـوارە نەدا یان لەنرخی كەم بكاتـەوە، رابـردووی خـۆی لـەیاد دەكات و داهـاتووی خۆی دەشێوێنێت.

وەنەبێت ئەدەبی منداڵان بەگێڕانەوەی یەك دوو چیرۆکی بەرئاگردان تەواو بێت، بەڵکو نووسین و داهێنانی ئەم ئەدەبە هونەر و تەکنیکی ئەوتۆی دەوێت، کە هیچی لە هی گەوران کەمتر نییە، منداڵ ڕۆبۆتێکی پرۆگرامکراو نیە هەرچی تۆ بتەوێت بۆی بگێڕیتەوە بێ گوێدانە هەست و نەستی، بەڵکو منداڵیش جیهانێکی پڕ لە سۆزو ئەندێشەو تێڕامانە، دەستکاری کردنی ئەم هەستانە یان بەهەڵە مامەڵەکردن لەگەڵیاندا، شێواندنی منداڵە.

## هۆی هەڵبژاردنی ئەو بابەتە و کات و شوێنی

بێگومان بواری ئەدەبی منداڵان بەرفراوانە، بەلام (چیرۆك) گرنگترین و کاریگەرترین جۆری ئەدەبە لەجیهانی پڕ لە سەراسیمەی منداڵاندا، هەروەك شارەزا و لێکۆڵەرانی ئەم بوارە وای بۆدەچن. لە نێو ئەدەبیاتی کوردیشدا لێکۆڵینەوە و توێژینەوە لەم رووەوە یەکجار کەمە و، کتێبخانەی منداڵانمان لەم بوارەدا هەژارە، لەلایەکی تریشەوە ویستی خۆمان لە چوونە نێو جیهانی منداڵان و ئەدەبەکەیان هۆیەکی تری هەڵبژاردنی ئەم بابەتە بوو، بۆیە بڕیارماندا ئەم توێژینەوەیە ئەنجام بدەین.

دەستنیشانکردنی کات و شوێنی لێکۆڵینەوەکەش، لەلایەکدا بەمەبەستی دەستنیشانکردنی سنووری باسەکە ئەنجامدراوە، تائێستاش لێکۆڵینەوەیەکی ئەکادیمی و زانستی ورد و فراوانی لەبارەوە ئەنجام نەدراوە، لەکاتێکدا ئەو ماوەیە گرنگی تایبەتی خۆی هەیە لە پەرەسەندنی چیرۆکی منداڵان و، پێویستی بە لێکۆڵینەوە هەیە. لەلایەکی تریشدا لەبەر هۆی گۆڕانی باری سیاسی، ڕۆشنبیری، ئابووری، کۆمەڵایەتی ...تاد، لەو

ماوەیەدا، کە بوونە مایەی دروستکردن و جیاکردنەوەی ئەم قۆناغە لەگەڵ قۆناغەکانی پێش خۆی تارادەیەك.

## سنوور و ئامانجی لێکۆڵینەوەکە

ئامانجمان لەم لێکۆڵینەوەیەدا ئەوە بوو:

باسکردنێکی گشتی چیرۆکی منداڵانە لە ڕووی شێوەو ناوەڕۆکەوە، دەستنیشانکردنی گرنگترین ئەو رەگەزو بنەمایانەیە، کە چیرۆکی منداڵان لە سەریاندا بناغە دەگرێت و، پێویستە لەسەر چیرۆکنووس لەکاتی نووسینی چیرۆکەکەیدا رەچاویان بکات، لەگەڵ بایەخدان و رەچاوکردنی ئەو هونەرە تەکنیکییانەی، کە دەبێت لە کتێب و نامیلکەی چیرۆکی منداڵاندا هەبێت، بۆیە لەم لێکۆڵینەوەیەدا تەنها نموونەی ئەو چیرۆکانەمان وەرگرتووە کەوا بەشێوەی نامیلکە و کتێب لە دوای راپەڕینی (١٩٩١ – ٢٠٠٥ ) دا بڵاوکراونەتەوە و بەچاپ گەیێنراون، هەروەها دەرخستنی لایەنی چاکی و کەموکورتیان و چۆنیەتی دارشتنیان لەلایەن چیرۆکنووسانی کوردەوە، هەروا رادەی پەرەسەندن و پێشکەوتنی رەوتی چیرۆکی منداڵان لەماوەی ( ١٩٩١– ٢٠٠٥) دا.

## گرفتەکانی لێکۆڵینەوەکە

لەبەر ئەوەی ئەم جۆرە ئەدەبە دەتوانین بڵێین تارادەیەك بابەتێکی تازەیە نەك هەر لە نێو ئەدەبیاتی کوردی، بەڵکو لە ئەدەبی عەرەبیشدا، بۆیە کەمی سەرچاوەی زانستی و کەمی لێکۆڵینەوە لەم بوارەدا، کە بە فراوانی

هەموو لایەنەکانی  چیرۆکی منـدالأنی گرتبێتـە خـۆی، یـەکێك بـوو لـەو گرفتـە سەرەکییانەی  هاتنە رێگامان.

## پرۆگرامی لێکۆڵینەوەکە

پلانی باسەکەمان بەم شێوەیەی خوارەوە  لـە سـێ بـەش و پێشـەکییەك پێکهاتووە:

لـە پێشـەکیدا: هـۆی هەڵبـژاردنی ئـەم بابەتـەو کـات و شـوێنی روون کراوەتەوە، لەگەڵ تیشك خسـتنە سـەر ئامـانج و سـنووری لێکۆلینەوەکـە و، ئەو گرفتانەی کە لەمیانەی ئەنجامدانی لکۆڵینەوەکەدا هاتوونەتە پێشەوە.

**لە باسی یەکەمدا:** باسمان لە چەمکی چـیرۆکی منـدالأن کـردووە، لەگـەڵ گرنگترین ئەو رەگەزو بنەمایانەی، کە پێویسـتە بـەپێی قۆناغـەکانی تەمـەنی منداڵ لەم جۆرەی ئەدەبدا  رەچاوبکرێن، هاوکات لە گەڵیاندا لەژێر رۆشـنایی ئـەم رەگەزانـە، چـەند نموونەیـەکی چـیرۆکیمان لـە ئـەدەبی کـوردی لـەدوای راپـــەڕینی (١٩٩١–٢٠٠٥) هێناوەتـــەوە و بـــەپێی ئـــەو رەگـــەز و بنەمایانـــە رەچاومان کردوون.

**لە باسی دووەمیشدا:** باسمـان لـە جۆرەکـانی چـیرۆکی منـدالأن کـردووە لەڕووی ناوەرۆکەوە، هەوڵمانداوە، لە هەر جۆرێـك نموونەیـەکی کـوردی دوای راپەڕین وەربگرین.

## چەمکی چیرۆکی منداڵان

ئاشکرایە چیرۆك شـوێنێکی بـەرزی لـە نێـو هونـەرەکانی ئەدەبـدا هەیـە، ئەدەبی هـەر نەتەوەیـەك بخوێنیتـەوە و لـە هـەر قۆنـاغ و مێژووییێکـدا، بـۆت دەردەکەوێ کەوا چیرۆك تا چ رادەیەك بایەخ و گرنگی خۆی نواندووە و بۆتـە

جێگەی بایەخدانی هەموو نەتەوەیەك لە گشت قۆناغەكانی ژیاندا، كەواتە چیرۆك ئامادەیی خۆی هەبووە لە كۆندا بە گشتی، ئەمڕۆش لە ئەدەبی نوێدا، شوێنێكی گەورەو بەرزی داگیر كردووە. سەبارەت بە منداڵانیش، زۆربەی شارەزایانی ئەم بوارە بۆ ئەوە دەچن، چیرۆك لە هەموو جۆرەكانی تری ئەدەب خۆشەویستتر و بەربلاوترە، لەگەڵ ئەم هەموو گرنگی و بایەخەش كە هەیەتی، ساكارترین جۆری ئەدەبە لای منداڵ، لە هەمووشیان زیاتر چێژ بە منداڵ دەگەینێت.

دەتوانین چەمكی چیرۆكی منداڵان لەم چەند پەیڤانەی خوارەوەدا ئاشكرا بكەین:

چیرۆكی منداڵان : "*نووسینێكە بۆ منداڵ بە شێوەی پەخشان، بە مەبەستی گەیاندنی خۆش گوزەرانی و رۆشنبیر كردنی. واتە گێڕانەوەی چەند رووداوێكە كە بەسەر چەند كەسێكی دیاریكراودا دێن و تێدەپەڕن، لە كات و شوێنێكی دیاریكراودا. كەسایەتییەكانیش ڕەنگە ئادەمیزاد یان ئەفسانەیی بن، یاخود سەر بە جیهانی گیانداران یانیش بێ گیانان بن، ئەمانەش گشتی بە مەبەستی دروستكردنی كەسایەتیێكی رێك و پێك و جوانە بۆ منداڵ*" [1].

هەرچەندە ئامانج و مەبەستی چیرۆكی منداڵان لەلای نووسەراندا جیاوازی هەیە، بەڵام گشتیان لەوەدا كۆكن كە چیرۆكی سەركەوتووی منداڵان بە شێوەیەكی گشتی دوو ئامانجی هەیە :

یەكەمیان، شارەزایی پێدانە لە گشت بوارەكانی ژیان و زۆركردنی زانیارییە. دووەمیشیان، كات بەسەر بردن و خۆش گوزەرانییە.

---

[1] محمد عبدالرزاق ابراهيم ويح وآخرون، ثقافة الطفل، ص٣٣٢.

لـە کۆنیشـدا "*هەقایـەت لەلایێکـەوە، شـێوازێکی کـات رابـواردن بـوو لەلایەکی تر تۆمارێکی سەرگوزشتەکانی مرۆڤ و خەباتی نەپساوەی بوو لـە ژیاندا، ئەم دوو سـیفەتەش لەگـەڵ شـێوازەکانی هونـەری چـیرۆك بـوون بـە هەموو شێوازەکانی بە درێژایی چاخەکان لە سەردەمی نوێشدا، ناکرێ بڵێین چیرۆك وازی لەم دوو سیفەتە هێناوە، تـا ئێسـتاش خـەڵك چاوەڕێ دەکـەن چیرۆك لە پاڵ چێژ وەرگـرتن، شـارەزاییان پـێ ببەخشـێت. زۆر دەگمـەنیش چیرۆکێك جێگای رێز و پلە دانانە گەر ئەم دوو ئەرکە بە جێ نەهێنێت.*"[٢] .

سەبارەت بە ئامانجی یەکەم، زۆر کردنی زانیاری و شارەزایی لە سەرێکدا هەردوو لایـەنی زمانـەوانی و کۆمەڵایـەتی دەگرێتـەوە، چـونکە خوێندنـەوەی منـداڵ بـۆ ئـەم جـۆرە ئەدەبـە شـێوازێکی گرنگـی وەرگرتنـی زانیـاری و پەرەسـەندنی تواناکـانی منداڵـە، چـیرۆك وا لـە منـداڵ دەکـات، هەگبـەی وشەکانی زمانی زیاد دەکات و یارمەتی دەدات بـۆ گەشـەکردنی دەربـڕین لـە کاتی قسەکردن لەگەڵ دەوروبەری. هەروەها یارمەتی دەدات کە بیرۆکەیەکی دروست لەسەر ماناکانی خێر و شەڕ و چاکە و خراپـە پەیـدا بکـات، ئەمـەش زیاتر لە میانەی گوێگرتنی بۆ چیرۆکە پەروەدەییـەکان. لەلایـەکی تریشـەوە چیرۆکی سـەرکەوتووی منـداڵان کارگەرییـەکی گـەورەی لەسـەر گەشـەکردنی لایەنی پەروەردەیی و رۆشـنبیری منداڵانـدا هەیـە. چـونکە چـیرۆکی منـداڵان لەگەڵ ئەوەی زادەی خەیاڵێکی بـەرز و بـیر و لـێ وردبوونەوەیـەکی فراوانـە، چەندین زانیاری جۆراوجۆریشی لە بارەی مێژوو، ئایین، زانسـتی، جـوگرافی، هونەری، ئەدەبی، دەروونی،..هتد، لەخۆ گرتووە، بۆیـە دەتوانێـت بـە هـۆی

[٢] د.عزالدين اسماعيل، التفسير النفسي للادب، ص١٩٩.

ئـەو فـەنتازیا و خەیاڵـەی کـە هەیـەتی دەروونـی منـداڵ تێـر بکـات. چـونکە سروشـتی منـداڵ وا خولقـاوە، ئـارەزووی خـەیاڵکردنی زۆرە و پێویسـتی بـە ئەندێشەیە. لە ناو ئەمانەشدا کە باسکران چـیرۆك ڕۆڵـی گـرنگ دەگێڕێـت لـە پەروەردەی کۆمەڵایـەتی منـداڵ و دروسـت کردنـی کەسـایەتییێکی دروسـت و جـوان کـە قـابیلی شـانازی پێکردنـی کۆمـەڵ بێـت و، توانـای خۆگونجانـدنی هـەبێت لەگـەڵ دەوروبـەردا. چـونکە چـیرۆك وێنەیـەکی راسـتگۆیانەی ژیـانی ناوەوە و دەرەوەیە، کە ئامانجی چارەسـەرکردنی ئـەو گـیر و گرفتانەیـە کـە ڕووبەڕووی تاك و کۆمەڵ دەبنـەوە، پێداویسـتی و ئارەزووەکانیـان جێبـەجێ دەکـات، توانـای عـەقڵی و هزرییـان گەشـە پێـدەکات و لـە کۆتاییشـدا کەسایەتییێکی وامان بۆ بونیات دەنێت، کە توانای هەست بە لێپرسـینەوەیان هەبێت بەرامبەر کۆمەڵ و وڵات و هەست بە ئەرکی مرۆڤایەتی بکەن و لە داب و نەریتە باوەکانی کۆمەڵ لانەدەن. لە سەرووی هەمووشیانەوە بـڕوای پشـت بە خۆبەستنیان گەشە دەکات. دەتوانین بڵێین ئەمانەش گشتیان لـە میانـەی ئەو گفتوگۆ و پرسیار و وەڵامدانەوەیە کە لە نێوان منـداڵان و هەقایـەتخوانان لە کۆتایی چیرۆکەکەدا دروست دەبێت[٣].

مەبەست لە ئامانجی دووەمیش، کاری چیرۆك بۆ منالّ بێـت یـان گـەورە، پێویستە لە تەکنیکدا پشت بە رەگەزی خۆشی و لا خۆشکردن ببەستێت، بـە مانایەکی تر لە رێگەی ئەو رەگەزەوە خوێنەر یـان گـوێگری منـداڵ دەتـوانێ چێژی تەواو لە چیرۆك ببینێت، ئەو رەگەزانەش کە ئـەم خۆشـگوزەرانییە لـە

[٣] شـجاع العـانی، قصـص الاطفـال، مجلـة الاقـلام، ع (٣)، بغـداد،١٩٧٩، ص٥-٦. هـەروەها: مصطفى بدران وآخرون، الوسائل التعليمية ، ١٩٥٩، ص ٤٥.

لای منداڵاندا دروست دەکەن لە چەند شتێکی وەك (چۆنیەتی بەکارهێنانی کەسایەتییەکان، گرێچن، بابەت یان بیرۆکەکە و چەندانێکی تردا) خۆی دەبینێتەوە، بۆ نموونە پەنابردنی چیرۆکنووسی منداڵان بۆ چەند کەسایەتێکی جۆراوجۆر و گونجاو لەگەڵ قۆناغی تەمەنی منداڵ، لە مرۆڤ، ئاژەڵ، رووەك، یان هەموو ئەو کەسایەتیانەی، کە لە جیهانی منداڵاندا خۆشەویستن، تەنانەت هەندێ جار کەسایەتییە ئەفسانەییەکانیش، چونکە زۆر جار منداڵان ئارەزووی چیرۆکە ترسێنەرەکان دەکەن و چێژیان لێ دەبینن، ئەمەش ڕەنگە بۆ بەرجەستەکردنی ئەو ترس و دوودڵیە بێت کە لە ناخیاندایە، وەك هەوڵێکە بۆ زاڵبوون بەسەریاندا، جگە لەوەش چیرۆکی منداڵان زۆربەی پێداویستییەکانی منداڵان لە ڕووی سایکۆلۆژی و کۆمەڵناسییەوە دابین دەکات، وەك خەونێك وایە بۆ منداڵ و چەند بابەت و بیرۆکەیەکیان بۆ دەورووژێنێت کە لە سروشتی واقیعی ئەواندایە، ئەو هاوسەنگییە دەگەڕێنێتەوە، کە منداڵان لە ژیانی رۆژانەیاندا لە دەستی دەدەن، بۆیە چیرۆك دەرگایەك لەبەردەم منداڵاندا دەکاتەوە، کە رووداو و وێنە و شتی سەیری ئەوتۆیان لێوە دیار بێ کە لە مەڵبەندەکەی خۆیدا نییە، کەواتە چیرۆك سەرچاوەیەکی تێر کردنی ئارەزووی ئاگاداری و فێر بوون و شت زانینی منداڵە بۆ دۆزینەوەی ئەو شتانەی کە حەزی پێدەکات، یا خەیاڵی دەبزوێنێ، یا لە مەڵبەندە تەسکەکەی خۆیدا بێگانەیە. هەروەها ئارەزووی منداڵ لە خەیاڵ و پێشبینی کردندا خاڵێکی ترە کە وای لە منداڵ کردووە چێژ و خۆشی لە چیرۆك وەربگرێت، چونکە منداڵ لە چیرۆکدا

بوارێکی فراوانی بۆ هەڵدەکەوێت، تا خەیاڵە خۆشەکانی خۆی تێدا پەل بهاوێژێ و دنیای بەر چاو بە خەیاڵ برازێنێتەوە[٤].

دەتوانین ئەم مەبەستانەی چەمکی چیرۆکی منداڵان لەم پێناسەیەی خوارەوەدا بەرجەستە بکەین:

**چیرۆکی منداڵان** :هونەرێکی جوانە، دەکرێت ئەدەبی منداڵانی سەرکەوتوو، لە رێگەیەوە ئامانجە فرەخاسەکانی بهێنێتە دی، بە چەند رێگەیەکی ناڕاستەوخۆ، منداڵان لە چێژوەرگرتن بێبەش نەکات. هەروەها نابێت چیرۆك لە کۆمەڵێك زانیاری و ئامۆژگاری رێنماییکەر خۆی بەرجەستە بکات، لە هەمان کاتیشدا لە میانەی رووداو و هەڵوێست و کارەکتەرەکان بیرو بۆچوونە نەتەوایەتییەکان پێشکەش بکات، دەبێ بۆچوونە مەبەستدارەکان لە چیرۆکدا بەشدار بن لە بنیاتنانی کەسایەتی نەوەی نوێ[٥].

## رەگەزەکانی چیرۆکی منداڵان

بێگومان چیرۆك خاوەن ڕوخسارێکی هونەری و ناوەڕۆکێکی تایبەتی خۆیەتی، بینای هونەری چیرۆك بە بێ ئەم دوو لایەنە، یاخود باشتروایە بڵێین بە بێ یەکێك لەم دووانە لەنگی بەخۆیەوە دەبینێ. کەواتە ***"بەرهەمی ئەدەبی لە دوو بەشی بنچینەیی پێکهاتووە، یەکەم ناوەرۆك، کە ئەو بابەتەیە کە دەقە ئەدەبییەکە باس دەکات یان دەخاتە روو، دووەم شێوەی هونەری***

---

[٤] د.فاضل مجید محمود، قایلکاری لە چیرۆکی منداڵان، گ. زانکۆی سلێمانی، ژ (١٤)، حوزەیرانی ٢٠٠٤، ل١١٢–١١٣. هەروا: محمد رشید فتاح، ئەدەبی منداڵان و نموونە... ل٢٥.

[٥] محمد محمود رضوان وآخرون، أدب الاطفال – مبادؤه ومقوماته الاساسية، ص ٢٧.

***کـە وەك چوارچـێوەیەك نـاوەڕۆك دەگرێتــە بـاوەش و نرخــی هونــەری بــەو چەشنە یان بەو توخمە دەدات"***[٦].

ئەوەی پێویستە بوترێت ئەوەیە، هەر نووسەرێك یاخود چیرۆكنووسێك لە كـاتی نووسـینی بەرهەمەكەیـدا دەبـێ رەچـاوی ئـەم دوو لایەنـە بكـات و، یەكێكیان نەكاتە قوربانی ئـەوەی تریـان. ئەمـەش لـە پێنـاو ئـەوەی بتـوانێ بەرهــەمێك لــە قــاڵبێكی ئــەدەب و هونــەری جـوان و چـێژدار پێشـكەش بــە خوێنەران بكات. سەبارەت بە رەخنەگران و لێكۆڵەرانی ئەدەبیش بـە هـەمان شـێوە، بـۆ ئـەوەی بتـوانن بەرهـەمێكی ئـەدەبی بـە شـێوازێكی دروسـت و زانسـتییانە هەڵبسـەنگێنن و باسـی لێـوە بكـەن، دەبـێ نـاوەڕۆك و شـێوەی هونەری پێكەوە بكەن بە پێوەر بۆ هەڵسەنگاندنەكانیان. ئەگەر چـی هەنـدێ جار دەبینین لێكۆڵەرانی بواری چیرۆك، پێ تەنها لەسەر لایەنێك دادەگرن بـۆ هەڵسەنگاندنی چیرۆكەكانیان و، لایەنەكەی تر فەرامۆش دەكەن، بـۆ نموونـە زیـاتر بایـەخ بـە نـاوەڕۆك دەدەن و ئـەو بابەتانـەش كـە روخسـاری هونـەری چیرۆكەكان دەنوێنن بەلاوەی دەنێن. راستە ناوەڕۆك گرنگی تایبەتی هەیە لە چیرۆكدا، وەك ئاوێنەیە كە گوزارشت لە راستییەكانی تاك و كۆمـەڵ دەكـات، رەنگدانەوەی ڕووداوەكانی واقیع سەرووی واقیعە، تەنانەت زۆر جار شتەكانی ناوەوەی مرۆڤیش بـاس دەكـات و رەنگـە خوێنـەر خـەون و خـەیاڵاتی خـۆی تێدابیینێتـەوە "***بـەڵام لـە پـاڵ ئـەم هـەموو بایـەخ و گرنگییـەی نـاوەڕۆك دەینوێنێت، ناتوانێ ببێتە تاكە پێوەری هەڵسەنگاندنی كارە ئەدەبییـەكان، بەڵكو چۆنیەتی بەكارهێنان و لێكدانی ئەو بنەما هونەرییانـەی كـە ئـەنجامی***

---

[٦] اسماعیل رەسول، چەند بابەتێك دەربارەی ئەدەب، ١٩٨١، ل٣٣.

*کارلەیەك کـردن بـە هـۆی ئـەو پەیوەندییانـەی یاسا خۆییـەکان بـەڕێوەیان دەبەن و یەکیان دەخەن و دانەیەکی یەکگرتوویان لێ پێك دێنن ئینجا لە پاڵ ناوەرۆکێکی گونجاودا، ئەمانە پێویستە بکرێنە پێوەری هەڵسەنگاندن"*[۷].

ئەمەش ئـەوا دەسـەلمێنێت لـە چـیرۆکدا یـان هـەر دەقێکـی ئـەدەبی کـە شایەنی ئەوە بێت ناوی ئەدەبی لێ بنێین، ناوەڕۆك هەر چەند بەهایەکی زۆری هەبێت، ئەگەر نەخرێتە قالبێکی ئەدەبی و هونەری جوان، ناتوانێـت بەتـەنیا نرخـی ئێسـتاتیکا بـە بەرهەمـە ئەدەبییەکـە ببەخشـێت، چـونکی نووسـەر بێژەرێکی نێو کەناڵەکانی رادیۆ و تەلەفزیۆن نییـە هـەواڵ بگـەیێنێت، بـەڵکو کەسـێکە ئـەوەی کـە دەیـەوێت بیڵێـت بـە شـێوازێکی جـوانی ئێسـتاتیکانە دەخاتە نێو روخسارێکی هونەری و رواڵـەتێکی جـوانی پـێ دەبەخشـێت، بـۆ ئەوەی بتوانێ چێژ بە بەرامبەرەکەی بگەیەنێت، لـەو کاتەشـدا بەرهەمەکـەی ناوی لێ دەنرێت ئەدەب و خۆیشی ئەدیب.

چیرۆکی منداڵانیش هەروەك چیرۆکی گەوران، لـەو شـتانەی کـە باسـکران خاڵی نین و، خاوەن روخسارێکی هونەری و ناوەڕۆکێکی تایبەتی خۆیانن،کـە بە فەرامۆش کردنی لایەنێکیان ئەوی تر ناتەواو دەبێت و لە جـوغزی ئـەدەب دێتە دەرەوە. بۆیـە ئێمـە کـە لێکۆڵینـەوە لەسـەر چـیرۆکی منـداڵان ئـەنجام بدەین دەبێ بە پێی ناوەڕۆکەکە و، ئەو رەگەزانەی کـە لـە نێـو چـیرۆکەکەدا بەدی دەکرێن وەکـو چـەند بنەمایـەکی هونـەری، بـاس لـە چـیرۆکی منـداڵان بکەین و هەڵیانبسەنگێنین.

---

[۷] پـەرێز صـابر محمـد، بینـای هونـەری چـیرۆکی کـوردی لەسـەرەتاوە تـاکو کۆتـایی جـەنگی دووەمی جیهانی، ل ٧٤.

*"شتێکی هەڵەشە کەسێك بیر بکاتەوە کە ئـەدەبی منـداڵان ماددەیەکـە دابڕاوە لە ئەدەبی گەوران، یاخود ئەدەبێکە بە شێوەیەکی گۆشەگیر گەشەی کردووە و جیا بۆتەوە لـە ئـەدەبی گـەوران. هـەر چـەند ئەگـەر نووسـەرکـە پەیوەستیش بێت بە گیروگرفتە کۆمەڵایەتییەکان، یاخود سەرچڵییەکان، یان زانیارییەکان، یاخود خۆشەویستی نیشتیمان ئایین... تاد، هەمان ئەو بنەماو پێوەرانـەی، کـە ئـەدەبی گـەورانی پـێ هەڵدەسـەنگێنرێت، دەتـوانین بیانسـەپێنینە سـەر ئـەدەبی منـداڵانیش و بەرهەمـە ئەدەبییـەکانی پـێ هەڵبسەنگێنین"*[8].

لـە گـرنکترین ئـەو رەگەزانـەش، کـە وەك چـەند بنەمایـەکی شـێوە و ڕوخسـارێکی هونـەری بـە چـیرۆکی منـداڵان دەبەخشـن، بـریتین لەمانـەی خوارەوە :

## ١- بابەت یان بیرۆکە Theme

کە یەکێك گوێبیستی چیرۆکێك دەبێت، ئەگەر لە بارەی چیرۆکەکەوە لێی بپرسین، پێش هەموو شتێك رەنگە بڵێین، چیرۆکەکە لەسەر چـی بـوو؟ بۆیـە هـەموو چـیرۆکێك بـە دەوری بابەتێکـدا دەخولێتـەوە، دانەرەکـەی تیایـدا مەبەستی دەرخستنی ئامانجێکە.

بابەت *"بریتییە لەو بیرۆکەیـە کـە چیرۆکنووسـەکە دەیـەوێ لـە کـارێکی هونەری جواندا بۆ منـداڵانی بخاتـە ڕوو، بابەتەکـە دەکاتـە هـەوێن و لەگـەڵ*

[8] علي الحديدی، في أدب الاطفال، مكتبة الانجلو المصرية، القاهرة، ١٩٨٢، ص ٦٥.

*رەگەز و پایەکانی تری چیرۆکدا، بەسەر هەموویانەوە (زمان) دەقێکی هونەری رەنگینیان لێ دروست دەکات*"[9].

ئەو بیرۆکەیەش کە چیرۆکنووسی منداڵان دەیخاتە ڕوو، کە بابەتی سەرەکی چیرۆکەکەیە، دەبێت لەگەڵ چێژو حەوسەڵەی منداڵاندا بگونجێت و، سەرنجی منداڵان بۆ لای چیرۆکەکە رابکێشێت و سوود بەخش بێت، لەسەر بنەمایەکی راستی، دادپەروەری، دەست پاکی، خاوێنی، رەوشت بەرزی، رەفتاری چاك، بەها مرۆڤایەتییەکان دامەزرابێت، کە باوەڕی منداڵ بەم بەهایانە سەقامگیر دەبن، لە سەرووی هەمووشیانەوە لەسەر بنەمایەکی ئەدەبی دامەزرابێت. بەڵام نابێت بیرۆکەکە شێوازی ئامۆژگاری و رێنمایی بگرێتە بەر، نەوەك بنەما هونەرییەکەی و ئامانجەکەی لە دەست بدات. بۆیە بابەتی باش و نایاب ئەو بابەتەیە کە زیندوویی و راستگۆیی پێشکەش بکات و لە واقیعەوە نزیك بێت، وەك ئەوەی راستییە زانستیی و مێژوویی و کۆمەڵایەتییەکان بدۆزێتەوە، واتە رووداوەکانی چەند راستییەك بنوێنن، کە شایەنی نەمرین و پەیام ببەخشنە هەستی ناوەوەی مرۆڤ ئەم جۆرە بابەتانەش یارمەتی منداڵان دەدەن بەشداری لە سۆز و هەستی مەسەلە گەورەکانی مرۆڤدا بکەن، بەرێزیشەوە تەماشای بەهای ژیانی مرۆڤ بکەن و، نرخ و بەهای ژیانی ئاژەڵ و رووەکەکانیش بزانن و فێر ببن[10].

ئەو ڕاستگۆیییەش کە دەبێ لە بابەت و بیرۆکەکاندا هەبێت، تەنها لە واقیع وەدەست نایێت، بەڵکو "*راستگۆیی لە جیهانی منداڵان و جیهانی ئەندێشە و*

---

[9] حەمە کەریم هەورامی، ئەدەبی منداڵانی کورد، ل٧٧.

[10] الدکتور عبدالفتاح ابو المعال، أدب الاطفال، ص٤٠.

***خەیاڵ بوونی هەیە، تەنانەت لە جیهانی قۆشمەبازی (الفكاهة) و خورافیات و هەقایەتی جنۆکان، هەروەها لە چیرۆکی گیانداران و سەرچڵییەکانی پاڵەوانان و، شاعیری ئەفسانە کۆنەکان و، هەقایەتە میللییەکانیشدا هەیە، هەروەها ڕاستگۆیی لە دڵ و دەروونی مرۆڤدا هەیە، لە کارگە و کێڵگە و دارستانەکانیشدا هەیە."***[11].

کەواتە گرنگترین ئەو سیمایانەی کە دەبێ لە بابەتدا هەبێت:

ـ بابەتەکە یان بیرۆکەکە ئامانج و مەبەستێك بگەیەنێت، ئامانجەکەش روون و ئاشکرا بێت و ئاڵۆز نەبێت.

ـ لە هەر چیرۆکێکدا تەنها یەك بیرۆکە بخرێتەڕوو، ***کە بیرۆکەکان زۆر بوون، بیرۆکە سەرەکییەکە گرنگی کەم دەبێتەوە.***

ـ بابەتەکە بە هێز و سوودبەخش بێت، شایەنی ئەوە بێت پێشکەشی منداڵان بکرێت، لە سەرووی هەمووشیانەوە راستگۆیی بنوێنێت.

ـ بیرۆکەکە لەگەڵ قۆناغەکانی گەشەکردنی تەمەنی منداڵدا بگونجێت.

ـ بابەتەکە یان ناوەڕۆکەکە لەگەڵ رەگەزەکانی تری نێو چیرۆکەکە هاوتا بێت و، هەماهەنگی پێك بهێنێت و، لەکارێکی هونەری جواندا بخرێتەڕوو.

## سەرچاوەکانی بابەت

بێگومان ئەو بابەتانەی کە چیرۆکنووس لە چیرۆکەکەدا بە کاریان دەهێنێت، دەبێ لە سەرچاوەیەکەوە هەڵقوڵابن. چیرۆکنووسیش پەنا بۆ ئەو سەرچاوانە دەبات کە منداڵ بابەتی بیرو خەیاڵی خۆی لێ هەڵدەبژێرێت، بۆیە

---

[11] علي الحديدي، الادب وبناء الأنسان، ص١٢٠.

چیرۆکنووس بۆ هەڵبـژاردنی تیمـەکان دەبێـت ڕەچـاوی قۆناغـەکانی تەمـەنی منداڵ بکات، شارەزایی لە هەموو قۆناغەکاندا هەبێت و بزانێت بۆ منداڵی کـام قۆنـاغ دەنووسـێت. چـونکی منـداڵان لـە هـەر قۆنـاغێکی تەمەنیانـدا جـۆرە بیرکردنەوەیەك و حەز و ئارەزووێکی تایبەتییان هەیە، بۆیـە پێویسـتییان بـە جۆرە ئەدەبێکی تایبەتی هەیە.

منداڵانی تەمەن (٣-٦) ساڵان بەوە ناسراون، کـە ئەندێشـە و بیریـان زۆر تیـژە، لـەو شـوێنەوارەی تیایـدا دەژی دەرناچـێ، بـۆ نموونـە منـداڵانی ئـەو تەمەنـە زۆر جـار کـە یـاری دەکـەن لەبـەر خۆیانـدا و لەگـەڵ کەلوپەلـەکانی دەوروبەریان دەست دەکەن بە گفتوگۆ و قسە کردن، دەکەونە ئەندێشـەیەکی قووڵەوە، بۆ نموونە قابڵەمەیەك دێنن و دەیکەن بە سووکانی ئۆتۆمبیلەکانیان لێی دەخوڕن، یاخود وایان بە خەیاڵدا دێت، بووکە شووشەکەی مرۆڤێکە یـان گیاندارێکـە قسـەی لەگەڵـدا دەکـات، لێـی تـووڕە دەبێـت، لێـی دەدات، دەیلاوێنێتەوە و ژیری دەکاتەوە، بۆیـە دەبـێ چـیرۆکنووس سـەرنجی ژیـانی منـداڵ و جیهانەکـەی بـدات و بابـەتی چـیرۆکەکەی لـە واقیعـی ئەوانـەوە هەڵبژێرێت. منداڵ لەو تەمەنەدا بێزار دەبێت لەو چیرۆکانەی کە باسی جنۆکە و خێـو و ئەفسـوونبازی و تاوانبـاری و تـرس و تـۆق و توندوتیـژی دەکـەن، چـونکە ئـەم چـیرۆکانە بیرێکـی ترسـناك لـەلای منـداڵان بـە جـێ دێڵـن و کـار دەکەنە سەر کەسایەتییەکەی و دواییش منداڵێکی ترسنۆکیان لێ دەردەچێت. چیرۆکەکانی ئەم قۆناغە دەبێ پڕ بن لە بابـەتی خۆشەویسـتی، پێکـەنیناوی، ڕەوشت بەرزی، ئارامگرتن، یارمەتیدانی یەکتری، چالاکی، زیرەکی ...تاد.

کەواتە چیرۆکنووسی منداڵان یەکێك لەو سەرچـاوانەی کـە بابەتەکـەی لێ وەردەگرێـت بریتییـە لـە (ئەندێشـە و جیهـانی پـڕ لـە ئـەزموونی منـداڵ).

چـیرۆکنووس دەبـێ بابـەتێك هەڵبـژێرێت لـە چوارچـێوەی شـارەزایی و تێگەیشتنی منداڵان بێت، واتە دەبێ سوود لە خەیاڵی منداڵانـەوە وەربگرێت و دوور بکەوێتەوە لـە خـەیاڵی خـۆی و ئـەو شـتانەی کـە خـۆی هەسـتی پـێ دەکات، ئەو ئەندێشەیەش کە منداڵ تیایدا نقوم دەبێت هیچی لە واقیع بەدەر نییە. بەڵگەشمان بۆ ئەمە " *ئایا دەکرێت وێنـە خەیاڵییـەکانی بـیرو مێشـکی مرۆڤێکی بینەر بە هەمان شێوەی خەیاڵ و بـیرو مێشـکی کەسـێکی هـەر لـە سەرەتاوە لـەزگماکی نابینابێـت وەکـو یـەك بـن؟ بێگومـان نـەخێر. کەواتـە خەیاڵ و گەشەکردنی دەرەنجامی ئەزموونی ژیانە و هیچ کاتێکیش خەیاڵ لە رووی وێناندنـەوە لـە سـەرووی ڕواڵەتـە (واقیعـی)یەکانـەوە دەرناچـێ، لـەم رووەوە مـارکس گوتوویـەتی: کاتێـك ئـادەمیزاد هەنـدێك شـت لـە خەیاڵیـدا پـەروەردە دەکـات وادەزانـێ لـە سـەرووی رواڵەتـەکانی واقیعـدان. ئـەوە لەراستیدا جگە لە رێکخستنەوەی بەشەکانی واقیع هیچ کارێکی تری ئـەنجام نەداوە.* "[12].

سەرچـاوەیەکی تـر لـەو سەرچـاوانەی کـە چـیرۆکنووس بابـەتی لێ هەڵدەهێنجێ، بریتییـە لـە (هەقایـەت و بابەتـە فۆلکلۆرییـەکان). نووسـەری چـیرۆکی منـداڵان زۆر جـار دەتوانێـت فۆلکلـۆر و هەقایـەتی میللـی و ئەفسانەییەکان وەك سەرچاوەیەك بۆ بابەت و رووداوەکانی بـە کـار بهێنێـت، بەڵام دەبێ رەچاوی ئەو تایبەتمەندییانە بکات کە دەبێ لە ئەدەبی منداڵانـدا هەبێت. منـداڵ لـە تەمـەنی (٦–٨) سـاڵان هـەر چـەندە زیـاتر بـەرەو واقیـع

---

[12] نزار حەمید حنا، منداڵ و خـەیاڵ، رۆژنامـەی رێگـای کوردسـتان، ژ (٢٦٧)، ١٩٩٧/٩/١٠ ساڵی٥٣، ل ٤.

دەڕوات، بەڵام ئەندێشەکەی فراوانتر دەبێت لە جاران تا رادەیەك شارەزایی لە ژینگەی خۆی و دەوروپشتی پەیدا دەکا و هەوڵ دەدا لە دەرەوەی ماڵەوە پەل بۆ شتەکانیش درێژ بکا، منداڵ لەم قۆناغەدا حەز لە جموجۆڵ و پرسیار کردن دەکا، دەیەوێت نهێنی شتەکان و هۆ و هۆکارەکانیان بزانێت بۆیە ئەم قۆناغەی منداڵ زۆر جار بە قۆناغی واقیعیەت و ئەندێشەی هەڵچوو ناو دەبرێت، منداڵ تیایدا ئارەزووی گوێ بیستی چیرۆکە پڕ ئەندێشەییەکان دەکات، بە پەرۆشە بۆ گوێگرتن لەو چیرۆك و هەقایەتە ئەفسانەییانەی کە پاڵەوان هەردەم لە گێژاوی گیروگرفت و مەترسی و قووڵایی دەریاکان لە دەست دێو و جنۆکە و دڕندەی کێوی لە پەلەقاژێدا بێت، بەڵام گێڕانەوەی ئەم جۆرە چیرۆکانە بۆ منداڵان رەنگدانەوەیەکی خراپ لەسەر دەروون و کەسایەتییەکان بە جێ دەهێڵێ، رەنگە ئەم گروپە منداڵانە کە زۆر گوێ بیستی ئەم چیرۆکانە دەکەن سەرشێت و شەڕانگێز دەرچن و، لە دوارۆژیشدا رێگای چەوت و گەندەڵی هەڵبژێرن. بۆیە وا باشە چیرۆکنووس بۆ هەڵبژاردنی بابەتەکەی تەنها سوود لە گرێچنەکانی ئەم جۆرە هەقایەت و ئەفسانانەوە وەربگرێت[13].

لەم بارەیەشەوە جۆن ئەیکن ئەڵێ: ***"لە هەڵبژاردنی چەند بابەتێك بۆ چیرۆکی منداڵان، بە زۆری وا بە سوودە کە سەرنجێکی تر بدەینە گرێچنە بنچینەییەکانی ئەفسانە و هەقایەتە میللییەکان"***[14].

---

[13] رۆستەم باجەلان، کە منالْ هەولْ دەدا بەرهەمی ئەدەبی بنووسێت، گۆڤاری (نووسەری نوێ) ژ(٤) خولی دوای راپەڕین تەمووزی ١٩٩٨، ل ٤٣. هەروا: جەلال سنجاوی، چۆن حەکایەت بۆ منداڵەکەت دەگێڕیتەوە، رۆژنامەی (یەکبوون) ژمارە (٨)، ٢٥/نیسان/١٩٩، ل٦.

[14] جون أيكن، كيف تكتب للأطفال، ترجمة : كاظم سعدالدين، بغداد، ١٩٨٨، ص١١٣.

ئەگەرچی رەنگە ئەم جۆرە چیرۆکانە کاردانەوەیەکی خراپیان بەسەر دەروونی منداڵاندا هەبێ، وەلێ لە هەمان کاتیشدا دەبێ هۆکارێك هەبێت کە ئایا بۆچی منداڵانی ئەم تەمەنە ئارەزووی گوێ بیستی ئەم جۆرە چیرۆکانە دەکەن، رەنگە ئەم ئارەزووەش بگەڕێتەوە بۆ بەرجەستە کردنی ئەو ترس و دوودڵییەی کە لە ناخیاندا هەستی پێ دەکەن، واتە ئەمە وەك هەوڵێکە بۆ زاڵ بوون بەسەریاندا.

لە ئەدەبی کوردیدا ئەم جۆرە چیرۆکانە نموونەیان هەیە و زۆرن، یەکێ لەوانەش بریتییە لە چیرۆکی ئەفسانەی (**شێتۆکە و ئاقڵۆکە**)، کە ئەم ئەفسانە چیرۆکێکە بۆ مێرمنداڵان، باس لە بەسەرهاتی دوو برا دەکات بە ناوی (شێتۆکە و ئاقڵۆکە)، کە لەبەر نەبوونی و بێداری تووشی کوشتنی دوو پیاوی حەس حەس دێن، کە ئەم دوو پیاوە دەیانەوێ فێڵیان لێ بکەن و سامانیان داگیر بکەن، هەر لەبەر نەبوونی و هەژاری روو لە شار و چۆڵ و چیا دەکەن و تووشی چەند بەسەرهاتێك دێن، دواتر تووشی حەوت دێوی گەورە وەك کەڵە شاخ دێن، کە هەمیشە مەنجەڵێکی رەشی گەورەیان لەسەر ئاگرە و، بڵق بڵق دەکوڵێ و پڕە لە خواردنی دێوەکان، ئەم دێوانە کەس ناتوانێ لێیان نزیك بێتەوە و شوێنێکی زۆر خۆشیان داگیر کردووە، کە هەست بەوە دەکەن ئەم دوو برایە لێیان نزیك بوونەتەوە و هاتوونەتە شوێنی ئەوان، بە دەنگێکی زۆر گەورە کە ئەم ناوچەیە پڕ دەکات بانگیان دەکەن و دەیانەوێ بیانکەن بە خۆراکیان، بەڵام خۆشبەختانە بە هۆی هۆشیاری و بیرکردنەوەی عاقڵانەی (عاقڵۆکە)، دەتوانن بەسەر دێوەکاندا زاڵ بن وخۆشی و شادی دەگەڕێتەوە ئەو شوێنەی کە دێوەکان تیایدا دەژیان[١٥].

---

[١٥] مەغدید رواندزی، ئەفسانەی شێتۆکە و ئاقلۆکە، بۆ مێرد منداڵان، هەولێر، ١٩٩٨.

چـیرۆکنووس لـە چـیرۆکدا دەبـێ هـەوڵی ئـەوە بـدات، هەمیشـە لـە بابەتەکانیدا هێزی چاکەکار و خێرخواز سەربکەوێت و شەڕانگێز و نـەیارەکان لە خاك بگەوزێنرێن، چونکە "*تۆڵە سەندنەوە، بابـەتێکی بـاوە لـە هەقایەتـە میللییەکانـدا... منـداڵان بـە شـێوەیەکی سروشـتی ئـەم چـیرۆکانەیان زۆر پێخۆشە، هێشتا منداڵەکان زۆر سەرەتایین، پێخۆشحاڵن کە شەڕانگێز ببینن لە خاك بگەوزێنرێ و سووکایەتی پێ بکرێ... دەرباز کردنـی کەسایەتیەکی چارە گران لە گوناهەکەی، بابەتێکە زۆر بە دڵی منداڵانە.*"[16]

سەرچاوەی سێیەم، کە چیرۆکنووس دەتـوانێ بابەتەکـەی لێ وەربگرێـت، بریتییـە لـە واقیـع، بێگومـان منـداڵانیش وەك گـەوران کاریگـەر دەبـن بـەو واقیعەی کە تیایدا دەژین، ئەو ڕووداو و گۆڕانکارییانەی کە منداڵ لـە ژیانیـدا دەیبینێت یاخود هەندێ جار بەسەر خۆیشیدا دێن، کار دەکەنە سەر گـۆڕانی بیرکردنەوەی منداڵ. ئەمەش بێگومان لەمیانەی گۆڕان و گەشەکردنی قۆناغی تەمەنیدا روودەدات. "*منداڵ کە تەمـەنی گەیشـتە دوازدە سـاڵ لـە شـێوازی ژیـانی رابـردووی یـاخی دەبێـت، تەنانـەت هەنـدێك جـار بـە رووی دایـك و باوکیشیدا دەتەقێتەوە، قایل نابێت وەك منـداڵ سـەیری بکرێـت و خولیـاو ئارەزووە تازەکانی لێ تێکبدرێت، منداڵ لە تەمەنی دوازدە تا پازدە ساڵیدا، رازی نییە گوێ بۆ چیرۆکێك شل بکات باسی نوقڵی تێدا بێت، وەلێ چـونکە بـەرەو هـەرزەکاری دەڕوات، چـیرۆکی دڵـداری سـەرنجی ڕادەکێشـێ، لـە ناخـەوەدەیبزوێنێت.*"[17]. منـداڵانی قۆنـاغی (٨– ١٢) سـاڵان و بـە

---

[16] جۆن ئەیکن، و. کەمال غەمبار، چۆن بۆ منداڵان دەنووسی، ل٧٦.

[17] حەمە سەعید حەسەن، هزر و شێواز لە چیرۆکی کوردیدا، ل ١٢٩.

سەرەوەش،لە کاری پڕ ئەندێشەیی تا رادەیەك دووردەکەونەوە و لە راستی و واقیع نزیك دەبنەوە، حەز دەکەن لە شتەکانی دەوروبەریان تێبگەن. پەی بردنی چیرۆکنووس بە بابەتی واقیعی، ئەو واقیعەی کە وێنەی ژیان دەکێشێت بەو شێوەی کە منداڵ دەیبینێ، دەتوانێ بەشداری لە گەشەکردنی سروشتیاندا بکات ئەمەش لە رێگەی گوزارشتکردن لەو گرفتانەی کە دێنە رێگای منداڵەکە و خێزانەکەی و ژیانی. بۆیە لەمساڵانەدا منداڵان لە قۆناغی چیرۆکی خەیاڵی و هەقایەتی خورافی دەگوازرێنەوە بۆ قۆناغی ئەو چیرۆکانەی کە زیاتر لە واقیعدا نزیکن، منداڵ لەم قۆناغانەی تەمەنیدا دەتوانێ پێناسە بۆ شتەکان دابنێت و هەڵەکان ڕاست بکاتەوە. هەروەها دەتوانێ پێناسەی هەندێ وشە بکات کە خاوەنی هێما و رەمزی مەعنەوین وەك، چاکە، دادپەروەری، بەزەیی پیاهاتن...تاد. دەشتوانێ پەند و ئامۆژگاری و مەغزاکانی نێو چیرۆکەکان تێبگات هەستیان پێ بکات، کەواتە لەم قۆناغەدا چیرۆکنووس دەبێ هەوڵی ئەوە بدات ئەو بابەتانە هەڵبژێرێت، کە لە راستییەوە نزیکن، منداڵان لەم قۆناغەی تەمەنیاندا زیاتر حەز لەو راستییانە دەکەن، کە بڕوایان پێیەتی و دەیانەوێت پەردە لەسەر ئەو کێشانە لابدەن کە بەڕاستی ئەزانن و رووبەڕوویان دەبنەوە[١٨].

لە ئەدەبی کوردیدا چیرۆکی لەم نموونەیەمان زۆرە، کە چیرۆکنووس بابەتەکەی لە واقیع وەرگرتبێ. یەکێ لەو نموونانەش، چیرۆکی (**لاساری**) یە. ئەم چیرۆکە باس لە کوڕێکی تەمەن (١٠) ساڵان دەکات بە ناوی (هەندرێن)، منداڵێکی لاسار و گوێ نەگرە، هەمیشە لە قسەی دایك و باوکی

---

[١٨] محمد بن السيد فراج، الاطفال وقراءاتهم، ص٣٩-٤١.

دەردەچێت و گوێ بەئامۆژگارییەکانیان نادات، ئەمە جگە لەوەی لەگەڵ هاوڕێیەکی بە ناوی (میران) زۆر جار بە بیانووی (نان کڕین)، گوایە دەچنە نانەواخانە، لە ماڵەوە دەردەچن و پارەکە لە سەرەی نانەواخانەکە دادەنێن و خۆشیان دەچن یەکەیەکەی ماڵەکان ئەوەندەی لە توانایاندا بێت، زەنگی بەر دەرگاکانیان لێدەدەن و رادەکەن، هەروەها دەچنە سەر دەرگا و دیواری خەڵك بە دزی خاوەن ماڵەکە سێو و هەرمێکانیان دادەڕنن . تا رۆژێك هەندرێن و میران خەریکی لێکردنەوە و داپچڕینی دارەکانی حەوشەی ماڵێك دەبن، لە ناکاو خاوەن ماڵ لێیان دێتە دەر و (هەندرێن) دەستگیر دەکات و میرانیش رادەکات، خاوەن ماڵ بەنەرمی و لەسەرخۆ چەند قسەیەك بە (هندرێن) دەڵێت و چەند سێو و هەرمێیەکیشی لە دەست دەنێت و بەڕێی دەکات. (هەندرێن) بە شەرمەزارییەوە ملی رێگا دەگرێت و بەو کارە نالەبارەی خۆی زۆر دڵتەنگ دەبێت، یەکە یەکەی قسەکانی خاوەن ماڵی لەگوێدا دەزرنگێتەوە، بە تەواوی پەشۆکاو دەبێ. بەدەم خەیاڵەوە رووەو ئۆتۆمبیلێك دەڕوات. ئۆتۆمبیلەکە ملی لێ دەنێت و (هەندرێن) لە هۆش خۆی دەچێت و قاچێکیشی دەشکێت و دەیبەن بۆ نەخۆشخانە. کە بە هۆش خۆی دێتەوە زۆر هەست بە شەرمەزاری دەکات بەرامبەر دایك و باوکی و ئەو کارانەی کە کردوویەتی. بە دەم گریان و پەشیمانی ئەوەی کردوویەتی بۆیان دەگێڕێتەوە، لە کۆتاییدا بڕیار دەدا ئەوە دوایین کارە ناشیرینەکانی بێت. لەو رۆژەوە بە دواوە (هەندرێن) لاپەڕەیەکی نوێی لە ژیانی خۆیدا تۆمار کردو، نموونەی گوێڕایەڵی و ژیری بوو بۆ منداڵان[١٩] .

---

[١٩] سازان جەلال، ژیکەڵە، تاران، ٢٥٥٠،ل ١٦–٢٥.

دەتوانین هەمان چیرۆکی سەرەوە، بۆ رەگەزی (بابەت) پراکتیزە بکەین. چیرۆکنووس زیرەکانە توانیویەتی بابەتێك هەڵبـژێرێت نموونەیەك بێت لە واقیع و لەگەڵ سروشتی واقیعی منداڵاندا بگونجێت.

رووداوەکانی چیرۆکەکە (لاساری) منداڵێکە، کە بابەتی چیرۆکەکە دەنوێنێت. مەبەست و ئامانجی چیرۆکنووس لەخستنەڕووی ئەم بابەتەدا روون و ئاشکرایە، دەیەوێت لە منداڵان بگەیەنێت، گەر منداڵ (لاسار) بێت و لە گوێی دایك و باوکی و کەسانی لە خۆی گەورەتر دەربچێت، چارەنووسێکی خراپ چاوەڕێی دەبێت. چیرۆکنووس زانایانە توانیویەتی، ئەو خاسیەت و مەرجانەی کە دەبێت لە رەگەزی (بابەت)دا هەبێت، لە چیرۆکەکەدا بەرجەستە بکات، چیرۆکنووس تەنها یەك بیرۆکەی لە چیرۆکەکەدا ئاماژە پێکردووە. واتە چیرۆکەکە تەنها لە دەوری (بیرۆکەکەدا کە لاسارییە) دەخولێتەوە، لەگەڵ رەگەزەکانی تری نێو چیرۆکەکەش گونجاون و هەماهەنگی دروست کردووە.

## ٢- رووداو – Event

ئاشکرایە چیرۆك هی گەوران یان منداڵان بێت، لە کۆمەڵێك کار و کردەوە و بەسەر هات و گیروگرفت پێك دێت، کە بەسەر پاڵەوانەکانی چیرۆکەکە دا دێن و تێدەپەڕن، لە ئەنجامدا رووداوی چیرۆکەکە پێك دەهێنن. چیرۆکیش بە بێ ئەم رووداوانە هەڵناکاو ناچێت بەڕێوە،چونکە رووداوەکان بە بناغەی بنیاتنانی چیرۆك دادەنرێن. هەر رووداویشە کە هێز و توانا و جموجۆڵ دەداتە چیرۆکەکە و یەکەمین رەگەزە کە سیفەتی چێژ بەخشینە بۆ منداڵ،

"*بۆیە پێویستە لەسەر نووسەرەکە بەردەوامی بدات بە بزوتنەوەی رووداو و، جموجۆڵی رووداوەکان بپارێزێ.*"[20].

دەتوانین چەمکی رووداو لەم پێناسەیەدا روون بکەینەوە کە دەڵێت : "*رووداو، بریتییە لە کۆمەڵێك بەسەرهاتی یەکگرتووی بە دوای یەکدا هاتوو، کە دەبێت بە شێوەیەکی هونەری دا بچنرێت و بگێردرێنەوە، کە بتوانێ کاریگەری خۆی بنوێنێت بەسەر هەست و ئەندێشەی منداڵان و سەرنجیان بۆ لای خۆی رابکێشێت.*"[21]، واتە رووداو پارچەیەکی بچووکە و یەك چنین دەیگرێتە خۆ، دەبێ لە زنجیرەیەکی یەکگرتووی گونجاو پێك بێت، بە شێوەیەکی یەك لە دوای یەك رووداوەکان لە یەکتری گرێ بدرێن، تاوەکو کارلێك دەکەن و دەگەنە لووتکە، بەمەش (گرێ)یەك دروست دەبێت، کە منداڵان زۆر ئارەزوو بە کردنەوەی ئەم گرێیە دەکەن.

رووداوەکان نابێت تەنها کۆمەڵێك هەواڵ بن، نووسەر لە نێوانیاندا پەیوەندی دروست کراو بخولقێنێت، چونکە ئەرکی چیرۆکنووس گێرانەوەی بەسەرهاتەکان و گەیاندنی هەواڵەکان نییە، بە شێوەیەکی رووت و کۆپیکراو بەو شکلەی کە لە واقیعدا هەیە، بۆیە "*چیرۆکنووس پێویستە ئاگاداری ئەوە بێت، کە رۆژنامەنووس نییە، هەواڵ بگەیەنێت، بگرە نووسەرێکە نەخشەی جیهانێکی باڵاتر لە جیهانی واقیع دەکێشێت، جیهانێك نە پاشکۆی واقیعە و نە راستگۆیی هونەریشی تێدا فەرامۆش دەکرێت، خۆ ئەگەر دەقاودەق رووداوێکمان گێرایەوە، یان بەو پەڕی دەسپاکییەوە، بەسەرهاتی کەسێکمان*

---

[20] جون ايكن، كيف تكتب للاطفال، ترجمة، كاظم سعدالدين، ص١١٧.

[21] دكتور نجيب الكيلانى،ادب الاطفال في ضوء الاسلام، ص ٥٩.

*نووسیەوە، ئەوا لە باشترین حاڵەتدا، دیرۆکنووسێن نەك چیرۆکنووس.* "[٢٢]
بەڵکو چیرۆکنووس دەبێ ڕووداوەکان و بەسەرهاتەکان بە شێوەیەکی زنجیرەیی و یەکگرتوویی بچنێت. بەشێوەیەك لەگەڵ یەکەکانی تری نێو چیرۆکەکە هەماهەنگی بنوێنێت و هەموویان بە یەکەوە بەشێکی خاوەن واتای دیاریکراو بهێنن وبەشداری لە دروستکردن و کردنەوەی (گرێ)یەکە بکەن.

چیرۆکنووسی منداڵان دەبێ ڕۆڵی نواندن ببینێت، لە کاتی نووسینی چیرۆکەکەدا، واتە بە شێوازێکی وا چیرۆکەکە بنووسێت، ئەندێشەی منداڵان بوروژێنێت و بە ئاگایان بێنێت، بۆ ئەوەی خۆیان بتوانن بچنە نێو ڕووداوەکان، وەك ئەوەی پاڵەوانێك بن تیایدا، ئەمەش ڕادەوەستێتە سەر ڕادەی ئاشکرایی و ئەو هێزەی کە چیرۆکنووس ڕووداوەکانی پێ دەخاتە ڕوو بۆیە "*بونیاتنانی چیرۆك بە ڕادەیەکی زۆر دەوەستێتە سەر ڕوونی (وضوح)ی دانەر لە خستنە ڕووی ڕووداوەکاندا.*"[٢٣].

خاڵێکی تر لە بارەی ژمارەی ڕووداوەکان و چۆنیەتی بەکارهێنانیان"*بە شێوەیەکی گشتی، نابێت لە چیرۆکی منداڵاندا ڕووداوی زۆر بە کار بهێنرێت،ئەمەش تاوەکو منداڵ سەری لێ نەشێوێت، هەلی وەرگرتنی ڕووداوی سەرەکی لێ ون نەبێت، مانای چیرۆکەکەش لە دەست نەدات.*"[٢٤].

---

[٢٢] حەمە سەعید حەسەن، قارەمان و ڕووداو لە چیرۆکی کوردیدا، گ. (شین)، ژ (١٠) ئاداری ٢٠٠٥، ل٨٤.

[٢٣] علی الحدیدي، الادب وبناء الانسان، ص١١٨.

[٢٤] الهیتي، أدب الاطفال، ص١٤١.

ڕووداویش وەکو بابەت دەتوانێت سەرچاوەکەی ئەندێشە، واقیع، هەقایەتە میللی و ئەفسانەییەکان بێت، بەڵام دەبێ ئەوە لەبیر نەکەین، سالأنێك بوو ڕووداوەکانی زۆربەی چیرۆکی منداڵان، لە زۆربەی ولاَتانی جیهاندا، سروشتێکی ترسناك و توند و تیژی بەخۆوە گرتبوو، ڕەنگە ئەمەش هۆیەکەی بگەڕێتەوە بۆ ئەو هەقایەتە میللی و ئەفسانەییانەی کە لە کۆندا دەتوانین بڵێین سەرچاوەیەك بوون بۆ لە دایکبوونی چیرۆك و ئەدەبی منداڵان لە هەموو جیهاندا، هەر وەك لە بەشی یەکەمدا ئاماژەمان بەو مەسەلەیە کرد. بەڵام ئەم دیاردەیە لە ماوەی سالأنی دواییدا، بەرەو کزی و نەمان ڕۆیشت و گۆڕانی بەسەر داهات، داهێنانێکی نوێ بۆ چیرۆك سەری هەڵدا، ئەم گۆڕانە چیرۆکی منداڵانی لە ئەدەبی کوردی  لە دوای ڕاپەڕینیشدا گرتەوە، تەنانەت ئەو گۆڕانە ئەو هەقایەتە کۆنانەشی گرتەوە کە لە ناو کۆمەڵدا باو بوون، تیایدا وێنەکانی توندوتیژی و تۆقاندن و کوشتن و خیانەتکردن لادران، هەروەها کەسایەتییەکانی وەکو جنۆکە و مۆتەکە و ئەفسوونبازەکانیش تا ڕادەیەك دوورخرانەوە.

هەر بۆیە نابێت چیرۆکی منداڵان لە هەڵوێستی نابەجێ و ترسناك پێك بێت، بەو ڕادەیەی کە ورووژاندن و هەڵچوونێکی تیژیان بۆ سەر دەروونی منداڵدا هەبێت، وەکو تەعزیبێکی زۆری کاریگەر، ستەم و تاوانی نابەجێی ڕەق، چونکە ئەم جۆرە هەڵوێستانە، کاریگەرییان بەسەر پێکهاتنی عەقڵ و ویژدانی منداڵاندا دەبێت، کاریگەرییەکی زۆر خراپ. بۆیە دەبێت چیرۆکنووس هەوڵبدات ئەو ڕووداوانە هەڵبژێرێت کە بە هەڵچوونی دڵخۆشکەر و خۆشەویستی و پێکەنیناوی دەناسرێنەوە[٢٥].

---

[٢٥] فهيم مصطفى، الطفل والقراءة، ص ١٥٩.

هەر بۆیەشە "***گرنگترین رەگەز لە منداڵاندا، کە دەبێ ئێمە سوودی لێ وەربگرین بریتییە لە (ئەندێشە)، چونکە ئەندێشە بنچینەیە بۆ هەموو گەشەکردن و داهێنانێك، دەبێ ئەوەش بزانین کە منداڵ داوای رووداوی واقیعی دەکات لە رێگەی ئەندێشەوە.***"[٢٦].

راستە نووسەری منداڵان دەبێت لە زۆر بابەتدا سوود لە واقیع وەربگرێت و بیکات بە سەرچاوەیەك بۆ رووداوەکانی، بەڵام ئەو واقیعەش دەبێت لەگەڵ واقیعی منداڵاندا بگونجێت، بە رەچاوکردنی ئاستی تەمەنیان و، لە رێگەی ئەندێشەوە پێشکەش بکرێت نابێت ئەوەش لە بیر بکەین، "***ئەو رووداوانەی گرێیەکە دەکەنەوە، یان رووداوی دراماکە هێور دەکەنەوە، دەبێ بە وردی هەڵبژێردراوبن و هەموویان لەگەڵ رووداوی سەرەکی بگونجێن، کەوا پرۆژەی چیرۆکەکەی لەسەر بنیات نراوە و پەیوەستە بە ئەو.***"[٢٧] لێرەشدا ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە لە چیرۆکدا دوو جۆر رووداو هەن، یەکێکیان رووداوی سەرەکییە، کە بەشێکی گرنگی نێو چیرۆکە و بەرنامەی چیرۆکەکەی لەسەر دەڕوات، دووەمیشیان رووداوی لاوەکییە، کە ئەویش رووداوێك یاخود چەند رووداوێکن و گەشە بە رووداوی سەرەکی دەدەن و بەشداری دەکەن لە کردنەوەی (گرێ)ی ناو چیرۆکەکە.

لێرەدا ئێمە نموونەی چیرۆکێك دەهێنینەوە و تایبەتمەندییەکانی رەگەزی رووداوی بەسەردا پراکتیزە دەکەین. چیرۆکەکەش بریتییە لە (**کۆتر و رێوی**).

سەرەتای رووداوەکە بە دروستکردنی هێلانەیەك لە شوێنێکی بەرز، لەلایەن دایکە کۆترەکەوە دەست پێدەکات، رێویش هەوڵ دەدات کۆترەکە و

---

[٢٦] رشاد رشدی، فن القصة القصيرة، ص١٠٠.

[٢٧] سمير عبدالوهاب، قصص وحكايات الاطفال، ص ١٩٩.

بێچووەکانی بخوات بەڵام پێیان ناگات، بۆیە هەڕەشـە لـە کۆترەکـە دەکـات، ئەگــەر بێچــووەکانی بــۆ فــڕێ نەداتــە خــوارەوە، ئــەوا ســەردەکەوێت و بێچووەکانی دەخوات، کۆترەکـە بـە ناچـاری و بەچـاوی پـڕ لـە فرمێسـکەوە بێچووەکانی بۆ فڕێ دەداتـە خـوارەوە، بـۆ سـاڵێکی تـر کۆترەکـە بەچـکەی جوانتر هەڵدەهێنێ، بەڵام دیسان خەم دایدەگرێت، لە ترسـی ئـەوەی دیسـان ڕێـوی بێتــەوەو داوای بێچــووەکانی بکــات و بیــانخوات. قەلــە ڕەشــکەیەك ئامۆژگاری دەکات کە گوێ بە قسەکانی ڕێوی نەدات، چونکە ئەو لـە شـوێنی بەرزە و ڕێوی ناتوانێ پێی بگات. بۆیە لە کۆتاییدا داوا و مەبەستی مام ڕێوی جێبەجێ ناکرێ و بە سەرشۆڕی دەڕوات[٢٨].

نووسەری چـیرۆکی (**کۆتر و ڕێـوی**) مامەڵەیـەکی زیرەکانـەی لەگـەڵ ئـەم ڕەگـەزەی چـیرۆکدا کـردووە. لـەم چـیرۆکەدا یـەك ڕووداوی سـەرەکی بـەدی دەکرێت ئەویش (خـواردنی بێچووەکانی کـۆترە لـەلای ڕێـوی). کـە پـڕۆژەی چیرۆکەکەشــی لەســەر بونیــات نــراوە. ڕووداوە لاوەکییــەکانیش بــریتین لــە (دروستکردنی هێلانە)، (گفتوگۆی نێـوان دایکـە کۆترەکـە و قەلەڕەشـکەکە) بەڵگـەشمان لـەوەدا ئەوەیـە چـیرۆکنووس توانیویـەتی بـە شـێوەیەکی ورد ڕووداوە لاوەکییـــەکان هەڵبـــژێرێت، کـــە لەگـــەڵ ڕووداوە ســـەرەکییەکەدا بگونجێت و بەشداری بکەن لە کردنەوەی (گرێ)یەکە. (گرێ)ی چـیرۆکەکەش بریتییە لە (چۆنیەتی پاراستنی بێچووەکان لەلایەن دایکە کۆترەکەوە.)

### ٣- گرێچن (تەون)- The plote

---

[٢٨] شاخەوان علی حمد، ورچ و شێر و مام ڕێوی (کۆمەڵە چـیرۆکێکی منداڵانـە)، هـەولێر ٢٠٠٢، ل١٨.

دەتوانین بڵێین گرێچن پـرۆژەی رێکخسـتنی رووداوەکانـە بـە شـێوەیەکی هونـەری، واتـە کاتێـك چـیرۆکنووس، بـاس لـە رووداوەکـان دەکـات لـە چـیرۆکەکەیدا، دەبـێ بـەردەوامی و جموجۆڵیـان پـێ بـدات و، بەشـێوەیەکی هونەرییانە بیانچنێت، بەمەش رووداوەکان، بەرەبـەرە گـەورە دەبـن تـاوەکو دەگەنە ترۆپك، ئەمەش پێی دەڵێن گرێچن یان (پلۆت).

بۆیە "***گرێچن ئەو خاڵە دەنـوێنێ، کـە رووداوەکـانی چـیرۆك تیایـدا لێـك دەئـاڵێن، هـەروەها گرێچـن، پلانـی چـیرۆکە، لـە ناویـدا رووداو بەسـەر کارەکتەرەکاندا دێت، یان بەهۆی ئەوانەوە رووداو روودەدات، گرێچن بریتییە لەو دەزووەی، کەوا سەرەداوی چنینی چـیرۆك و بونیاتنانیـەتی، ئـەمیش وا دەکات، خوێنـەر حـەز بـە خوێندنـەوەی چـیرۆکەکە بکـات***"[٢٩]، گرێچـنیش دەبێت زۆر بە هێز و مانابەخش بێت، چونکە یەکێکە لەو رەگەزانەی، خوێنەر بۆ لای چیرۆك کێش دەکات، ئەگینا بە پێچەوانەوە، ناتوانێ سەرنجی منداڵان لـەو ماوەیـەدا، کـە چـیرۆکەکەی تیایـدا دەگێڕدرێتـەوە، بـۆ لای چـیرۆکەکە رابکێشێت، چونکە بێ مانایی و بـێ هێـزی گرێچـن، منـداڵان تووشـی بێـزاری دەکات و، ئارەزووی ئەوەیان نابێت تا کۆتایی گوێ بیستی چیرۆکەکە بن.

چیرۆکنووسی منـداڵان، دەبـێ هـەوڵی ئـەوە بـدات، چـیرۆکەکەی لـە یـەك گرێچـن پێـك بێـت و سـادە و سـاکار بێـت، واتـە "***گرێچـن لـەکتێبی منداڵـە بچووکەکاندا، پێویست بەوە ناکات ئاڵۆز بێت.***"[٣٠] ، چونکە گرێچـنی ئـاڵۆز (***الحبکة المرکبة***)، سەرەنجامی هەبوونی زیاتر لە رووداوێکـی سـەرەکییە، لـە

---

[٢٩] د.سمیر عبدالوهاب احمد،قصص و حکایات الاطفال،ص١٩٩.

[٣٠] جون ایکن، کیف تکتب للاطفال، ترجمة : کاظم سعدالدین،ص ٦٥.

چـیرۆکی منداڵانیشـدا، دەبـیٚ هـەوڵ بـدرێت، یـەك رووداوی سـەرەکی بـەکار بهێنرێت، چونکە منداڵی بچووك، توانای پەیبردنی تـەواویان نییـە تـاوەکو لـە یەك کاتدا بە دوای چەند گرێیەکدا بکەون یاخود لە چیرۆکی ئاڵۆز تێبگەن.

سەرچـاوەی دروسـتبوونی هـەر گرێچـنێك لـە چـیرۆکێکدا، لـە بـوونی کێشەکەوەیە، یان گەورەبوون و پەرەسەندنی رووداوێکە بۆ لووتکە و ترۆپك، ئەم گرتەش (کێشەکە)،جموجۆڵی و گەرم و گوڕی دەداتـە رووداوەکـان. بـە واتایەکی دی دەتوانین بڵێین، کاتێـك کـە رووداوەکـان گـەورە دەبـن و پـەرە دەسێنن، دەبنە هۆی لەدایکبوونی گرێچنێك (پلۆتێك)، کە گرێچنیش دروست بوو، پێویستی بە چارەسەر کردن دەبیٚ، بۆیە رووداوەکـان لـە بـەردەوامی و گـەرم و گوڕیـدا دەبـن، تـاوەکو گرێیەکـە (گرفتەکـە) چارەسـەر دەبێـت و چیرۆکەکە دەگاتە کۆتایی.کەواتە "*گرێچن ئـەو گرێیـە (عقـدە)یـە دەگرێتـە خۆ، کە گرفتەکە (کێشەکە)دەنوێنیٚ، لـە کـاتی کارلێك کردنـی رووداوەکـان دەردەکەوێت، ئەویش ئەو کێشە و هەڵوێسـتە نادیارەیـە، کـە پێویسـتی بـە راڤەکردن هەیە و، کار دەکاتە سـەر ئـارەزووکردن (الرغبـة) بـۆ دۆزینـەوە و زانینـی ئەوەی لە دوایدا دێت.*"[(٣١)]، بۆیە بەم شێوەیە، بۆمان دەردەکەوێت، گرێچن (سەرەتا و، ناوەڕاست (گریٚ) و، کۆتایی) هەیە:

## ١- سـەرەتا Exposition

سـەرەتا لـە چـیرۆکدا، بـە بەشـێکی گـرنگ نـاوزەد دەکرێـت، چـونکە چیرۆکنووس لە رێگەیەوە، دەبێت هەست و خەیاڵی خوێنەر بۆ ناو چیرۆکەکە

---

[(٣١)] د. سمير عبدالوهاب احمد، قصص وحكايات الاطفال، ص ١٩٩.

رابکێشێت، ئەمەش لە کاتێکدا دەبێت، کە پێشەکییەکە بە دەستەواژەی بە هێز و سەرنجڕاکێشەر دەست پێبکات، هەروەها هەوڵیش بدرێت لە پێشەکیدا، کەسایەتییە سەرەکییەکان ببردرێنە نێو چیرۆکەکە و، بە منداڵان بناسرێنرێن. بۆ نموونە، چیرۆکی **" تۆم سوێر، بە پوورە بۆلی دەکرێتەوە کەوا راوی تۆم دەنێ، کە مورەببا دەدزێ"**[٣٢]. ئەمەش وا لە منداڵ دەکات، لەگەڵ ئەو باس و خواستانە سەرقاڵ بێت، تاوەکو رەوتی چیرۆکەکە و پەیکەرەکەی پەرە دەسێنێ. ئەگینا بە پێچەوانەوە منداڵ تووشی بێزاری دەبێت و ئارەزووی تەواوکردنی چیرۆکەکەی نامێنێ. هەروەها دەبێ سەرەتا پەیوەندییەکی پتەو و نەپچڕاوی لەگەڵ بەشەکانی دوای خۆیدا هەبێت، چونکە سەرەتا، پارچەیەکی هونەری بەرزە و بەستراوەتەوە بە بەشەکانی دی تێکستەکە و، لێی جیا ناکرێتەوە[٣٣].

## ٢- گـرێ Conflict

گرێچنی باش، ئەو گرێچنەیە، کە (گرێ)یەك بگرێتە خۆی، گرێش پەرە دەسێنی و دەگاتە ترۆپك، لە ئەنجامی بەیەکدا چوون و پەرەسەندنی رووداوەکان و هاتنە ناوەوەی کەسایەتییەکان. گرێش، کێشەیێکە، یاخود هەڵوێستێکی نادیارە، کە پێویستی بە راڤەکردن هەیە، بۆیە کار دەکاتە سەر ئارەزووەکان، بۆ دۆزینەوەو زانینی ئەوەی لە دوایدا دێت. کێشە و قەیرانی چیرۆك، بۆی هەیە رەوانی بێ، دەشگونجێ لە بەرەنگاربوونی کردەوەی باش

[٣٢] جۆن ئەیکن، چۆن بۆ منداڵان دەنووسی، و. کەمال غەمبار، ل٨٠.

[٣٣] د. پەرێز صابیر، بینای هونەری چیرۆکی کوردی..، ل ١١٣.

و هەستی دەروون سەرچاوە بگرێ، دوور نییە لە دۆخێکی گاڵتـەجاڕ دابـەدی بـێ، بـە هــەرحاڵ دەبـێ سروشـتی و لـە راسـتی نزیـك بـێ و لـە چـیرۆك بوەشێتەوە، زۆر جار لە گرێچندا، گرێ لە ئەنجامی ململانێ، پێچەوانە بوون، دووبارە بوونەوە، یان دژایەتیکردن دروست دەبێت، لێرەشـدا مەبەسـت لـە ململانێ، " شێوەکانی خەباتکردن و بەرگریکردنە، جا چ بە شـێوەی هێمـایی (سیمبولی) بێ، یاخود واقیعی. ئەو چیرۆکانەی، کـە ململانێکانیـان لـە نێـوان هێــزە بەرهەڵسـتکارەکانە، لــەو کاتــەدا ململانێیەکـە ڕەمــزی دەبێـت، لــە کاتەکانی تریشدا واقیعی دەبێت. ململانێیەکانیش، یان لە نێوان گیانلەبەراندا دەبێت، یەك لەگەڵ یەکێکی تر، لە نێوان چاکە و خراپە (شەڕ)دا، ئەم جـۆرە ململانێیەش لە منداڵانی پۆلی یەکەمی سـەرەتایی بـە ڕێـژەی ٦٥٪، لـە پـۆلی دووەمدا بە ڕێژەی ٤٠٪، لە پـۆلی سـێیەمدا بـە ڕێـژەی ٤٧٪ دەبێـت، یـانیش ململانێیەکان لە نێوان هێزە ماددی و رووحییەکاندا دەبێت، ئەم جۆرەش لـە چـیرۆکی ئـایینی و پێغەمبەرانـدا بـەدی دەکرێـت و، ڕێژەکەشـی (٢٢٪)ە بـۆ منداڵانی پـۆلی یەکـەم و دووەمـی سـەرەتایی. جـۆرە ململانێیـەکی تریشـمان هەیە، کە لە نێوان حەق و ناحەق دایە، ئەمەش لە چیرۆکە کۆمەڵایەتییەکاندا بـەدی دەکرێـت، یـاخود لـە نێـوان مـرۆڤ و ژیـانی زەحمـەت و کولەمـەرگی. ڕێژەکەشی، بۆ منداڵانی پۆلی دووەمی سەرەتایی١٧٪ و پۆلی سێیەمیش ١٢٪ یـە"[٣٤]، بـەڵام لـە هـەموو ئەمانەشـدا، نابێـت شـتێك بـاڵ بەسـەر رووداوی سەرەکییدا بکێشێت، ئەمەش دەبێت چیرۆك لەسەری بڕوات، بـە بـێ پچـڕان یان راوەسـتان. هـەروەها دەبـێ هێڵـی(گـرێ) بـە روونـی دیـار بێـت، تـا ئـەو

[٣٤] د. حسن شحاتة، أدب الطفل العربي، ص ١٦٨-١٦٩.

رادەیـەی گـەر مرۆڤێـك ویسـتی چـیرۆکێك بگێڕێتـەوە، ناسـینەوە یـان بـە دواداچوونی گرێی لا ئاسان بێت، لە کاتی گێڕانەوەکەدا. بۆیە دەتوانین بڵێین (گرێ)، ئەو خاڵەیە، کە کێشەکە تیایدا لەو پەڕی توندی و چڕبوونەوەدایە.

## ٣- ئەنجـــام Denouement

گرنگی کۆتایی لە چیرۆکدا، لەرەگەزەکانی تـری نـاو چـیرۆکەکە کـەمتر نییە، چونکە لەگەڵ ئەوەی کۆتایی خاڵی تەقینەوە و چارەسەرکردنی کێشـە و ململانێیەکانە و، خوێنەر بە هۆیەوە دەگاتە ئەنجامێك، جگە لەمە کۆتـایی، ئەو بەشەیە کە ئامانج و مەبەستی گشـتی چـیرۆکەکە تیایـدا دەخرێتـە ڕوو، بۆیە زۆر لە لێکۆڵەرانی چیرۆك، ئەم بەشە بە (ساتی ڕووناك کردنەوە ـ **لحظة التنوير**) ناو دەبەن. واتە " ***هەموو ئـەو کێشـەو گرفتانـەی کـە لـە چـیرۆکدا ڕوودەدەن، بەرەو خاڵی ڕووناك کردنەوە دەڕۆن، کە کۆتایی چیرۆکەکەیە و، تیاشیدا مانای گشت شتەکانی پێشوو ڕوون دەکاتەوە و دەردەخات.***"[٣٥] ، کۆتـاییش دەبـێ ببێتـە مایـەی ڕازی کـردن و قایـل بـوونی منـداڵان، چـونکە کۆتایی بەلای منداڵانەوە سەر لێشێواندن و گومان دەنوێنی ئەگەر بۆشـایی و تێنەگەیشتن ڕووبـەڕوویان بێتـەوە، بۆیـە کۆتـایی لاوازو قەناعـەت پێنـەکراو، خـراپترین گوناهـە کـە نووسـەر دەیکـات، هـەموو نووسـەران دەداتـە دەسـت پڕوپووچی و بـەتاڵی، لەبـەر ئـەوە کـە کۆتـایی دێـت، دەبـێ بـە هێـز بێـت و مەبەستێك بگەیەنێت، قەناعەت پێهێنەر بێت. جا بۆ ئەوەی کە هیچ گومانێك نەمێنێتەوە و، خوێنەر هەستێکی تەماوی بەرانبەر بە چـیرۆك و چارەنووسـی کەسایەتییەکانی نێوی نەمێنێ، نووسەر زۆر جار ڕەگەزێك لە ڕەگەزەکانی لە

---

[٣٥] الدكتور رشاد رشدي، فن القصة القصيرة، ط٣ ،١٩٧٠، ص١١٢.

پڕی دەخاتە سەر، واتـە دەخاتـە سـەر کۆتاییەکـە، بەمـەش گشـت کـەلێن و قوژبنە تاریکەکانی ناو چیرۆکەکە بۆ خوێنەر یان گوێگر روون دەبێتەوە. ئەم رەگەز و خستنە سـەرانەش هەنـدێ جـار بەرێککـەوت دێنـە نـاو چـیرۆکەکە، هەندێ جاریش چیرۆکنووس بە ناچاری پەنایان بۆ دەبات، هـەروەك باسمـان کـرد تـەنها بـە مەبەسـتی ئـەوەی خوێنـەر یـان گوێگرەکـە بڵـێ (بـەڵێ مـن تێدەگەم)[٣٦].

لێرەدا پرسیارێك سەر هەڵدەدات، ئایا کۆتایی دەبێت دڵخۆشکەر و شادی بێت، یان غەمگینی؟! چارەسـەرێکی تـەواو و ئامـادەکراو پێشـکەش بکـات، یاخود نا؟! بۆ وەڵامی ئەم پرسیارەش لێکۆڵەرانی بـواری چـیرۆك و ئـەدەبی منداڵان، ڕا و بۆچـوونی جیاوازیـان هەیـە، جیاوازییەکـەش بـە پێـی جیـاوازی قۆنـاغی تەمـەن سـەری هەڵـداوە، بـەڵام هەنـدێ لـە رەخنـەگران کۆتـایی بەختـەوەریان لـە چـیرۆکی منداڵانـدا پـێ باشـە، چـونکە بـە پێـی ئـەو لێکۆڵینەوانەی لەم رووەوە لەسەر منداڵاندا ئـەنجام دراون، دەرکـەوتووە کـە ئەو چیرۆکانەی کۆتاییان بە خۆشی و شادی دێت، بە رێژەیەکی زیاتر لەلایەن منداڵاندا وەردەگیرێت لەو چـیرۆکانەی کـە کۆتاییـان دڵتـەنگی و ناخۆشـییە، ئـەو لێکۆڵـەر و رەخنەگرانـە، پێشـبینی ئـەوە دەکـەن، کـە ئـەو چـیرۆکانەی کۆتاییەکانیان ناخۆشییە، پێویست بەوە ناکات کە منداڵان گوێی لێ رابگـرن، چـونکە جیهـانی منـداڵ، جیهـانی دڵخۆشـی و زەردەخەنـە و شـادییە، بۆیـە پێویستە لەسەرمان، کە هەست و سۆزی منداڵ بەم کۆتاییە ناخۆشـانە ئـازار نەدەین. هـەروەها سـەبارەت بـە چارەسـەریش بـۆ کۆتـایی، دەکـرێ چـیرۆك

[٣٦] جۆن ئەیکن، چۆن بۆ منداڵان دەنووسی، و:کەمال غەمبار، ل ٨٣–٨٤.

کۆتایی پیێ بێت، بەبێ ئەوەی هیچ چارەسەرێك پێشکەش بە منداڵان بکرێت، بەڵکو بۆ منداڵان بە جێ بهێڵرێت کە خۆیان بە ئەنجام بگەن و، بیرو هۆش و هەستەکانیان بخەنە گەڕ تاوەکو بگەنە کۆتاییەکە، بەڵام ئەو چیرۆکانەی کە کۆتاییەکانیان، چارەسەرییێکی تەواویان پێشکەش بە منداڵان کردووە، بیر و هۆش و هەستی منداڵان ناخاتە کار بۆ وەدەست هێنانی ئەنجامی نێو چیرۆکەکە، لەم حاڵەتەشدا، توانای یادەوەری (**مذاكرة**) منداڵان گەشە دەکات نەوەك توانای داهێنانەکانیان.

لێرەدا بۆ نموونە چیرۆکی (دارکونکەرە)[٣٧] دەهێنینەوە، تایبەتمەند و خاسیەتەکانی (گرێچن)ی بەسەردا پراکتیزە دەکەین. چیرۆکنووس لە چیرۆکی (دارکونکەرە)دا، وردبینانە تان و پۆی رووداوەکانی چنیوە و، نوێکاری بەروخسار و شێوەی گشتی چیرۆکەکە بەخشیوە. سەرەتای (گرێ)یەکە لەم چیرۆکەدا، بە سووتانی شاخ دەست پێدەکات. وەك (گرێی یەکەم)، دواتر گوێگر یان خوێنەر لە دڵی خۆیدا چاوەڕێی دۆزینەوەی رێگاچارەیەکە، تاوەکو ئەم (گرێ - کێشەیە) دابمرکێتەوە، کەچی چیرۆکنووس زانایانە (گرێ - کێشە)ی چیرۆکەکە بەرەو لووتکە و هەڵکشان دەبات و (گرێ)ی تر دروست دەکات، ئەویش سووتانی داربەڕووەکەیە، وەك (گرێی دووەم). رەنگە گوێگر یان خوێنەر هەم دیسان دڵە کوتە بیگرێ و، چاوەڕێی چارەسەرێك بێت بۆ ئەم کێشەیەش. نەبادا سووتانی دارستانەکە و داربەڕووەکە، هێلانەی دارکونکەرەشی لێ بکەوێتەوە، بەڵام چیرۆکنووس هەر

---

[٣٧] سەلام مەنمی چیرۆکی (دارکونکەرە)، گوڵزارا چیرۆکان، لێژنەیەك لە وەزارەتی پەروەردە ئامادەی کردووە، هەولێر، ٢٠٠١، ل ٩٠.

لەگەڵ ڕۆیشتنی ڕەوتی چیرۆکەکە (گرێ)یەکی تر دروست دەکات، ئەویش سووتانی هێلانەکەی دارکونکەرەیە وەك (گرێ ی سێیەم)، مەبەستی چیرۆکنووس لێرەدا، توند کردن و گەورەکردنی (گرێ)یەکانە، تاوەکو بتوانی بەرەو لووتکە بیانبات و، بە هۆیانەوە (گرێچن)ێك دروست بکات و، خوێنەر یان گوێگر چێژ و هەستی خۆشەویستی گەورەی خۆی لەوێدا ببینێتەوە، بۆیە لێرەدا لەگەڵ توندبوونی (گرێ ـ کێشە)کان و هەڵکشانیان بەرەو لووتکە، گرێچنێك دروست دەبێت کە ئەویش (سەر گەردان بوون — بێ هێلانە بوونی دارکونکەرەیە). ئەمە لووتکەی کێشەکانە و، لێرەدا منداڵان دەیانەوێت چارەیەك بۆ ئەمە بدۆزنەوە، تاوەکو دارکونکەرە بێ جێگا و ڕێگا نەمێنێتەوە، بۆیە چیرۆکنووس شارەزایانە، بەرە بەرە (گرێچن) نەرم دەکاتەوە و دواتر کۆتایی پێ دێنێ، ئەویش بە (دۆزینەوەی هێلانەیەکی تر) لە لایەن دارکونکەرە و دڵخۆش بوونی. دەتوانین هاوکێشەکە بەم شێوەی خوارەوە دەربخەین :




((نەخشەی ڕوون کردنەوەی گرێچن و ڕووداوەکان))

أ ـ سەرەتای گرێچنەکە = ناسینی کەسایەتی دارکونکەرە بە منداڵان + کونکردنی داربەڕووێك لەلایەن دارکونکەرە + دروستکردنی هێلانە لە داربەڕووەکە + پەیداکردنی بژێوی ژیان.

ب ـ ناوەڕاستی گرێچنەکە (گرێیەکان) = سووتانی شاخ (گرێی یەکەم) + سووتانی دار بەڕووەکە (گرێی دووەم) + سووتانی هێلانەی دارکونکەرە (گرێی سێیەم).

پ ـ لووتکەی گرێچن = سەر گەردان بوون و پەڕاگەندەبوونی دارکونکەرە.

ت ـ کۆتایی گرێچن = دۆزینەوەی هێلانەیەکی تر لەلایەن دار کونکەرە و شی بوونەوەی گرێچنەکە.

## ٤- کەسایەتی Character

کەسایەتی راست و دروست، خاڵێکی ترە لە خاڵەکانی چیرۆکی باش، چیرۆکنووسی بەهرەدار ئەوەیە، کە بتوانێت بە وردی کەسایەتییەکان وێنە بکات، بە جۆرێك کە لەگەڵ رەگەز و بەشەکانی تری نێو چیرۆکەکە بیانگونجێنێت و، وەك کارەکتەری راستەقینەش بە خوێنەر یان گوێگرانی بناسێنێت. واتە خوێنەر یان گوێگر راستگۆییان تێدا ببینێتەوە و، لەگەڵیاندا هەست بە بوونی ژیان بکات. کەواتە نووسەر چەند لێزانانە وێنەی قارەمان بکێشێت، چەند هونەرمەندانە رووداو بچنێت و پەیوەندییەکی هارمۆنی لە نێوان قارەمان و رروداوەکاندا بەرجەستە بکات، هێندەش زیاتر دەتوانێت سەرکەوتن بە دەست بهێنێت. چونکە قارەمان و رووداو، وەك دوو رەگەزی گرنگ و بنچینەیی، رۆڵێکی کاریگەر لە بەرهەمهێنانی هەموو چیرۆکێکدا

دەبينين، دەتوانين كەسايەتی وا پێناسە بكەين "*كە توانـدنی كەسـانێكە لـە نەوەی ئادەميزاد ـ كە هەميشە بايەخێكی گەورەيان لە چيرۆكدا هەيـە و بـە زۆری گـرنگترين رەگـەز لـە رەگـەزەكانی چـيرۆك دادەنـرێن. هـەتا ئەگـەر گياندارِيش بن، ئەم گياندارانە هەميشە وێنەی خەڵكانێ دەنوێنن يا دەكێشن، يا لەباتی سيما مرۆڤييەكان بەكاردێن.*"[٣٨]

لە چيرۆكی منداڵاندا كەسايەتی دروست، ئەو كەسايەتييانەن كـە منـداڵان رازی بكـەن بـەوەی راسـتەقينەن يـاخود هاوتـای راسـتييەكانن. جـا ئـەو كەسـايەتييانە مـرۆڤ بـن، يـان ئـاژەڵ، يـان ڕووەك (بـێ گيانـەكان)، يـان كەسايەتی نێو ئەفسانەكان بن، ياخود هەر كەسايەتييەك بن كـە لـە جيهـانی منداڵاندا خۆشەويسـتن. كەواتـە رادەی قايـل بـوون و بڕواكردنـی منـداڵان بـۆ كەسايەتييە دروستەكان، دەوەستێتە سەر توانای دانەر لە بەخشينی ئاكاری راستەقينە لە رەفتار و كاری سەرووی هێزەكـان (الاعمـال الخارقـة) و، هێـزی لاوازی ئەم كەسايەتييانە، لە وێنە راستەقينەكانی خۆيان، بـۆ نموونـە كاتێـك نووســەر، وێنــەی كەســايەتێكی وەك (ســپايدرمان يــاخود ســوپەرمان) دەكێشـێت، رەچـاوی ئـەوە بكـات ئـەو كەسـايەتييانە، هـەمان ئـەو كـار و هەڵسوكەوتانە بكەن كە هاوتاكانيان لە ژياندا دەيكەن، واتە دەبێت لە ئاستی واقيعی خۆياندا پيشانيان بدات، ئەگەر كەسايەتييەكان خـەياڵيش بـن يـاخود ئاژەڵ و بێ گيانەكان بن، دەبێ هەڵسـوكەوتەكانيان وەك ئەوانـە بـن، كـە لـە واقيعی ژياندا روويانداوە، هەر چەندە ئەندێشـەی منـداڵيش يارمـەتی دەدات،

---

[٣٨] لـين ئۆلنبيرنـد– ليـزلی لـويس، كورتەيـەك لـە بـارەی لێكۆڵينـەوەی چـيرۆكەوە، و: سـەلاح عومەر، ل ١٢٥.

به خستنه سەر و لکاندنی چەند سیفاتێکی ئادەمیزادی بۆ جۆرەها ئاژەڵ و بێ گیانیش. بەمەش چیرۆکنووس دەتوانێ زیندوویی راستگۆیی بە کەسەکان ببەخشێت، ئەمەش دەبێتە مایەی ئەوەی کە منداڵان سۆز و خۆشەویستی لەگەڵ ئەو کەسانەدا پەیدا بکەن. خاڵێکی تر، کە چیرۆکنووس لە وێناکردنی کەسایەتییەکاندا دەبێ رەچاوی بکات ئەوەیە، دەبێت کەسایەتییەکان کاری سروشتی ئەنجام بدەن، بە جۆرێك کە لەگەڵ لۆژیك و داب و نەریتە کۆمەڵایەتییەکاندا بگونجێت، ئەو رۆڵ و کارەی کە پێی دەسپێردرێت ئەو شتانەی کە دەیڵێت، یاخود ئەو گفتوگۆیانەی لەگەڵ کەسانی تری نێو چیرۆکەکە ئەنجامی دەدات، دەبێ گشتیان لەگەڵ تەمەن و رادەی رۆشنبیری و، لە سەرووی هەمووشیانەوە لەگەڵ تایبەتکارییەکانی خۆیدا بگونجێت، واتە ***"کەسەکە بۆ ئەوەی بچێتە ئەقڵەوە دەبێ لەگەڵ تایبەتکارەکانی خۆیدا بگونجێ، کابرایەکی ترسنۆك وا لێ مەکە لە پڕێکا شێر بە گوێ بگرێ،*** چونکو ***ئەگەر شتێکی وای کرد لە راکاری دەرچوو، ئەوا تۆ لە بڕواکاری لات داوە"***[٣٩]، هەروەها هەروەك باسمان کرد، دەبێ کەسایەتییەکە لەگەڵ ژینگە و داب و نەریت و کلتووری نەتەوەکەشیدا بگونجێت. ئەگەرچی زۆر جار وابووە کە چیرۆکێکی منداڵان لە زمانێکی بێگانە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی کوردی، نەیتوانیوە ئەرك و مەبەستی تەواوی خۆی بپێکێت، چونکە ئەو ژینگە و داب و نەریت و کلتوورەی کە دانەر کەسایەتییەکەی لێ هەڵهێنجاوە، رەنگە زۆر لەگەڵ هی کوردییەکەدا جیاواز بێت.

---

[٣٩] هونەری کورتە چیرۆك نووسین، وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە: مستەفا صالح کەریم، ل ١٦.

هەروەها کەسایەتییەکانی چیرۆکی منداڵان دەبێت گونجاو و ئاشکرا بن، جیاکراوە و سەرنجڕاکێش بن، گونجاو بن واتە ئەو کارەکتەرانەی کە چیرۆکنووس هەڵیاندەبژێرێت، منداڵان حەزی لێ بکەن و، پێشکەشکردنیان بە شێوازێك بێت، کە لەگەڵ قۆناغەکانی گەشەی منداڵ و ئاستی بیر کردنەوەیاندا بگونجێت، ئاشکراش بن مەبەستمان لێی هەستپێکراو و بەرجەستەکراو بن، بە جۆرێك کە بۆ منداڵ گران نەبێت لە خەیاڵ و ئەندێشەی خۆیدا، وێنەکەی بە هەمان شێوەو خاسیەت و رەنگەکانیەوە بکێشێ، لێرەشدا مەبەستمان ئەوەنییە، کارەکتەر هەر دەبێ لە جۆری ئادەمیزاد بێ، نەخێر، چونکە زۆر جار لە چیرۆکی منداڵاندا وا دەبێ کارەکتەر، ئاژەڵ، یان بێ گیان، یاخود مۆتەکەیەکی جنۆکە بێت، بەڵام گرنگ ئەوەیە ئەم کەسایەتییەی کە رۆڵ دەگێڕێت، واقیعی و لەسەر شێوەی راستەقینە بێت، چەند سیفاتێکی ئادەمیزادی بە خۆوە هەڵگرتبێ لە قسەکردن، رەفتار، جووڵانەوە ... تاد.

هەروەها کە دەڵێین، دەبێ کەسایەتییەکان جیاکەرەوە و سەرنجڕاکێش بن، واتە نابێت ژمارەیان زۆر بێت، یان سیفاتیان لێك نزیك بێت، یاخود ناویان لێك نزیك بێت، بەڵکو دەبێ هەر کەسایەتێك، تایبەتمەندی و جیاکەرەوەی خۆی هەبێت، تاوەکو منداڵان تیکەڵاوی یەکتریان نەکەن.(٤٠) یەکێك لەو خاڵانەش کە یارمەتیدەر دەبن لە جیاکردنەوەی کەسەکان لە یەکتری و، تێکەڵاو نەبوونیان لەلای خوێنەر یان گوێگر، دانانی ناوە بۆ کەسەکان. چیرۆکنووس دەبێ مامەڵەیەکی سەردەمانە لەگەڵ ناوی

---

(٤٠) احمد نجیب، فن الکتابة للاطفال، ص ٧٨–٨٠.

کەسایەتی نێو چیرۆکەکان بکات، گەر ناوی کەسەکان لەگەڵ کەسایەتی ناو چیرۆکەکە و سەردەمەکەیدا نەگونجێ، نە شارەزایی چیرۆکنووس نیشان دەدات، هەروەك (حسێن عارف) لەم بارەیەوە دەڵێ : " *ئەو چیرۆکنووسەی، ناوی کەسەکان لەگەڵ کەسایەتی ناو چیرۆکەکە و سەردەمەکەیدا نەگونجێنێ، هەر زوو نەشارەزایی خۆیم پێ ڕائەگەیەنێ، لە بنچینەیەکی هەرە گرنگی هونەری چیرۆك نووسینا، هەڵبژاردنی ناوی کەسانی چیرۆکەکەیە.* "[٤١].

کەسایەتییەکانیش دابەش دەکرێنە سەر دوو جۆر:

## کەسایەتی پێگەیشتوو (بگۆڕ) Daynamic Character

ئەو کەسایەتییانەن، کە لەگەڵ هەڵوێستەکانی نێو چیرۆکەکە گەشە دەکەن و پەرە دەسێنن. واتە ئەو کەسایەتییانە لەگەڵ ڕەوتی چیرۆکەکە بەردەوام دەبن، هەروەها بە درێژایی ڕووداو و هەڵوێستەکانی نێو چیرۆکەکە، هەڵوێستەکانی ئەم جۆرە کەسایەتییانە بەرە بەرە لایەنی نوێیان لێ دەدۆزرێتەوە و بەدەردەکەوێت، کە ڕەنگە لە لایەن گوێگر یان خوێنەرەکە، لە سەرەتای ناسینی کەسەکەدا ڕوون و ئاشکرا نەبووبن. نووسەری بەهرەمەندیش، گەشە و پەرەسەندنی کارەکتەر بە شێوەیەکی پلەدراو سەلمێندراو دەکات، تاوەکو لەگەڵ ئەو سروشتە کە لە واقیعدا هەیەتی بگونجێت. ئەم جۆرە کەسایەتییەش پێکهاتەی تەواو نابێت، تەنها لە نزیکی

---

[٤١] حسێن عارف، ناوی کەسانی چیرۆکمان چۆن هەڵبژێرین؟ گۆڤاری (بەیان)، ژمارە(٣)، نیسانی ١٩٧٠، ل ١١.

تەواوبوونی چیرۆکەکە نەبێت، زۆربەی کەسایەتییەکان لە چیرۆکی منداڵاندا، لەم جۆرەیە، کە بە نەمری لە یادەوەری دەمێنێتەوە و لەگەڵ ویژدانی مرۆڤدا دەژێت.

## کەسایەتی جێگیر – رووکەش (نەگۆر) Static character

کەسایەتی جێگیر، ئەو کەسایەتییەیە کە هیچ گۆڕانێك لە پێکهاتەکەی نییە، هەروەك ئەوە وابێت هیچ نەجووڵێ لە ژیان لە ماوەیەکی دیاریکراوی تەمەن، واتە کەسایەتییەکی خاوەن یەك رەهەندەو، هەمیشە هەڵسوکەوتەکانی لە نێو چیرۆکدا بەیەك سروشت و رەوشت دەبینرێت. وە کاتێکیش لە چیرۆکدا دەردەکەوێت، بە شێوەی تەواو پێگەیشتوو دەردەکەوێت لە پێکهاتندا، واتە بە درێژایی قۆناغەکانی چیرۆکەکە، لەسەر یەك سروشت دەمێنێتەوە و گەشە ناکات. دەبێ لایەنە تایبەتمەندی و خودییەکانی ئەم کەسایەتییە و خاسیەتەکانی، بە روونی دیار بێت و بە جوانی وێنا کرابێ. نموونەی ئەم کەسایەتییانەش: سندباد، عەلائەددین، شێتۆکە و ئاقرۆکە، مەلای مەشهور ... هتد.

ئەمانە ناگۆڕێن و پەرەسەندنیان بەسەر نایەت، لەگەڵ ئەوەشدا کەسایەتییەکانیان لەهەر سەرچڵییەکدا، هاوشێوەی سروشتی خۆیانە، ئەم کەسایەتییانەش لە چیرۆکدا زۆر گەورە و مەزنن و ناوبانگ دەردەکەن.[٤٢]

بۆ رەگەزی (کەسایەتی)، چیرۆکی (**خاوێنی**)[٤٣] بە نموونە دەهێنینەوە، بە پێی ئەم رەگەزە پراکتیزەی دەکەین.

---

[٤٢] د. سمير عبدالوهاب احمد، قصص وحكايات الاطفال، ص ٢٠٣.هەروا: علي الحديدي، الادب وبناء الانسان، ص ١٢٣ –١٢٤.

لــەم چــیرۆکەدا نووســەر مامەڵەیــەکی زیرەکانــەی لەگــەڵ رەگــەزی (کەسایەتی)دا کردووە، ئەو تایبەتی و خەسڵەتانەی، کە دەبێ لە کەسایەتیدا هـەبن، لـە دروسـتکردنی کەسـایەتەکاندا، لەبـەر چـاوی گرتـوون. بـە پێـی بـارودۆخی ئـەو سـەردەمەی کـە منـداڵانی تێـدا دەژیـن، کەسـایەتییەکان و ناوەکانیانی هەڵبژاردوون. چیرۆکنووس چەند کەسایەتییەکی لـەم چیرۆکەدا بە کار هێناوە و دروست کردووە، کە (دانا و ساوێن) سـەرەکین و، (پیـاوێکی سەر رێگا، مامۆستا و قوتابیەکان)یش لاوەکین. چیرۆکەکە باس لەوە دەکات کەسـایەتی (دانـا)، کـە کەسـایەتییەکی پێگەیشـتووە، هەسـت بـە کـەم لێپرسینەوەیی دەکات بەرامبەر ئەرك و هەڵوێستەکانی دەوروبەری، بە ئەرکی سەرشانی نـازانێ یارمـەتی خـەڵك بـدات و ژینگەکـەی خـاوێن راگرێـت، بـەڵام (سـاوێن)ی هـاورێی، کــە ئــەویش کەسـایەتییەکی پێگەیشـتووە چــونکە هـەردووکیان واتـە (دانـا و سـاوێن) لـە گەشەسـەندن و بەردەوامیـدان لەگـەڵ ڕەوتی چیرۆکەکە بەردەوام ئامۆژگاری (دانا) دەکات، لە ئەنجامدا دەیگۆڕێت بۆ کەسێك، کە هەست بە لێپرسینەوەیی دەکات و گیـانی یارمەتیـدانی لـەلادا دروسـت دەبێـت. لـەم چـیرۆکەدا، کەسـایەتییەکان ئـەو کارانـەی، کـە پێـی هەڵدەستن، کـارێکن منـداڵان بـە ئاسـانی دەتـوانن ئـەنجامی بـدەن و لەگـەڵ توانای سروشتی واقیعی ئەواندان.

## ٥- کات و شوێن The Setting

---

[٤٣] بەهار رەشید، چـیرۆك بـۆ منـداڵان (خـاوێنی)، چـاپخانەی وەزارەتـی پـەروەردە، هـەولێر، ٢٠٠٥.

کات و شوێن دوو ڕەگەزی پێویستن، کە بەشداری لە سازدانی چیرۆکدا دەکەن، شێوەی هونەری پێ دەبەخشن چونکە " ڕووداوەکان لە بازنەیەکدا دەسووڕێنەوە، ئەویش (کات و شوێن)ە.

ئەم پەیڤانەی سەرەوە بۆ ئەوەمان دەبەن، کە بڵێین، **(کات و شوێن)** لە چیرۆکدا،پەیوەندی بە هەریەکە لە ڕووداوەکان و کەسایەت و بابەتی چیرۆکەکەشەوە هەیە و، تەنانەت کاریشیان تێ دەکات،بۆیە دەڵێین " کات و شوێن دەفرێکن (بە مانا زاراوەییەکەی)، سەرجەم کەسان و کارەسات و ڕووداو و بەسەرهاتەکان لە خۆدەگرن"[٤٤]، لەبەر گرنگی ڕەگەزی **(کات و شوێن)** لە چیرۆکدا، لە خوارەوەدا هەریەکیان بە تەنیا باس لێوە دەکەین:

## شوێن :

هەموو مرۆڤ و گیانلەبەرێك، تەنانەت بێ گیانێك، لەسەر ڕووی ئەم زەمینەدا پەیوەندییەکی توندوتۆڵی بەو شوێنەوە کە تیایدا جێگیر بووە هەیە و دەیبەستێتەوە. لێرەدا ناڵێین تیایدا ژیاوە، بەڵکو دەڵێین تیایدا جێگیر بووە، چونکە مردووەکانیش لە گۆڕستانەکاندا شوێنێکیان هەیە. زۆر مەسەلە و شتی تریش هەن، لە نێو خەیاڵەکانماندا دەخولێنەوە.

کەواتە هەموو شتێك لەسەر ڕووی ئەم زەمینەدا، حەتمەن شوێنێکیان داگیر کردووە، تەنانەت گەردیلە و ماددەکانیش، گەر باسی شتەکانی نێو ئەندێشە و خەیاڵیش بکەین، خۆ ئەمانیش وێنەیەکی شتە ڕاستی و

[٤٤] حسێن عارف، نووسینەکانم لە بواری...، ل ٢٧٨.

واقیعیەکانن، کە هەم دیسان جێگەیەکیان هەیە لەم بوونەوەرەدا، ئەمانە ڕاستییەکن ناکرێ خۆیان لێ لابدەن.

چیرۆکیش بەو پێیەی کەوا ڕەنگدانەوەی واقیعە، نابێ ڕاستییەکان فەرامۆش بکات، بۆیە چیرۆکنووس گەر بیەوێ بەرهەمەکەی سیفەتێکی زیندوو و ڕاستگۆ وەربگرێت، دەبێت شتەکانی نێو واقیعی تیایدا بەرجەستە بکات. بۆیە " ***شوێن، بریتییە لەو واقیعە کۆمەڵایەتییەی کە چیرۆکنووس هەڵی دەبژێرێت و، ڕووداوی چیرۆکەکەی تێدا دەهۆنێتەوە، یان پاڵەوانی چیرۆکەکە لەم شوێنەدا ژیان دەباتە سەر.*** "[٤٥]، هەر چەندە ئەو شوێنەی کە لە چیرۆکدا هەیە، هەمان ئەو شوێنە نییە، کە لە واقیعدا بەرچاو دەکەوێت، چونکە بە لایەنی کەمەوە شوێنی نێو چیرۆک پێکهاتەکەی وشەیە، وەلێ شوێنی ڕاستەقینەی ڕووداو لە واقیعدا بەدی دەکرێت و هەست پێ دەکرێت. بۆیە چیرۆکنووسی بەهرەدار هەمیشە هەوڵی ئەوە دەدات، بە چەند شێوەیەك و ڕێگایەك، شوێنی نێو چیرۆك لە شوێنی ڕاستەقینەکەی واقیع نزیك بکاتەوە.

" ***نووسینی چیرۆك بۆ منداڵان، گەڕانەوەی چیرۆکنووسە بۆ ژیانی منداڵی، یان ژیان لەگەڵ منداڵاندا، یان ژیانی ئەمرۆی بەشێك دەبێت لە دوو توێی ئەو ناوچانەی کە منداڵی لێ دەژێت، گەلێك جاریش نووسەر، بە خەیاڵ واقیعێك دروست دەکات، بەڵام هەر دەبێت نزیك بێت لە ژیانی منداڵان، یان***

[٤٥] نەوزاد عەلی ئەحمەد، منداڵ و ئەدەب، ل ٧٧.

***بەشێك بێت لە ژیانەکەیان، یان بەشێك بێت، لە ڕەوتی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیای ئەمڕۆ کە منداڵی لێ بژێت***"[٤٦].

کەواتە ئەو شوێنەی کە لە چیرۆکی منداڵاندا هەڵدەبژێردرێت، دەبێ لەگەڵ ئەم واقیع و ڕاستییانەی سەرەوە کە باس کران، بگونجێت و ڕاستەقینە بن و بە ڕاستگۆییانە باسیان لێوە بکرێ. چونکە " ***ئەگەر شوێنی ڕوودانی چیرۆك وەڕاست نەچێ، خوێنەر ئیمان بە ڕاستەقینە بوونی کەسایەتییەکانیش ناهێنێ، جا بۆ ئەوەی شوێنی ڕوودانی چیرۆك لە ڕوانگەی خوێنەر ڕاست بنوێنێ، یەکەم جار پێویستە خودی نووسەر ئەوەی بە چاوی، شوێنێکی ڕاستەقینە ببینێ و بە باشی بیناسێ***"[٤٧].

لەلایەکی تریشەوە، چیرۆك گەر لە ژینگەیەکی دیاریکراو ڕووبدات، دەبێ کەش و هەوای ئەو ژینگەیە نیشان بدات و، مرۆڤ وا هەست بکات لە هەمان ئەو شوێنە ڕاستەقینەیە، کە چیرۆکەکە باسی لێوە دەکات. بۆ نموونە کە باسی (لادێ) دەکات وەك شوێنێك لە چیرۆکەکەدا، کە کەسایەتییەکانی ڕۆڵی تێدا دەگێڕن و، ئاکسیۆنی[٤٨] چیرۆکەکە لەوێدا ڕوودەدات. دەبێ مرۆڤ لەوێدا هەست بە سادەیی و جوانی سروشت و دڵئارامی بکا، یاخود هەست بە هەژاری و نەخوێندەواری بکات،یانیش هەست بەو هاوکاری و دڵسۆزییە بکات، کە لە نێوان تاکەکانیدا هەیە. ئەمانەش گشتیان ڕەنگە ڕەوتی چیرۆکەکە بنوێنن، کەواتە " ژینگە، یان شوێنی ڕوودانی چیرۆك دەبێ بە چەشنێك بێ، کە ئاکسیۆنی چیرۆك لێوەشاوە و شایانی وی بێت"[٤٩].

---

[٤٦] نەوزاد عەلی ئەحمەد، منداڵ و ئەدەب، ل ٧٧-٧٨.

[٤٧] ئیبراهیم یونسی، گوڵبژێرێك لە هونەری چیرۆك نووسین، و : نەبەز جەهانگیر پور، ل ٦٦.

[٤٨] ئاکسیۆن: ڕەوتی چیرۆك.

[٤٩] ئیبراهیم یونسی، گوڵبژێرێك لە هونەری چیرۆك نووسین، و : نەبەز جەهانگیر پور، ل٦٢.

ئەم قسانەش بۆ ئەوەمان دەبات کە بڵێین، چیرۆکنووس دەبێ لە کاتی هەڵبژاردنی شوێن بۆ چیرۆکەکەی، لە ژینگەی خۆی داینەبڕێت و لە شوێنێکی نامۆ و دەستکردا داینەنێت، بۆ نموونە لە چیرۆکی منداڵانی کوردیدا کاتێك چیرۆکنووس باس لە شوێنێك دەکات، دەبێت شوێنەکە لەگەڵ ئەو داب و نەریت و ژینگەیەدا بگونجێت، کە رۆڵەی یاخود بڵێین منداڵی کوردی تێدا دەژی. کەچی هەندێ لە نووسەرانمان ئەم کارە بە هەند هەڵناگرن، بە تایبەتی لە کاتی وەرگێڕانی چیرۆکێك لە زمانانی بێگانەدا، زۆر جار هەمان ئەو شوێنانە بە کار دێنن، کە لە چیرۆکەکەدا هەبووە، لەم حاڵەتەشدا (شوێن) کارێکی ئەوتۆی ناکەوێتە سەر، تەنانەت ئەوە نەبێت رەنگە کەسەکانی لەسەر بێن و بچن، بۆیە "***هەندێ جار شوێن، شتێکە هەر ئەوەتا ڕووداوەکەی تێدا ڕوودەدات، یان ئەوەتا کەسەکانی لەسەر دێن و دەچن و، ئیتر ئەرکی دیکەی ناکەوێتە سەر، (شوێن)ی چیرۆکی کوردی ئەم بیست ساڵەی رابردوو، تاك و تەرای ئەم و ئەوی لێ دەرچێت ئەگینا لەم جۆرەن، راستە بایەخیان بە مرۆڤی کورد داوە، بەڵام لە ژینگەی خۆی دایبڕیوەو لە شوێنێکی نامۆ و دەستکردا دایناوە. گوند و شار و گەڕەك و شەقام و شۆستە و وێستگە و پاس و فەرمانگە و ئوتێل و چاخانە و مەیخانە و نەخۆشخانەی نادیار و بێ ناونیشانە و، ئەوەندەش گشتییەکە دەشێ بڵێین سیفاتی تایبەتییان تێدا نییە و تام و بۆی خاك و ئاوی خۆمان نادات***"[٥٠]، ئەم کارە لە ئەدەبی منداڵاندا، کارێکی ناڕەوایە، چونکە هەروەك لە پێشتردا ئاماژەمان پێدا، ئەو کارو کردەوانەی چیرۆکنووس باسیان لێوە دەکات، دەبێت لەگەڵ ئەو شوێن و ژینگەیەی کە تیایدا ڕوودەدەن گونجاو بن ئەگینا

---

[٥٠] زاهیر رۆژبەیانی، چیرۆکی هونەری کوردی ـ شێواز و بونیاد، ل ٢٧٦.

چـیرۆکەکە زینـدوویی و راسـتگۆییەکەی لـە دەسـت دەدا، بۆیـە دەبـێ چیرۆکنووس شوێنێکی راستەقینە هەڵبژێرێت، کـە لـە واقیعـەوە نزیـك بێـت، دەبێ زانیاری و شارەزایی تەواوی لە بـارەی ئـەم شـوێنەوە هـەبێت، چـونکە نابێت شوێنەکە دەقاودەق وەك خۆی بە کاری بێنێتەوە، بەڵکو دەبێ هەندێ گۆڕانکاری تیـادا بکـات و جوانییـەکی هونـەری پـێ ببەخشـێت، بۆیـە نابێـت هەرگیز ئەو شوێنانە هەڵبژێرێت، کە زانیاری تەواویان لەسەر نـازانێ، چـونکە لەو کاتەدا ناتوانێ هیچ گۆڕانکارییەك بەسەر ئەو شوێنەدا بێنێـت ناچـار وەك خۆی دایدەنێتە نێو دەقەکە.

لەلایەکی تریشەوە زۆر لە لێکۆڵەران، رەگەزی (شوێن) وەك ناسنامەیەکی نەتەوەیی نیشتیمانی لەقەڵەم دەدەن. چونکە " ***شـوێن لـە میللەتێکـەوە بـۆ میللەتێکی دیکـە جیـاوازە و تـەوزیفکردن و بەکارهێنانیشـی جیـاوازە و، لـە هەمان کاتیشدا، ناسـاندنی پێناسـە و مـۆرکی میللـەتان بـە دیـار دەخـات و دەناسرێنەوە***"[51] بۆیەشە زۆر جار کە چیرۆکی میللەتێك دەخوێنینەوە، ئەو مۆرکە تایبەتییەی کە میللەتەکەی پـێ ناسـراوە، لـەم چـیرۆکەدا بەرجەسـتە دەکەین.

کەواتە " شوێن هەر ئەوە نییە کە رووداوەکانی تێدا روودەدات، بەڵکو بە تونـدی کـار لـە دەروون و هەڵسـوکەوتی مـرۆڤ و کاردانـەوەو چـالاکییە سایکۆلۆجی و، سۆسیۆلۆجی و... تەنانـەت بـیرو بۆچـوون و ژیـانی رۆحـی و هەڵوێستی رۆژانە و خەون و خەیاڵیشی دەکات."[52]

---

[51] سابیر رەشید، چیرۆکی کوردی، رەخنەو لێکۆلینەوە، ل ٢٧.

[52] زاهیر رۆژبەیانی، چیرۆکی هونەری کوردی...، ل ٢٧٧.

ژینگەی ئەو شوێنەی، کە بۆ منداڵان دەست دەدا، لە قۆناغەکانی تەمەنی زوویاندا، بریتییە لە، دارستان و باخەکان، سەر دار و درەختەکان، ماڵ و قوتابخانە... تاد، چەند شوێنێکی تری سادە و ساکار، کە منداڵان دەتوانن پێشبینییان بکەن، بەڵام کاتێك شوێنەکان بۆ ئەشکەوت و چۆڵ و چیا و دەریا و رووبارەکان بگوازرێنەوە، رەنگە لەم حاڵەتەدا منداڵ پێویستی بە ئەزموونێکی فراوانتر و، تەمەنێکی عەقڵی پەرەسەندووتر بێت. لەم گۆشەیەدا چیرۆکی منداڵان لەگەڵ هی گەورانددا جیا دەبێتەوە. بەڵام منداڵ لە قۆناغەکانی تەمەنی پێگەیشتوویدا، لەبەر ئەوەی زیاتر سەرنجی بۆ (چیرۆکی واقیعی) دەچێت و کەمتر بایەخ بە چیرۆکی خەیاڵی و ئەفسانەییەکان دەدات، بۆیە بۆ ئەوە دەچێت، کە ئەو رووداوانەی لە ژیاندا روودەدەن، هەر دەبێ لە شوێن و کاتێکی دیاریکراودا روو بدەن، رووداوەکانیش پەیوەستن بە بارودۆخ و داب و نەریت و پرەنسیپە تایبەتییەکانی ئەو کات و شوێنەی، کە تیایاندا روودەدەن. پەیوەست بوونیش بە هەموو ئەمانە، شتێکی گرنگە بۆ زیندوویی چیرۆکەکە و رەگەزی هاندان و پەرۆشی تێدا زیا دەکات، چونکە ئەمە رووپۆشی دەروونی چیرۆکە، بۆیە ئەو چیرۆکەی باس لە شوێنێکی دەستنیشانکراو و دیار دەکات، دەبێت راستەقینە بێت، راستگۆیانە باسی لێوە بکات.

ژینگەی شوێن لە چیرۆکی منداڵانی کوردی لە دوای راپەریندا، زۆر جار بریتییە لە لادێ، دارستان، دار و درەخت، ماڵ و قوتابخانە، کانی و سەرچاوەکان... و چەند شوێنێکی تر، کە تایبەتمەندی نەتەوەیی میللەتی کوردی بەخۆوە گرتووە و، رەسەنایەتییەکەی پاراستووە. لەم بارەیەشەوە (غالب هلسا) لە پێشەکی کتێبی (جوانکاری شوێن) ی (باشلار) دا دەڵێ :

"هەر کارێکی ئەدەبی ئەگەر شوێنی فەرامۆش کرد، ئەوا تایبەتمەندی و ڕەسەنایەتی خۆی لە دەست دەدات، لای من شوێن تایبەتمەندی نەتەوەیی بە خۆیەوە هەڵدەگرێ و گوزارشت لە ڕوانینیش دەکات."[٥٣]

## کـــات :

کات وەك ڕەگەزێك لە ڕەگەزەکانی چیرۆکی منداڵان، ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕێت، بە هەمان شێوەی شوێن، یاخود باشتر وایە بڵێین لەگەڵ شوێن چوارچێوەیەك بۆ ڕەگەزەکانی نێو چیرۆکەکە ساز دەکات، هەروەك حسێن عارف دەڵێت : " کات و شوێن لە هونەری چیرۆکنووسیندا، بەپێی چەند دەستورێکی تایبەتی، دەبنە چوارچێوەیەك بۆ کەسان و کارەسات و ڕووداو و بەسەرهاتەکان"[٥٤]، کەواتە ئاکسیۆنی چیرۆك، بەپێی ماوە ناتوانێ بەڕێوە بچێ، بۆیە لە هەموو چیرۆکێکدا ڕووداوەکان لە ماوەیەکی دیاریکراو ڕوودەدەن. کەواتە ژینگەی کات : " بریتییە لەو مەودایە کاتییەی کە ڕووداوەکانی چیرۆك تیایدا ڕوودەدەن"[٥٥].

کاتەکانیش زۆر جار کورتن، وەك ئەوەی سەعاتێکن یاخود ڕۆژێك یان چەند ڕۆژێکن، لەوانەیە خۆی بگەیەنێتە هەفتەیەکیش، زۆر جاریش کاتەکان دوور و درێژ دەبن، وەك ئەوەی خۆیان لە قەرەی مانگێك، یان وەرزێك یاخود ساڵێك و لەوانەیە زیاتر بدەن. هەروەها کاتەکان لە نێوان دەمەکانی (ڕابردوو، ئێستا، داهاتوو)دا دەخولێنەوە.

---

[٥٣] غاستون باشلار، جماليات المكان، ترجمة غالب هلسا، ص٨.

[٥٤] حسێن عارف، نووسینەکانم لە بواری ڕەخنە و لێکۆڵینەوەدا، ل ٢٧٨.

[٥٥] محمد عبدالرزاق ابراهيم ويح واخرون، ثقافة الاطفال، ص٣٥٠.

کـاتیش سـەبارەت بـە منـداڵ و چـیرۆکەکانیان، تـا رادەیـەك جیـاوازی بەخۆیـەوە دەبینـێ، چـونکە منـداڵ لـە قۆنـاغی سـاڵەکانی سـەرەتاییدا، تێگەیشتنی تەواو و ئاشکرای نییە بۆ کاتەکان. کەچی لەوانەیـە هەسـتکردنی بۆ رەگەزی شوێنەکان تۆزێك باشتر بێت، بۆیـە چـیرۆك گێڕەوەکـان زۆر جـار دەستەواژەی (هەبوو نەبوو، لە دێر زەمانان، کەس لە خوای گەورەتر نـەبوو) بـەکاردەهێنن، لێـرەدا راسـتە دەسـتەواژەکە گوزارشـت لـە کـاتی رابـردوو دەکات، بەڵام بە بێ ئەوەی دیاریکردنێکی تەواوی ئەم رابردووە بکات. بـەڵام منداڵان لـە سـەرەتای قۆنـاغی تەمەنیانـدا، قۆنـاغی (٣-٦) سـاڵان دەتـوانن جیاوازی لە نێوان شەو و رۆژدا بکەن، دواتر جیاوازی لە نێوان وشەی ئەمڕۆ و بـەیانی (سـبەینێ)دا بکـەن، رەنگـە ئەمـە بەرەبـەرە بـڕوات تـاوەکو دەگاتـە ڕۆژەکانی هەفتە، بەڵام ڕەنگە نـەتوانێ مانـای سـەردەم و سـاڵەکان بزانێـت، ئەم تێگەیشتنەش بە پێی گەشەکردنی قۆناغی تەمەنی زیاد دەکات. بۆیە بـە شـێوەیەکی گشـتی چیرۆکنووسـی لێهـاتوو ئـەو کەسـەیە، کـە بتـوانێ هاوسـەنگییەك لـە نێـوان پێداویسـتییە هونەرییـەکانی چـیرۆکی منـداڵان و، تواناکانی عەقڵی، رادەی وەرگرتنـی دا بکـات، بەڕەچـاو کردنـی ئـەو قۆناغـە تەمەنییەی کە بۆی دەنووسێ و، ئەو بابەت و رەگەزەش کە لـە چـیرۆکەکەدا بە کاری دێنێ، بۆیە منداڵانیش لەگـەڵ بـەرەو پـێش چـوون و گەشەسـەندنی قۆناغی تەمەنیان، زیاتر بەرەو شتی واقیعی هەنگاو دەنـێن و دەتـوانن دەرك بەوە بکەن کە رووداوەکانی نێو چیرۆك بە بێ کات و شـوێن روونـادەن. بۆیـە ئەو چیرۆکەی باس لە سەردەمێکی دیاریکراو یان کاتێکی دیـاریکراو دەکـات، دەبێـت راستگۆیانە باسـی لێـوە بکـات و راسـتەقینە بێـت، هـەروەها ئەگـەر کاتەکان درێژ خایەن بن، وەکو ئەوەی خۆیـان لـە وەرزێـك یـا سـاڵێك یـاخود

زیـاتر بـدەن، دەبـێ لـەم حاڵەتـەدا چـیرۆکنووس ئاگـاداری گشـت ئـەو گۆڕانکارییانە بێت، کە لەو ماوەیـە دوور و درێژانـە بەسـەر رووداو و کەسـانی نێو چیرۆکەکەدا دێن. هەروەها گەر بۆ نموونە رووداوەکان لە شەو رووبـدەن، دەبێـت مـرۆڤ تیایـدا هەسـت بـە دڵـەڕاوکێ و تـرس و چـاوەڕوانی و خـەیاڵات بکات، کەوا لە ئەندێشەی مرۆڤدا دەخولێتەوە وێنایان دەکات، کەوا لە پشـت ئەم تاریکییە، چەند جیهانێکی تر هەیە، کە گیانەوەری تر تیایدا دەژین.

لە چیرۆکی (**دیاری و سەردان**)[٥٦]، چیرۆکنووس مامەڵەیـەکی زیرەکانـەی لەگەڵ رەگەزی (کات و شوێن) کردووە و، بـە ئەنـدازەی پێویسـتیی رووداو و هەڵوێستی کەسایەتی و پاڵەوانی چیرۆکەکە کەڵکی لێ وەرگرتوون.

لـە سـەرەتایی چـیرۆکەکەدا نووسـەر ئامـاژە بـە شـوێنەکە دەکـات کـە (دارسـتان)ە و دەڵێـت :(**لـە دارسـتانێکدا کۆمـەڵێك گیانلەبـەر دەژیـان**). چیرۆکنووس زانایانە ئەو شوێنەی هەڵبژاردووە کە (دارستان)ە، ئـەو کـەش و هەوایـەی لـە چـیرۆکەکەدا بـە شـوێنەکەی بەخشـیوە هـەمان ئـەو کـەش و هەوایەیـە کـە لـە واقیعـدا لـە ژینگـەی دارسـتاندا بـەدی دەکرێـت. هـەروەها شوێنەکە لەگەڵ سروشتی واقعی نەتەوەی کورددا دەگونجێت و سەبارەت بـە منداڵانیش شوێنێکی نامۆ نییە، تام و بۆی خـاك و ئـاوی میللـەتی کـوردی لێ دێت.

لە جێگەیەکی تـردا چـیرۆکنووس دەڵـێ :(**کـە ئـەوان رۆیشـتن، مـەیموون چووە سەر دار گوێزێك و سەبەتەیەکی پڕ کرد لە گوێز، ئینجا خۆی گەیاندە**

[٥٦] عەلی حەمە رەشید بەرزنجی، دیاری و سەردان (دە چـیرۆك بـۆ منـدالان)، سـلێمانی، ٢٠٠٤، ل١٧-١٨.

**ماڵی سمۆره**). لێرەشدا چیرۆکنووس زانایانـه دوو شـوێنی تـری بـه منـداڵان ئاشـنا کـردووه و بـیر و هۆشـی خسـتوونەته سـەر، شـوێنەکانیش (سـەر دار گوێز، ماڵی سمۆره)ن. ئەمەش شتێکی ئاسایيه چونکه (سەر دار و درەخـت، ماڵ) دوو شوێنن که بوونیان زۆره له نێو چیرۆکی منداڵانی کوردی، سەبارەت به منداڵانیش شوێنی نامۆ نین.

**کات:** هـەر لـه هـەمان چـیرۆکدا (**دیـاری و سـەردان**)، چـیرۆکنووس وەك رەگەزێك له رەگەزەکانی بینای چیرۆك باسی (کـات)ی کـردووه، هـەروەك لـه شوێنێکی چیرۆکەکەدا دەڵـێ:(**بـۆ بـەیانی هـەموو لـه مـاڵی ورچ کۆبوونـەوه**) یاخود دەڵێ:( **بۆ رۆژی دواتر له گەرمەی یاریکردندا، بەردێك کەوت به قاچی کەروێشکه سپی**). به گشتی کاتەکانی ئەم چیرۆکه رابردوون.

## ٦- گێڕانەوه و گفتوگۆ و وەسف

چیرۆکنووسـی بـاش بـۆ ئـەوەی رووداوەکـان بەیەکـەوه ببەسـتێتەوه و کارەکتەرەکانی ئاشکرا بکات، لایەنه هونەرییەکانی دەق پێکەوه گـرێ بـدا و جۆره سیحرێك به چیرۆکەکەی ببەخشێت، تا لـه رێگەیـەوه گـوێگر بـۆ خـۆی (چیرۆکەکه) کێش بکـات، لـه سـەرووی هەمووشـیانەوه جۆرێـك لـه متمانـه و باوەڕ به بەرامبەر ببەخشێت، دەبێـت ئـەم رەگەزانـەی سـەرەوه (گێڕانـەوه، گفتوگـۆ، وەسـف) لـه چـیرۆکەکەیدا بەرجەسـته بکـات، کـه تـا ڕادەیـەك لـه ئەرکەکانیان دەتوانین بڵێین کەمێك لێك نزیکی و خزمایەتییان هەیه.

**گێڕانەوه Narrative** : یەکێکه له بونیاده سەرەکییەکانی دەق و، به شـێوەیەکی ئێسـتاتیکی سـەرجەمی دەقەکـه بـەڕێوه دەبـات، لایەنـه هونەرییـەکانی دیکـه پێکـەوه گـرێ دەدات، ئەمـه جگـه لـەوەی رووداو و

هەڵوێستەکان لە وێنەیەکی واقیعی بۆ وێنەیەکی زمانەوانی دەگوازێتەوە، کە بە جۆرێك بەرامبەر (گوێگر یان خوێنەر) وا هەست بکات ئەم رووداو و هەڵوێستانە دەبینێت و لەبەر چاویدایە. وەزیفەی گێڕانەوەش هەر تەنها ئەوە نییە، بەڵکو دەکرێت گێڕانەوە خاوەن سیحرێك بێت بۆ پەلکێشکردنی خوێنەر بە دوای ئەو بابەتەی دەیخاتە روو.[٥٧] لە چیرۆکی منداڵاندا دانەر بە هۆی رەگەزی گێڕانەوە، دەتوانێ کەسەکان و رووداوەکان بە شێوازێکی راستگۆیانە و، لە چوارچێوەیەکی هونەری جوانکاری بە منداڵان بناسێنێت و سەرنجی منداڵان بۆ چیرۆکەکەی رابکێشێت، چونکە منداڵانیش لە نێو خۆیاندا ئەو کارانەی کە کردوویانە و ئەو شتانەی بینیویانە، بە گێڕانەوە بۆ یەکتری باس دەکەن. بۆیە لە چیرۆکدا رەگەزی گێڕانەوە تام و چێژی تایبەتی خۆی هەیە بۆ منداڵان.

**وەسف :** ئەو رووداوانە روونتر دەکاتەوە کەوا خوێنەر لە خەیاڵیدا لێکیان دەداتەوە، وا لە منداڵ دەکات وێنەکە بە جۆرێك ببینێت و خەیاڵی بکات وەك ئەوە وابێت کە سەیری دەکات. ئەدیبیش لە گێڕانەوەی چیرۆکدا تەنها بە گێڕانەوەی چیرۆکەکان واز ناهێنێ، بەڵکو لە هەمان کاتدا هەوڵ دەدات وێنایان بکات. لە واقیعدا کە خوێنەر لە خوێندنەوەی چیرۆکێك، یاخود گوێگرێك لە گوێگرتنی چیرۆکێك دەبێتەوە، بە زۆری پارچە وەسفییەکانی بیر دێتەوە، حەز دەکات جارێکی تر بگەڕێتەوە سەریان.

***" وەسفیش لە چیرۆکدا وەك هەر یەکێك لە رەگەزەکانی دی بۆ رازاندنەوە نییە، بەڵکو مەبەستێکی دیاریکراو دەگەیەنێت و بەشێکە لە***

---

[٥٧] سیامەند هادی، دوو چیرۆکنووس لەبەردەم پێنج پرسیاردا، گ. ئایندە، ژ (٤٩)، ل١٠٢.

*ڕووداو، پێویستە ئەو شتە وەسفکراوە لە چاوی نووسەرەکەیەوە تەماشا نەکرێت، بەڵکو لە چاوی کەسایەتییەکەوە ببینرێت*."[٥٨]

بۆ گێڕانەوەی چیرۆکیش سێ ڕێگا هەن، ئەوانیش ئەمانەی خوارەوەن:

١- **ڕێگـــای ڕاســـتەوخۆ:** لێـــرەدا دانـــەر لـــە دەرەوەی ڕووداوەکـــان دەوەستێت، کاتێك باس لەو بەسەر هات و ڕووداوانە دەکات کە بەسەر کەسانی تردا هاتوون. ئەم ڕێگایەش لە هەموو ڕێگایەکانی تر بەربڵاوترە و، لەگەڵ منداڵاندا گونجاوە، بە جیاوازی قۆناغەکانی گەشەیان، بەتایبەتیش بۆ قۆناغی زوو، چونکە ڕووداو و وێنەکان لە زەینی منداڵدا نزیك دەکاتەوە لە ڕێگەی ئەو وەسف و گێڕانەوانەدا.

٢- **ڕێگـــای خودگێڕانـــەوە:** ڕووداوەکـــان لەســـەر زمـــانی قســـەکەر دەگێڕدرێنەوە، لە زۆربەی بارەکاندا ئەو پاڵەوانی چیرۆکەکەیە.

٣- **ڕێگـــای دیکۆمێنتـــەکان:** لێـــرەدا دانـــەر پشـــت بـــە چـــەند وتـــار و یادەوەرییەکی ڕۆژانە و شتی تر دەبەستێت و، دەیانکاتە کەرەسەی دروست کردنی چیرۆکەکەی.

کەواتــە بــۆ گێڕانــەوەی چــیرۆکیش، بــە زۆری ســوود لــە دوو ڕانــاو وەردەگیرێت ئەوانیش:

١- **کەســی ســێیەمی تــاك (ئــەو):** بــۆ نموونــە لــە چــیرۆکی (**ســـەلکە شەیتانۆکە**)[٥٩]، نووسەر دەڵێ: (زینا، منـاڵێکی زرنـگ و پـاك و خـاوێن بـوو، هەرگیز بە تەنها نەدەچووە دەرەوە لـە مـاڵ، کـە لەگـەڵ دایـك و باوکیشـیدا

---

[٥٨] رشاد رشدي، فن القصة القصيرة، ص١٠٠.

[٥٩] عزیز ئالانی، مەدالیا، (٧ کورتە چیرۆکی فێرکاری بۆ منداڵان)، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل١٦-٢٤.

دەچووە دەرەوە، هەر چی دەیبینی دەکەوتە پرسیارکردن لە دایە و بابە، زۆربەی وەڵامەکانیشی لەبەر دەکرد و کاتێك دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە پەڕاوێکی دانابوو وەڵامەکانی تێدا دەنووسییەوە، بەم جۆرە رۆژ بە رۆژ زیرەکتر دەبوو. کاتەکانی رۆژگاری دابەش کردبوو بەسەر یاری و کۆشش و خوێندنەوە و سەیری تەلەفزیۆن کردن.. هەروەها نووسەر لە جێگایەکی تر دەڵێت: **زیبا لە پێش میوانەکان دەستی برد بۆ پەرداخە ئاوەکان، کاتێك دایکی زیبا ئاوی دەگێڕا، زیبا هێندە بە خێرایی پەلاماری دا پەرداخەکانی لە دەستی دایکی قلّپ کردەوە. ئاوەکە رژا.. پەرداخەکان شکان.. زیبا لە ترسان رایکردە دەرەوە. دایکی زیبا خەمی خوارد.. تەریق بووەوە. لەبەر رێزی میوانەکان دایکی زیبا تووڕە نەبوو، هیچی نەگوت، بەڵکو بە ناچاری و هەناسە ساردی پەرداخە شکاوەکانی کۆکردەوە...)**

بەم شێوەیە چیرۆکنووس بە بەکارهێنانی ڕاناوی کەسی سێیەمی تاك،وەسفی حاڵەتی (زیبا) و (دایکی زیبا) دەکات و، رووداوەکان دەخاتە روو.

**٢- کەسی یەکەمی تاك (من):** ئەم راناوەش کە لە چیرۆکدا بە کاردێت، دەبێ نووسەر هەوڵ بدات لەسەر زمانی خۆی بەکاری نەهێنێت. -هەروەك باسمان کرد- چونکە "گێڕانەوە لە کاتی خستنە رووی دەقدا یەکێك لەو ئەرکانەی کە پێویستە لە ئەستۆ بگرێت راگرتنی ئاستی خۆیی و ئاگادار بوون لەو پێکهاتە هونەرییەی دەکەوێتە نێو خودی گێڕانەوەکە"[٦٠]، وتە کە خوێنەر یان گوێگر گوێ بیستی دەقەکە دەبێت، هەست بەوە نەکات کە

---

[٦٠] سیامەند هادی، دوو چیرۆکنووس لەبەردەم پێنج پرسیاردا، ئاینده، ژ(٤٩)، ل١٠٢.

خاوەنی ئەو دەقە ئاگاداری ئەم گێڕانەوەیە، ئەمـەش دەبێتـە خـاڵی سـەرنج ڕاکێشانی بەرامبەر. بۆیـە وا چـاکە لـە کـاتی گێڕانـەوەدا کـە ڕانـاوی کەسـی یەکەم بە کار دێت، دەبێ بە دوو شێوە بە کار بێت:

لەسـەر زمـانی قارەمـانی چـیرۆکەکە. یـاخود لەسـەر زمـانی یـەکێك لـە کەسایەتییە لاوەکییەکانی چیرۆکەکە.

بۆنموونە لە چیرۆکی (**سەگی پیاوانی ئەشـکەوت**)[٦١] دانـەر زۆر زانایانـە لەسەر زمانی (سەگەکە) ڕووداوەکانی نێـو چـیرۆکەکە دەگێڕێتـەوە و دەڵـێ: **(من سەگی نێوی ران بووم، لەگـەڵ شـوانی دڵ نـەرم و چـاك، لـە نێـوی دێ رەقیم بوون، رانمان دەبردە لەوەڕ، لە هاوین و لە زستان، لە بەهار و پایزان، لەگەڵ شوان دەردەچووم، خواناس و بە رەحـم و پـاك، دەچـووینە کێـوێکی بەرز، بەرزتر لە دەریا و لە ئەرز، لەسەر سنگی ئەو کێوە، ئەشکەوتێ لە نێو دێوە، دەبینراو دیار بوو، رانمان دەبرد بۆ ئەوێ، دەمان لەوەڕاند لەوێ، جار بە جار شوانەکە دوور دەکەوت لە رانەکە، هەڵدەکشا بـۆ ئەشـکەوت، منـیش جارێ بە رێککەوت شوانەکەم لە ئەشـکەوت دی، لەگـەڵ چـەند لاوێکـی دی، لەسەر سوجدە وەچۆکدا دەپاڕانەوە لە خـودا، بۆیـە منـیش مامـەوە، لـەوێ نەجووڵامەوە...تاد.)**

هەر چەند شێوازی گێڕانەوە لە چیرۆکی منداڵاندا، شێوازێکی زاڵەو زۆر بە کـار دەهێنرێـت، بـەڵام بـۆ ئـەوەی منـداڵ لـە گـوێگرتنی یـان خوێندنـەوەی چـیرۆکەکە بێـزار نـەبێ، وا چـاکترە لەگـەڵ شـێوازی گێڕانـەوە، شـێوازی گفتوگۆش بە کار بهێنرێت.

---

[٦١] مەرسووم گەشبین، سەگی پیاوانی ئەشـکەوت (زنجـیرە چـیرۆکی گیانلەبـەران لـە قورئـانی پیرۆزدا بۆ منداڵان)، هەولێر، ٢٠٠٥، ل١٠-١٣.

**گفتوگۆ:** بریتییه لەو قسه و وتووێژه جۆراوجۆرانەی، کـه کارەکتـەرەکان له نێوان خۆیانـدا ئـاڵوگۆڕی دەکـەن. بـه هۆکـارێکی گـرنگ دەژمێردرێـت بـۆ سـەرکەوتنی چـیرۆك، چـونکه بنەمایـەکی سـەرەکییه لـه بنـەماکانی بینـای هونەری چیرۆك، هەستێکی زیندوو دەداته چیرۆکەکە، ئەویش به هۆی ئەوەی یارمـەتی خوێنـەر دەدات بـۆ هەسـتکردنی بـه خۆشـی و، لـه بەدواداچـوون و بێزاری دووری دەخاتەوە. هەروەها یارمەتیدەرێکه بـۆ بـەدیهێنانی سـۆزداری له نێوان چیرۆکخوان و گوێگر و خوێنەردا. بەم جۆرەش چیرۆکەکه لـه دیـدی منداڵاندا زیاتر واقیعی دیار دەبێـت. هـەروەها گفتوگـۆ یارمـەتی دەرخسـتنی بیرۆکـەی چـیرۆك دەدات و رووداوەکـانی بەرجەسـته دەکـات و گوزارشـت لـه ناخی کارەکتەرەکان دەکات، واته یەکێکه لەو شێوازانەی که نووسەر پشـتی پـێ دەبەسـتێت بـۆ وێنەکێشـانی کارەکتـەرەکانی، واتـه یارمەتیدەرێکـه بـۆ نووسـەر تـاوەکو بـه روونـی بتـوانێ کارەکتـەرەکان وێنـا بکـات، چـونکه لـه سەرەتادا کارەکتەرەکان زۆر روون و ئاشکرا نین بەڵام له میانەی ئەو گفتوگۆ و وتووێژانـەی، کـه دەیکـەن لـه چـیرۆکدا زیـاتر ئاشـکرا دەبـن. سـەرەڕای ئەمانەش گفتوگۆ زیـاتر سـەرنجی منـداڵ بـۆ چـیرۆك رادەکێشـێ، کاتێـك کـه منداڵ دەبینێ کارەکتەرەکانی چیرۆکەکه لەگەڵ یـەکتردا گفتوگـۆ و ململانـێ دەکەن، هەروەك چۆن ئەمه له هەڵوێستەکانی ژیانا له نێـوان کەسـەکاندا روو دەدات، منداڵانیش گوێ دەدەنه کاردانەوەیان له بۆ گفتوگۆ، چـیرۆکی (**کێـز خاتوین**)[٦٢] دەکەینه نموونـه، ئـەم چـیرۆکه لـه سـەرەتا تـا کۆتـایی گشـتی گفتوگـۆ و وتووێـژ کردنـه لـه نێـوان ئەکتـەرەکانی چـیرۆکەکە، هـەروەك لـه

---

[٦٢] موئەیەد تەیب، کێز خاتوین، چاپخانا وەزارەتا پەروەردێ، دهۆکن ٢٠٠٤، ل٦.

شـوێنێکی چـیرۆکەکەدا گاوانێـك لەگـەڵ کێـز خـاتووین دەکەونـە گفتوگـۆ و دەڵێت:

**گاڤانی ژی گۆتیێ:**

**– تو ژ کیڤە دهێی، دێ کیڤە چی ؟**

**کێزێ گۆتیێ:**

**– دێ چم بۆ خۆ شوی کەم**

**گاڤانێ گۆتیێ:**

**– تو شوی ب من ناکەی ؟**

**کێزێ گۆتیێ:**

**– ئەگەر کەربێت تە ڤەبوون دێ من ب چ قوتی؟**

**گاڤانێ توپزێ خۆ هەلگرت و گۆت:**

**– من ژڤی پێڤەتر نینە ئەز تە پێ بقوتم.**

**کێزێ گۆتیێ:**

**ـ دێ زوی ژ ڤێرە هەڕە !**

**ـ زاڵمۆ ما ئەز گامێشم دێ من ب وی تۆپزی قوتی ؟**

ئـەو گفتوگۆیـەش کـە چـیرۆکنووس بـە کاریـان دەهێنێـت، دەبـێ بـە شێوازێکی جوان بخرێتە روو، بە جۆرێك کە لەگەڵ تەمەن و عـەقڵی منداڵانـدا بگونجێت و، وشە و دەستەواژەی قورسیان تیا نەبێت کە ببنە مایەی ئـەوەی منـداڵان لێـی تـێ نەگـەن و تووشـی بێـزاری بـبن. لەگـەڵ ئەمـەش دەبـێ گفتوگۆیەکان لە هەموو لایەنێکەوە سوود بە منداڵان بگەیێنێت.

## ٧- شێوازی خستنه روو

پـاش ئـەوەی چـیرۆکنووس بیرۆکەیـەکی لـەلادا دروسـت بـوو، کۆمـەڵێك روودانـی بۆسـاز دا، چـەند کەسـانێکی دیاریکراویشـی بـۆ پێکهێنـان، ئینجـا هەڵدەستێت بە خستنە رووی هەموو ئەمانە بە شێوازێکی گونجاو و رێك، لـە چوارچێوەیەکی ئەدەبی هونەریدا.

کەواتـە شـێوازی نووسـەر: "***بریتییـە لـە هەڵبـژاردنی ئـەو بـۆ وشـە و پێکهاتـەکانی لـە دروسـتکردنی رسـتە و برگـەدا بـە شـێوەیەکی دیـاریکراو، تاوەکو ئەدەبێك پێشکەشی خوێنەر بکات . شێوازی چیرۆکنووسـی باشـیش بریتییـە لـە شـێوازی گرێچـنی گونجـاو و رێـك لەگـەڵ بابـەت و بیرۆکەکـە و کارەکتەرەکانی نێو چیرۆکەکە. واتە چیرۆکنووسەکە کەش و هـەوای چـیرۆك دروسـت دەکـات و هەسـت و سـۆزەکان نیشـان دەدات.***"[٦٣] ، کەواتـە چـیرۆکنووس لـە رێگـەی ئـەو شـێوازەی هەیـەتی، بیرۆکەکـەی و وێنـەکردنی کارەکتـەر و رووداوەکـان دەردەخـا. لەمەشـدا دەبـێ چیرۆکنووسـی منـداڵان گشت شارەزایی خۆی بەکار بێنێ، تـا ئـەوەی پێشکەشـیان دەکـات گونجـاو بێـت لەگـەڵ فەرهـەنگی زمانـەوانییان و قۆنـاغی تەمـەنیان، چـونکە منـداڵ ناتوانێ  لە مانای هەندێ وشە تێبگات ئەگـەر لـە ئاسـتی تێگەیشـتنی ئـەودا نەبێ،  بۆیە کە بێت، واتـە دەبـێ چـیرۆکنووس پـێش ئـەوەی دەسـت بداتـە نووسین پرسیار لـە خـۆی بکـات، ئـاخۆ بـۆ کـێ دەنووسـێ؟ ئەوانـەی بۆیـان دەنووسێ تەمەنیان چەندە؟ تاوەکو ئاگاداری ئەو تایبەتمەندی و خاسیەتانە بێت کە هەر قۆناغێك لـە قۆناغـەکانی منـداڵ هەیـەتی. ئـەگینا ئـەو هـەرگیز

---

[٦٣] علی الحدیدي، الادب و بناء الانسان، ص١٢٤.

نـاتوانیٚ بابـەت و کارەکتـەر و زمـان و شـێوازێکی گونجـاو بـەکار بهێنێـت تـا منداڵەکە بتوانیٚ سوودی لیٚ وەربگرێت.

ئـەو شـێوازەی لـە چـیرۆکەکان بـە کـار دەهێنرێـت بـە باشـترین هۆکـار دادەنرێت کـە لـە رێگایانـەوە نـاوەرۆکی جـۆراو جـۆر پێشـکەش بـە منـداڵان دەکرێت. بۆیە پێویستە لەسەر چیرۆکنووس لـە پـێش هـەموو شـتێك هـەوڵی ئەوە بدات ئەو وشەو گوتانە بە کار بێنێت کە سادە و ساکارن و منداڵ لێیان تیٚ دەگات، واتە بەکارهێنانی وشە بەرجەستەکان زیـاتر لـە وشـە ڕووتـەکان. مەبەستمان لە وشە بەرجەستەکان ئـەو وشـەو دەسـتەواژانەن کـە منـداڵ لـە رێگـەی یـەکێك لـە هەسـتەکانیەوە (بیـنین، بیسـتن، جووڵـە، دەسـتلێدان، بـۆنکردن) دەتـوانیٚ راڤـەیان بـۆ بکـات چـونکە منـداڵان زیـاتر لـە رێگـەی هەسـتەکانیانەوە دەتـوانن جیهـانی دەوروبـەری خۆیـان بناسـن، لـەوەی لـە رێگەی وشەکانەوە بیناسن.[٦٤]

ئەوەی بۆ منداڵ دەنووسێت، دەبێـت رەچـاوی کـورتی وشـەکان بکـات و هەوڵ بدات پیتە ئاسانەکان زیاتر بە کار بهێنێـت واتـە ئـەو پیتانـەی کـە زۆر بـەکار هـاتوون و ئاسـان دەنووسـرێن و، نزیـك بـن لـە تێگەیشـتنی منـداڵ، سەبارەت بە دەستەواژەکانیش دەبێت بە شـێوەیەك هەڵبـژێردرێن کـەوا ئـەو منداڵـەی گـوێی لێیـەتی، یـاخود ئـەوەی سـەرەتایە لـە خوێندنـەوەدا لـە ناوەڕۆکەکـەی تێبگـات و لـە ئاسـتی وان بـەرزتر نـەبێت، بـۆ نموونـە دەستەواژەیەکی وەك (بـە دوای کـڵاوی بـابردوو کـەوتبوو)، یـان هاوشـێوەی ئەمانە بۆ منداڵان بە کار نەهێنێت، چونکە ئەم جـۆرە دەسـتەواژانە سـەر لـە

---

[٦٤] یعقوب الشارونی، الفروق الاساسیة بین کتب الاطفال..، ص٢١٨.

منداڵ دەشێوێنن و منداڵ تووشی بێزاری دەکەن. کەواتە نابێ چیرۆکنووسـن وشـە و دەسـتەواژەیەك یـاخود باشـتر وایـە بڵـێین زمانێـك بـەکاربێنێت کـە شێوازی ڕەوانبێژی پێوە دیار بێت. هەروەها چیرۆکنووس هەوڵبـدات هەنـدێ جار زاراوە و دەستەواژەی نوێ دووبارە بکاتەوە، چـونکە دووبـارە کردنـەوە لـە چـیرۆکی منداڵانـدا کاریگـەری زیـاتر دەبێـت و ماناکەشـی زیـاتر ڕوون دەکاتەوە، بە تایبەتی ئەوانەی کە درەنگ تێ دەگەن.

کەواتە چیرۆکنووسی منداڵان دەبێت ئاگاداری دەوروبەری منداڵان بێـت و ئەو شتانەی کە بۆی دەنووسێت لەگەڵ ژینگە و جیهـانی منداڵانـدا بگونجێـت و، لەگەڵ ئەوەشدا نابێت لـە فەرهـەنگی زمانـەوانی ئـەوان دەربچـێت، بـەڵکو زمانێك بەکار بێنێـت نزیـك بێـت لـەو زمانـەی کـە ڕۆژانـە منداڵەکـە بـە کـاری دێنێت، لێرەدا ناڵێین زمانی چیرۆکەکە کتومت زمـانی منداڵەکـە بێـت چـونکە ئەگـەر وابێـت منداڵەکـە فەرهـەنگی زمانـەوانی بـەرفراوان نابێـت و، هـیچ پەرسەندنێك لە زمانەکەی ڕوو نادات و سوود لە زمانی چیرۆك وەرناگرێ.

شێوازی نووسین لە چیرۆکی منداڵانـدا، هـەروەك نووسـەر (نجیـب احمـد) بـۆی دەچـێت، دەبـێ ڕوونـی و جـوانی و هێـزی تێـدا بێـت، بـەم شـێوەی خوارەوە:

**١- ڕوونی مانا:** واتە لە توانای منداڵـدا هـەبێت، لـە زاراوەو دەسـتەواژەو بیرۆکەکان تێ بگات. واتە نابێت وشەی نەبیستراو و جووت واتـا بـە کاربێـت، هــەروەها نــابێ ڕســتەی درێــژ و پەنـد ناواخنـەکراو و تێهەڵکێشـراوی تیـا ئاخێنرابێ، ئەمەش بەرجەستە دەبێت گەر وشەکان سانا و ڕوون بن و دووربن لە جوانناسی و ڕەوانبێژی.

٢- **هێزی شێواز:** ئەمە خۆی دەنوێنێ لە وشیار کردنەوەی هەستەکانی منداڵ و وروژاندن و سەرنج ڕاکێشانیان، تاوەکو لەگەڵ چیرۆکەکەدا تێکەڵ بن و کاری تێبکەن، لە ڕێگەی گواستنەوەی هەڵچوونەکانی نووسەر لە میانەی کارەکەی و دروستکردنی وێنە هەستی و زەینییەکان (الصور الحسية والذهنية).

٣- **جوانی شێواز:** واتە نووسینی ڕستە و دەستەواژەکانە بە ڕیتمێکی گونجاو لەگەڵ دەنگ و مۆسیقادا.

## ئەنجام

أ ـ سەرەتای سەرهەڵدانی چیرۆك و ئەدەبی منداڵان لە کۆنەوە ئێستاشی لەگەڵدا بێ، لەلای کوردو هەموو میللەتانی جیهان لەسەر بناغەی ئەفسانەو ئەدەبی میللی بنیات نراوە، واتا نووسەرانی ئەم بوارە بەرهەمە ئەفسانەیی و میللیەکانییان کردووە بە هەوێنێك بۆ داڕشتن و سازدانی ئەو ئەدەبەی کە ناوی لێنراوە ئەدەبی منداڵان. گرنگترین ئەو پاشماوە ئەدەبییە میللیی و ئەفسانەییانەش کەوا نووسەرە یەکەمینەکانی ئەدەبی منداڵان لە زۆربەی وڵاتانی جیهان سوودیان لێ وەرگرتبێ، بریتین لە هەقایەتەکانی بانجاتنترا، کۆمەڵە چیرۆکە ئەفسانەییەکانی (ئیسۆپ)، هەقایەتەکانی (کەلیلە و دیمنە)، چیرۆکەکانی هەزارو یەك شەوە...تد.

ب ـ زۆربەی ئەو نووسەرو ڕووناکبیرانەی، کە لە بواری ئەدەبی منداڵانی کوردیدا کاریان کردووە، ساڵانی حەفتاکان بە سەردەمی زێڕینی ئەدەبی منداڵانی کورد دادەنێن، بە تایبەتی دوای ١١ی ئازاری ١٩٧٠ چاپەمەنی

منداڵان بە شێوەیەکی بەرفراوان رووی لە زیـادبوون کـرد و زیـاتریش بایـەخی پێدرا، ژمارەیەکی زۆریش لە کتێب و ناميلکەی کۆچیرۆکی تایبەت بە منـداڵان لەو ساڵانەو ساڵانی هەشتاکان بە چاپ گەیەنران و هاتنە مەیدان.

پ - چـیرۆکی منـداڵان لـە دوای راپـەڕینی ١٩٩١ لـە رووی چـەندایەتی و چۆنایەتییەوە پێشکەوتنی بەرچاوی بەخۆوە بینی، چ لـە رووی نـاوەرۆك یـان فـۆڕم دا، ژمـارەی نووسـەرانی چـیرۆکی منـداڵان روویـان لـە زیـادبوون کـرد، ژمارەی ئەو گۆڤارانەی بۆ منداڵان دەردەچـوون رۆژ بـە رۆژ بـەرەو زیـادبوون دەچن، ئارەزوومەندییەکی فراوانیش سازبووە لەلایەن کەسانی ئـەکادیمی بـۆ نووسین و توێژینەوە لەسەر ئەم بابەتە.

ت - ئەدەب و چیرۆکی منداڵان لە دوای راپەڕین تـا راددەیـەك دوو ئامـانج لە خۆ دەگرێت ئەوانیش، یەکەمیان بۆ کات بەسەربردن و خـۆش گـوزەرانی و بەخشینی چـێژێکی ئەدەبییـە بـە منـداڵان. دووەمیشـیان پـەروەردە کـردن و رۆشنبیرکردنی منداڵانە لە هەموو لایەنـەکانی ژیانـدا و، هەوڵدانـە بـۆ دروسـت کردنی مرۆڤێکی خاوەن کەسێتی بەرز لە دواڕۆژدا بۆ نەتەوەکەی.

ح - نووسـەرانی چـیرۆکی منـداڵان لـە دوای راپـەڕین تـا رادەیـەکی بـاش توانیویانـە مامەڵـە لەگـەڵ رەگـەز و بنـەما گرنگـەکانی چـیرۆکی منـداڵان لـە (رووداو، کەسایەتی، گرێچن، ژینگە، ژینگەی کات و شوێن...تد) بکـەن و، لـە نێو بەرهەمەکانیاندا بەرجەستەیان بکەن. ئەمە جگە لەوەی بەشـێکی زۆر لـە کتێب و ناميلکە چیرۆك ئامێزەکان رەگەزە تەکنیکییەکانی وەك رەنـگ، وێنـە و نیگار، شێوەی بەرگی دەرەوەو ناوەرۆکی کتێبـەکان، جـۆری فۆنـت...تـد) یان تیادا بەکارهاتووە.

خ ـ له رووی لایەنی سایکۆلۆژیای منداڵ، لەبەر کەم شارەزا بوونی چیرۆک نووسـانمان لـەم بـوارەدا، ژمارەیـەکی کـەمیان لـێ دەرچـێت ئـەگینا نـەیان توانیـوە چـیرۆکەکان بـە پێـی قۆناغـەکانی تەمـەنی منـداڵان جیـا بکەنـەوە ئەوەیش کەلەم بوارەدا سەرکەوتنی بەدەست هێناوە هـەوڵی داوە لـە ڕێگـەی بەرهەمەکانی لە منداڵەوە بۆ منداڵ سوود وەربگرێ، کە ئەمەش یەکێکـە لـەو سیما گرنگانەی کە چیرۆکی منداڵان لەدوای ڕاپەڕین بەخۆیەوە بینی. چـونکە لە ڕێگەی ئەو بەرهەمانەی کەوا منداڵان دەینووسن، چیرۆک نووسان دەتـوانن شارەزایی لە ناخ و دەروونی منداڵان پەیدا بکەن.

ج ـ لــە رووی ناوەرۆکــەوە چــیرۆکی منــداڵان چــەند جــۆرێکن بــەڵام چیرۆکنووسان تا ئێستاش نەیان توانیـوە بەرهەمـەکانیان بخەنـە نـاو خانـەی جۆرەکانی چیرۆک بەپێی ناوەرۆکەکانیان و ئەو قۆناغەی کەوا بۆی دەنووسن.

لەگەڵ هەموو ئەوانەی باسکران، دەتوانین بڵێین بە بەراورد لەگەڵ ساڵانی بەر لە ڕاپەڕین چیرۆکی منداڵان پێشڤەچوونێکی دیاری بـەخۆوە بـینی، بـەڵام هێشتاش نەیتوانیوە بگاتە ئاستی چیرۆک و ئەدەبیاتی منداڵانی جیهان یاخود وڵاتە پێشکەتووەکان لەم بوارەدا. بۆیە چیرۆکنووسانمان هێشتا پێویسـتییان بە هەوڵ و تەقەڵای زیاتر هەیە.

# سەرچاوەکان

**یەکەم: (بەکوردی)**

١- اسماعیل رسول، چەند باسێك دەربارەی ئەدەب و رەخنەی ئـەدەبی، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٨١.

٢- ئیبراهیم یونسی، گوڵبـژێرێك لـە هونـەری چـیرۆك نووسـین، و. نەبـەز جەهانگیر پور، چاپی یەکەم، چاپەمەنی چوارچرا، سلێمانی، ٢٠٠٥ .

٣- بەهار رەشید، چیرۆك بۆ منداڵان ( خـاوێنی )، چـاپخانەی وەزارەتـی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٥ .

٤- پەرێز صابر محمد، بینای هونەری چیرۆکی کوردی - لە سەرەتاوە تا کۆتایی جەنگی دووەمی جیهـانی، نامـەی ماسـتەر، کۆلێـژی ئـاداب، زانکـۆی سەلاحەدین، ١٩٩٢ ز.

٥- جــەلال سـنجاوی، چـۆن حەکایــەت بـۆ منداڵەکــەت دەگێڕیتــەوە، رۆژنامەی (یەکبوون)، ژمارە(٨)، ٢٥ی نیسانی ١٩٩٩.

٦- جۆن ئەیکن، چـۆن بـۆ منـداڵ دەنووسـی، و. کـەمال غـەمبار، چـاپی یەکـەم، لـەزنجیرە بلاوکراوەکـانی گۆڤـاری ئاسـۆی پــەروەردەیی، هــەولێر، ٢٠٠٤.

٧- حەمەسـەعید حەسـەن، هـزرو شـێواز لـە چـیرۆکی کوردیـدا، چـاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٥ .

٨- حەمــە سـەعید حەسـەن، قارەمـان و رووداو لـە چـیرۆکی کوردیـدا، گۆڤاری (شین)، ژمارە (١٠)، ٢٠٠٥.

٩- حەمە کەریم هەورامی، ئەدەبی منداڵانی کورد - لێکۆڵینەوە .. مێژووی سەرهەڵدانی، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٥ .

١٠- حسێن عارف، نووسینەکانم لە بواری رەخنەو لێکۆڵینەوەدا، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ٢٠٠٢.

١١- حسێن عارف، ناوی کەسانی چیرۆکمان چۆن هەڵدەبژێرین، گۆڤاری (بەیان)، ژمارە(٣)، ١٩٧٠.

١٢- رۆستەم باجەلان، کە منداڵ هەوڵ دەدات بەرهەمی ئەدەبی بنووسێت، گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە(٤)، خولی دوای راپەڕین ١٩٩٨.

١٣- زاهیر رۆژبەیانی، چیرۆکی هونەری کوردیی- شێوە و شێواز، بونیادی، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر، ١٩٩٧.

١٤- د. زاهیر لەتیف کەریم و د. فازل مجید محمود، قایلکاری لە چیرۆکی منداڵاندا، گۆڤاری (زانکۆی سلێمانی)، ژمارە (١٤)، ٢٠٠٤، بەشی B .

١٥- سابیر رەشید، چیرۆکی کوردی رەخنە و لێکۆڵینەوە، چاپخانەی رۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٥ .

١٦- سازان جەلال، ژیکەڵە، چاپی یەکەم، چاپخانەی مەهارات، تاران.

١٧- سەلام مەنمی، چیرۆکی ( دار کونکەرە)، گوڵزارا چیرۆکان، لیژنەیەك لە وەزارەتی پەروەردە ئامادەی کردووە، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١ .

١٨- سیامەند هادی، دوو چیرۆکنووس لە بەردەم پێنج پرسیاردا، گۆڤاری (ئاینده)، ژمارە (٤٩)، ٢٠٠٣.

١٩- شاخەوان علی محمد، ورچ و شێر و مام ڕێوی، کۆمەڵە چیرۆکی منداڵانە، ڕۆستەم باجەلان پێشەکی بۆ نووسیوە، چاپی یەکەم، چاپخانەی هاوسەر، هەولێر، ٢٠٠٢ .

٢٠- عەلی حەمە رەشید بەرزنجی، دیاری و سەردان ( دە چیرۆك بۆ منداڵان ) چاپی یەکەم، چاپخانەی ئۆفسیتی دیلان، سلێمانی، ٢٠٠٤ .

٢١- عەزیز ئالانی، مەدالیا، ( ٧ کورتە چیرۆکی فێرکاری بۆ منداڵان) چاپی یەکەم، لە بلاوکراوەکانی ناوەندی رۆشنبیری، سلێمانی، ٢٠٠٢.

٢٢- لین ئۆانبیرند- لیزی لویس، کورتەیەك لەبارەی لێکۆڵینەوەی چیرۆکەوە، و. سەلاح عومەر، لە بلاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٣.

٢٣- مەرسوم گەشبین، سەگی پیاوانی ئەشکەوت، ( زنجیرە چیرۆکی گیانلەبەران لە قورئانی پیرۆزدا بۆ منداڵان)، چاپی یەکەم، بلاوکردنەوەی نووسینگەی تەفسیر، هەولێر، ٢٠٠٥.

٢٤- مەغدید رواندوزی، ئەفسانەی شێتۆکە و ئاقڵۆکە بۆ منداڵان، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی رۆشەنبیری، هەولێر، ١٩٩٨ .

٢٥- محمد رشید فتاح، ئەدەبی منداڵا ن، ونموونە و لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی منداڵان، چاپخانەی راپەڕین، سلێمانی، ١٩٧٤ .

٢٦- موئەیەد تەیب، کێز خاتون، چاپخانا وەزارەتا پەروەردێ، دهۆك، ٢٠٠٤.

٢٧- نزار حمد حنا، منداڵ و خەیاڵ، رۆژنامەی (رێگای کوردستان)، ژمارە (٢٦٧)، ١٩٩٧/٩/١٠.

٢٨- نەوزاد عەلی ئەحمەد، منداڵ و ئەدەب، چاپی دووەم، چاپخانەی روون، سلێمانی، ٢٠٠٦ .

٢٩- ؟، هونەری کورتە چیرۆك نووسین، کازم سەعدەددین کردوویەتی بە عەرەبی، مستەفا صالح کەریم کردوویەتی بە کوردی، مطبعة دار الرسالة، بغداد، ١٩٨٥ .

دووەم: (بە عەرەبی)

- کتێب:

٣٠- احمد نجيب، فن الكتابة للاطفال، دار الكتب، القاهرة، ١٩٦٨.

٣١ـ جون أيكن، كيف تكتب للأطفال، ترجمة : كاظم سعدالدين، الطبعة الأولى، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٨٨.

٣٢- د.حسن شحاته، أدب الطفل العربية ـ دراسات وبحوث، الطبعة الثالثة، الدار المصرية اللبنانية، القاهرة، ٢٠٠٤.

٣٣- د.رشاد رشدى، فن القصة القصيرة، مكتبة الانجلو المصرية، القاهرة، ١٩٧٠ .

٣٤ـ د. سمير عبدالوهاب احمد، قصص وحكايات الأطفال وتطبيقاتها العلمية، الطبعة الاولى، دار المسيرة، عمان، ٢٠٠٤.

٣٥- د.عبدالفتاح ابو المعال، ادب الاطفال دراسة وتطبيق، الطبعة العربية الثانية، دار الشروق، عمان، ٢٠٠٠.

٣٦- د. عزالدين اسماعيل، التفسير النفسي للأدب، الطبعة الرابعة، مكتبة غريب للنشر، ؟

٣٧- د. على الحديدى، الادب وبناء الانسان، مطبعة دار الكتب، بيروت – لبنان، ١٩٧٣ .

٣٨ – د. على الحديدى، في ادب الاطفال، مكتبة الانجلو المصرية، القاهرة، ١٩٨٢.

٣٩- فهيم مصطفى، الطفل والقراءة، الطبعة الثانية، دار المصرية اللبنانية، القاهرة، ١٩٩٨.

٤٠- محمد بن السيبد فراج، الاطفال وقراءاتهم، شركة الربيعان، الكويت، ١٩٧٩.

٤١- محمد محمود رضوان وآخرون، أدب الاطفال مبادؤه و مقوماته الاساسية، القاهرة، ١٩٨٢.

٤٢ – محمد عبد الرزاق ابراهيم ويح وآخرون، ثقافة الطفل، دار الفكر للنشر والتوزيع، عمان، ٢٠٠٤ .

٤٣- مصطفى بدران وآخرون، الوسائل التعليمية، مطبعة الانجلو المصرية، القاهرة، ١٩٥٩.

٤٤- د.نجيب الكيلانى، ادب الاطفال في ضوء الاسلام، الطبعة الرابعة، مؤسسة الرسالة، بيروت ١٩٩٨ .

٤٥- د. هادى نعمان الهيتي، ادب الاطفال، فلسفته، فنونه، وسائطه، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٧٧.

٤٦- يعقوب الشارونى، الفروق الاساسية بين كتب الاطفال الموجهة الى مختلف الاعمار، القاهرة، ١٩٨٦.

ب- گۆڤارو رۆژنامه:

٤٧- شجاع العانى، قصص الاطفال، مجلة الاقلام، عدد ٣، السنة الخامسة عشرة، كانون الاول ١٩٧٩.

## ملخص البحث

# مفهوم وعناصر قصص الاطفال في الأدب الكردي

(١٩٩١- ٢٠٠٥)

د. هيمداد حسين بكر

رازاو رشيد صبرى

تحتوي هذه الدراسة الموسومة (مفهوم وعناصر قصص الاطفال في الادب الكوردي ١٩٩١– ٢٠٠٥) على دراسة القصص المتعلقة بالاطفال في تلك الفترة المذكورة، من النواحي الادبية والفنية، على ضوء المنهج النقدي والنظري والتطبيقي.

ويتكون الهيكل العام للدراسة من: مقدمة، ومفهوم وعناصر قصص الاطفال وخاتمة، وبالشكل التالي:

المقدمة: وهي تعبير واشارة الى عنوان البحث، وسبب اختياره وذكر العقبات التي اعترضت طريق الباحثين في اثناء اعداد بحثهما، وفيها ايضا ذكر مختصر لمحتوى البحث.

وذكرت في الدراسة : مصطلح وعناصر عن قصص الاطفال، مع التطرق الى بعض النماذج التطبيقية من تلك القصص في الادب الكردي بعد انتفاضة (١٩٩١–٢٠٠٥) حسب ما يجب توفيره من مقومات القصة في قصص الاطفال.

ولخصت في الخاتمة اهم النتائج التي توصل اليها البحث.

// Abstract

## The section focuses on the terms and the elements of children story

This Study, titling “The section focuses on the terms and the elements of children story.” is a study on the literary, technical and psychological aspects of children artistic story during the specific period. This project is conducted under the light of critical, theoretical and practical methods. The general scale of the paper consists of an introduction, , and a conclusion.

The introduction explains the title of the paper and the reasons for choosing the subject. It also refers to the challenges and obstacles that the researcher has faced during the course of the research. The introduction also explains in short the chapters that make the main body of the paper.

The section focuses on the terms and the elements of children story. There are a number of examples from the Kurdish stories written during 1991-2005. These stories are considered according to the main elements that are necessary to be present in any children story.

The last chapter mainly covers the most important conclusions that the research has reached.

به ناوی خوای گەورە

# زاراوەسازی و زانستاندنی زمانی کوردی

جەمال عەبدول

## گوزەر و سەرەتایەک..!

ئاشکرایە، زمان، شتێکی تایبەتیی تاکەکەسێك نییە، بەڵکو ملکێکی گشتیی هەمووانە و ناوەندی پێکگەیشتنی گیان و لەش، تاك و کۆمەڵ، نەتەوە و مێژوو، کەسێتی و سەروەریەتییە و، هەر بە هۆی زمانەوە سروشتی تایبەتیی رەفتاری تاکەکەسیش لە رووی رەوشتەوە دیاری دەکرێت و نەتەوە دەتوانێ پێناسی خۆی دیاری بکات و مافی بەهی خۆزانین و بەکارهێنانی خاك و ژیاری و فەڕ و پیتی پێ دەبەخشێت و، نەتەوەی بێ زمان، نەتەوەیەکی بێ ئازادی و بێ کولتوور و بێ رابوردوو و بێ داهاتوویشە..!

کەواتە (کورداندن)، جەختی ئەم گرنگی و بایەخەی زمانە لە ژیانی تاك و کۆمەڵدا و، کارێکی ژیارییە کە بنەماکانی کەسێتیی نەتەوەی پێ تەواو دەبێت و بەڵگەی هۆشیاریی رۆڵەکانی و تێگەیشتنی راستییە و هۆیەکە بۆ گۆڕینی هزر و بیرکردنەوە و داهێنانی شێوازی نوێی ئاخاوتن و سەرنجێکی نوێی مرۆڤ و سروشتە و، هەرچەندێك شێوازی زانستیی لە زمانەکەماندا بەکار بهێنین و بیخەینە ناو کۆمەڵەکەمانەوە، زۆرتر کار دەکەینە بیرکردنەوە و هۆشیاریی خەڵکی و بەرەو هەست بە ڕاستی کردنێکی زانستییانەی دەبەین..!

دیاره، دانانی فەرهەنگی زانستیی یەکگرتوو و فراوان، یان تایبەتمەندی ڕێکوپێك، کە شان بە شانی گەشە و پێشکەوتنی زانست و تەکنۆسازی بڕوات، پێویستی بە دەزگا و دامەزراوی تایبەتمەند و خۆتەرخانکردوو و بە دەسەڵات هەیە و هەموو هەوڵێکی تایبەتی و تاکەکەسی لەو بوارەدا، هەرچەندێك ورد و دڵسۆزانە بێت و خاوەنەکەی زانا و زمانزان و بە سەلیقە و هۆشیار بێ و ئەزموونی دوور و درێژی هەبێ، هێشتا بەرهەمەکەی هەر ناتەواو دەبێت و ناتوانێ زانستەزاراوەی ورد و دروست و بۆ بڵاوبوونەوە و چەسپین شیاو لە هەموو بوارێکدا ئامادە بکات، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەیشدا، ئەم هەوڵ و کۆششە تایبەتانە، گرنگ و بایەخدارن و سەرچاوەیەکن، دەزگا و کۆڕە زانیاری و ڕووناکبیرییەکان ناتوانن فەرامۆشیان بکەن و دەستبەرداریان بن لە لێکۆڵینەوە و تەتەڵە کردن و تاووتوێ و لێ هەڵبژاردنی باش و گونجاوترین زانستە زاراوەدا.

بەو پێیە، بایەخدان بە کورداندنی زاراوە زانستییەکان، بە تایبەتی لە بارودۆخی ئێمەی کوردی بێ قەوارە و لە کاروانی پێشکەوتن و مرۆڤایەتی جێماودا، بۆ گواستنەوەی گەورەترین بڕ، کەلەپووری زانستیی جیهانی، وەك هەنگاوی یەکەم و ئینجا لێکۆڵینەوە و گفتوگۆ لەسەرکردن و ڕەخنەلێگرتن و دوای ئەوەیش دانانی بنەما زانستییەکان و داڕشتنی لەسەر زەمینەیەکی تۆکمە و پتەو، وەك بەرەنجامی ئەو لێکۆڵینەوانەیش، پێویستیمان بە دروستکردن و دانان و داڕشتن و داتاشین و خواستن و لێ وەرگرتنی ئەو زانستە زاراوانە هەیە، بۆ ئەوەی زانایان بتوانن ئەو ڕاستی و دەستکەوتە زانستییانەیان پێ دەربڕن، کە خۆیان لە کاتی تۆژینەوە و پەیجۆرکردنیاندا تووشیان دەبن و دەستیان دەکەوێت و بە زمانێکی کوردیی ڕەوان بیخەنە

بەرچاوی خوێنەر و، زاراوە بنەچە بیانییەکان، وەك خۆیان بهێڵنەوە و کوردییە رەسەنەکانیش، رەوتی خۆیان دەگرن بۆ ناو گەلان و مرۆڤایەتی.

جا، لەبەر ئەوەی تا ئێستا، ئێمەی کورد، سەرچاوەی کوردیی تایبەتمەندی وامان نییە کە رێنما و کارساز بێ بۆ ئامادەکردنی زانستە زاراوەی کوردی جگە لە دوو کتێبە تایبەتمەندە بە نرخەکەی (زاراوەی کوردی)ی و (زاراوەسازیی پێوانە)ی مامۆستایان کامیل بەسیر و مەسعود محەممەد و ئەو کتێب و نووسینانەی ئەو بەرێزانە بە گشتی باسی زاراوەسازیی کوردی دەکەن، کە بۆ ئامادەکردنی ئەم باسە، زۆر سوودم لێ وەرگرتوون و من خۆم بۆ ئامادە و سازکردن و دارشتن و مشتومالْ کردنی زانستە زاراوە، زۆر گەراوم و ماندوو بووم و تووشی جۆرەها دەردیسەری بووم و کاتێکی زۆرم بەفیرۆ چووە لەو پێناوەدا، بیرم لەوە کردەوە کە، بۆ ئەوەی کەسی تر بەو دەردەی من نەچێت و بنەمایەك هەبێ لەو بوارەدا سوودی لێ وەربگرێت و هانی خەڵکی تریش بدات (بە تایبەتی زاناو زمانەوان و کوردیزان و زاراوەسازەکان)، کە بەم نووسینەدا بچنەوە و هەوڵ بدەن بەرهەمی فراوانتر و رێکوپێکتری تایبەتمەند لەم بوارە سەخت و پڕ وردەکارییەدا دابنێن، بریارم دا، شتێك لەو بارەیەوە ئامادە بکەم و نووسینێکی فراوانی لێ کەوتەوە کە ئەمە بەشێکێتی، بە هیوام زانا و زمانەوان و پسپۆرەکان، بە هی خۆیانی بزانن و بە چاوی هەتەری و لێکۆڵینەوەوە، بیخوێننەوە و لە رێنمایی و سەرنج و بۆچوونی زانستییانەیان بێ بەشی نەکەن، بۆ سوود لێ وەرگرتنی، لە تەواو کردن و فراوان کردنیدا.

## گوتەیەك دەربـارەی دانـانی زانسـته زاراوه و گەشـەی زمان...!

له سەرەتای ساڵەكانی حەفتا و دوای بەیاننامەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠، لەو كاتەوه كه دەست كرا بەوەرگێڕانی كتێبەكانی خوێندن بۆ كوردی، له قۆناغه سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەییيـەكانی باشووری كوردستاندا، بەهـەموو كـەموكووڕی و ناتـەواوی و كەلێنەكانیشـیەوە، جـۆره بـاوەڕێكی بـەزمانی كوردی هێنایه دی و ئەو ژانه گرانەی تێپەڕاند كه ناحەزان و نەزانان ئەیانوت، زمـانی كـوردی زانسـتی پـێ نانووسـرێت و سـەركەوتنی بزاڤـی كوردانـدنی كتێبـەكانی خوێنـدن، دڵـی دڵسـۆزانی ئاسـووده كـرد و تـۆوی كوردانـدنی خوێندنی قۆناغەكانی دوای ئەوانیشی له ناخ و دڵی خەمخۆراندا چاند و بـووه هیوا و ئامانجێك...!

دواتـریش هەوڵـەكانی كـۆڕی زانیـاریی كـورد بـۆ كۆكردنـەوەو داڕشـتن و سـازكردنی زاراوەی ئـەدەبی و زانسـتیی هەمـەجۆر لـه هـەموو بوارەكـانی فەرهەنگدا، كارێكی باشیان هـەبوو لـه چەسپاندنی ئـەو بـاوەڕو متمانەیـەدا بەزمانی كوردی و دەرچوونی گۆڤاری كۆڕ و، ئەو هـەموو هـەوڵ و تۆژینـەوەو باسـه هەمـه بابـەت و شـێوازانەی كورداندنی كتێبـەكانی خوێنـدن و هەوڵـه تاكەكەسییەكان، بوونه هـۆی كەڵەكـەكردنی نـەك هـەر خـەرمانێك و سـەدان، بەڵكو هەزارەها زاراوەی زانستی له هەموو بوارەكانی پەروەردەو فێركـردن و رووناكبیریدا.

لـه راسـتیدا، ئـەو سـی و پێـنج سـاڵەی دوای حـەفتا، چـەندین لیسـت و فەرهەنگی هەمەجۆر و بابەتی یەكزمانەو دوانی و سیانیی گشتی و تایبەتمەند رێـك خـران، كـه زۆربـەی بەكۆشـش و كـردە و مانـدووبوونی دڵسـۆزانەی تاكەكەسی و چەند كەسی سازكراون.

ئایندەی زانستە زاراوەسازیی کوردی و زانستیمان تا رادەیەکی زۆر بەستراوە بەکوردانی خوێندنەوە نەك هەر لە قوتابخانە دواناوەندییەکاندا، بەڵکو لە زانکۆکانیشدا، وەك دەستمان پێ کردووە. ئەمڕۆ لە سبەی باشترە. شیاو نییە، بچینە بوارەکانی زانستی نوێوەو، بەهرە لە دەستکەوتەکانی وەربگرین و زمانەکەمان، لە کەشی زانست و داینەمیکێتی داهێنان و هەڵقوڵینی نامۆ بێت و، کاتی ئەوە هاتووە زمانی زانستی کوردی، ببێتە بەشێکی ژیانی رۆژانەمان، لە قوتابخانەو ماڵ و کێڵگەو شوێنکار و زاراوە زانستی و شارستانییەکان بەزمانی کوردی ببنە بەشێکی زیندووی کولتووری پیشەگەر و قوتابی و مامۆستا و رۆژنامەنووس و ئەدیب و پسپۆڕە هونەرییەکان.

ئەو کاتە بەسەرچوو کە دارشتن و سازکردنی زاراوە زانستی و هونەرییەکان، هەر بەرپرسیی کۆڕو دامەزراوە زمانییەکان بێت. رۆژانە، لێشاوێك واژەو ناو دامان دەپۆشێت، بۆ تازەگەریی شارستانی و دۆزراوەکانی زانست لە تاقیگە و کارگە کیمیایی و فیزیایی و پیشەسازی و ئاسمانی و شتەکانی تریشدا، تەنانەت یەکێك لە تاقیگەکانی وڵاتێکی پێشکەوتوو، ژمارەی ئەو واژە نوێیانەی کە زاناکان دایان دەهێنن، وا دیاری کرد کە لەنێوان ١٥—٥٠ واژەدایە لە رۆژێکدا، بۆیە ماقووڵ نییە، کار وا بڕوا و ئەو زاراوانە چاوەڕوانی کۆبوونەوەی لیژنە و کۆڕە تایبەتییەکان و مشتومڕ و بڕیارەکانیان بن. هەر دەبێ بواری داهێنانی رێکوپێك و بەدواداچووی رەوتی زانست و تاکەکەس بدرێ، بەرابەریی دامەزراوە زانستی و کۆڕە زمانەوانییەکان. هەر کاتێك گەیشتینە ئەو ئاستەی مامۆستا و دەرزوتنەوە بەزمانی ئینگلیزی بەتۆژینەوەیەکی زانستیدا بچێتەوەو رۆژی دواتر

بەزمانێکی پاراوی کوردی بۆ قوتابییەکانی باس بکات، واتە زمانی کوردی بکاتە هاوشان و هاودەمی زانست، نەك هەر لە دوورەوە چاودێریی بکات.

مێژووی دانانی زانستە زاراوە لە سەردەمی راپەڕینی نوێدا، گەواهی ئەو دەورە گرنگەیە کە وەرگێڕو کوردیکەرە ئەدیب و رۆژنامەنووس و فەرهەنگنووسەکان دیویانە لەو بوارەدا و، باشترین شت کە کۆڕە زانیاری و دامەزراوە زمانییەکان بیکەن، ئەوەیە کە ئەو بنەما و یاسایانە دابنێن، کە رێنمایی زاراوە داڕشتن و بە کوردیکەر و تۆژینەوە دەربارەی بنەماکانی وەرگێڕان و هاندانی جێبەجێکردنی ئەو تۆژینەوانە و هەڵسەنگاندن و بڵاوکردنەوەیان دەکەن.

زمانی تورکی و فارسی و عیبری و عەرەبی و هی تریش، لە بواری زانستەکانی سەردەمدا مەودایەکی باشیان بڕیوەو، هەموو لقەکانی زانستی نوێیان پێ دەوترێتەوە، وەك پزیشکی و ئەندازیاری و ئەلەکترۆنزانی و هیی تریش و بوونەتە زمانی کۆنگرە زانستییەکان (لە کیمیا و فیزیا و گەردیلە زانیدا)، کە لەو وڵاتانەدا، ساز دەکرێن کە بەو زمانە دەدوێن. ئەو بوارەیشیان بەوە بۆ ڕەخساوە کە هەزاران زاراوەی تەکنۆلۆجی و زانستیی مۆرك جیهانییان هەیە. لەم ڕووەوە، ئەگەر وڵاتە عەرەبییە لە چاو خۆدا پێشکەوتووەکان بکەین بەنموونە و رێنما و سوود لە ئەزموونی ئەوان وەربگرین، دەبینین، خۆبەستنەوە بەعەرەبی وەرگێڕانی واژە و ناوەکان، لەلایەکەوە ئەنجامی خراپ و لەلایەکی تریشەوە هی باشی هەیە، ئەنجامە خراپە سەرەکییەکەی گۆڕدرانی خوێندنی باڵا لە زۆربەی ئەو وڵاتانەدا و (خوێندنی ئامادەیی لە هەندێکیاندا) بۆ وتنەوەی بابەتە زانستی و بیرکارییەکان بوو بەزمانی بیانی، کە تا ئێستاش لە زۆر وڵاتی عەرەبیدا بەدەستیەوە ئەناڵێنن و هەرچییەك بوترێ بۆ پاساوی وتنەوەی زانست

بەزمانی بیانی، ناتوانرێ نکوولّی لەو راستییە بنچینەییە بکرێت، کە تێگەیشتن و تێدا قالّبوونی ئەو زانستانە، لەرووی پەروەردەییەوە، بەهۆی زمانی نەتەوەییەوە نەبێ دەستەبەر ناکرێت. بەلاّم ئەم پابەندییە، سوودیشی هەبوو لە دامەزراندنی ئەو دەزگا و کۆڕە زمانەوانییانەدا کە هەولّی بە بەرهەم و باشیان داوە بۆ سوود وەرگرتن لە بواری گونجاندنی زمان و گونجۆکیی بابەتەکانی پێوانەو وەرگرتن و لێ خواستنیان و بەوەیش سامان و کولتوورێك زاراوەی زانستیمان دەست کەوت، کە دەتوانین پشتیان پێ ببەستین و کارێکی وا بکەین زمانی نەتەوەییمان شان بەشانی دۆزینەوەکانی زانست و لەگەلّ دەستکەوتەکانی شارستانیی نوێدا، دەربەرێت.

ئەو خەرمانە مەزنە زاراوە زانستییانەی کە رۆژانە هەلّدەتۆقن، وا لە وەرگێڕانی پەتی دەکات کارێکی ناکردەیی بێت و رێسای لۆژیکیی وەرگێڕان و کورداندن ئەوەیە، کە ئەوەی رەسەنە لە زمانی وەرگێڕدراودا، پەرچڤە دەکرێت، بەلاّم واژە ناو جیهانییەکان کە لە یۆنانی یان لاتینی وەرگیراون (وەك تەلەفۆن و تەلسکۆپ و مایکرۆفۆن و مایکرۆسکۆپ و تەلەفزیۆن)، یان ئەوانەی بۆ بیرنەچوونەوەو نەمریی زانا و داهێنەران دانراون (وەك ڤۆلّت و ئۆم و کوری و ئەمپێر و وات)، یان ئەوانەی لە تیپی ئاشنا و نێودەولّەتی پێك هاتوون (وەك رادار و رادپاك و لەیزەر و مەیزەر و ناپالّم) وەك خۆیان دەکوردێنرێن.

بۆ ئەوەی زمانەکەمان بتوانێ بەشێوەیەکی راست ناونراوە کوردێنراوەکان دەرببڕێت، پێویستە ئاسانکاری لە زمانی زاراوە زانستی و تەکنۆلۆجییەکاندا بکەین. لەم بارانەوە:

١- ئەشىٚ بە نەبزێو دەست پێ بکەین، بۆ ئەوەی ناونراوەکان وەك ئەوەی خەڵك لە زۆربەی وڵاتانی دنیادا، گوزارشتی لێ دەکەن، بیکەین و بڵێین: "کلۆرات و کرۆم و گرافیت و پرۆتۆن و براون و شمیث و سپێکترۆسکۆپ".

٢- پێویستە، ئاسانکاری لە کێشەی پێکەوە دانانی دوو نەبزێو یان زۆرتردار بکەین، بۆ نموونە دەڵێین: "مۆرس و بۆیل و شارڵ و پاوەند و رۆنتگن و کیگستۆن و پاینت".

٣ـ وەکو خۆ هێشتنەوەو خستنەسەری ئەو تیپانەی لە کوردیدا نین، بەتایبەتی (ث، ذ)، بۆ ئەوەی زمانەکەمان بتوانێ واژە بیانییەکان بەشێوەیەکی پەسەند گوزارشت بکات، بۆ نموونە لە دەربڕینی ناوی توخم و ئاوێتە کیمیاییەکاندا، دەبێ بوترێ لیثیوم نەك لیسیۆم، میثان نەك میسان، ئەثیل نەك ئەسیل، ئیثانۆڵ نەك ئیسانۆڵ و...تاد.

بیرۆکەی دانانی یەك زاراوە بۆ یەك ناونراو، شتێکە هەموو کەس لەسەری کۆکن لە رووی بنەماوە، بەڵام زاراوە دیاریکردن کارێکی بێ بگرەو بەردە نابێ، کە دەرگای وەرگێڕان کراوە بێت، جیاوازیی بیروبۆچوون (لە سنوورێکی چاوەڕوانکراودا) هەر دەبێ و هیچ کەس و دەستەیەك (دەسەڵاتی زمانەوانیی هەرچەندێك بێت)، بەهیچ جۆرێك ناتوانێت زاراوەیەك لاببات و یەکێکی تری بخاتە شوێن، ئایندە (داوەرە) و بەکارهێنان (بێژنگ) و ئەشێ لە زاراوەیەك زۆرتر، خۆیان لەبەر ئەو لە بێژانگدنەیەدا ڕابگرن کە بەساڵ و دوو ساڵ تەواو نابێت، بەڵکو دەیان ساڵی پێویستەو بەشێوەیەکی خۆڕەسیش روودەدات.

که وەرگێڕدراوەکان، لە چەند سەرچاوەیەکی جیاوازەوە بن، لێکنەچوون شتێکی ئاسایی دەبێت و پێویستە ئەوەی (بۆ نموونە) لە ئینگلیزییەوە وەردەگێڕدرێت، لەگەڵ ئەوەی لە فەڕەنسییەوە وەردەگێڕدرێت کۆك بێ، کاتێك زاراوەکە ڕەگێکی لاتینی یان یۆنانیی هاوبەشی تێدا نییە، بۆ نموونە، ئەوەی (Power)ی ئینگلیزی وەردەگێڕێت لە بواری میکانیکیدا بە (توانست) و (force) بە (هێز) وەردەگێڕێت، بەڵام ئەوەی لە فەڕەنسییەوە وەری دەگێڕێت، ئەشێ هەردوو بیرۆکەکە بە (هێز) وەربگێڕێت چونکە وشەی (force) لەو گوزارشتە میکانیکییانەدا کە جارێك (هێز) پیشان دەدات و جارێکی تریش (توانست) و هەندێ جاریش هەردوو هاوواتا وەرگێڕدراوەکەی یەك زاراوە، وا دەردەکەون کە هیچ پەیوەندییەکیان پێکەوە نییە، لەبەر جیاوازیی ناوی زاراوەکە لەو زمانانەدا کە لێیانەوە وەردەگێڕدرێت. بۆ نموونە: لە (fan) و (alluvial)دا، زاراوەکە، بە (پەروانەی لیتەیی) وەرگێڕدراوەو لە فەڕەنسییەوە. هەمان زاراوە، بەقووچەکی ڕژان ( cone de dejection) و، لە عەرەباندنی (nitrogen)دا، بەئینگلیزی وتراوە نایترۆجین و بەفەڕەنسی وتراوە (azote). سەرەڕای ئەمە، بابەتی یەك هاوواتا، تەنانەت لە یەك زمانیشدا لەو زمانانەی زانستیان پێ دەنووسرێتەوە، نەهاتۆتە دی، دەبینین فیزیاگەری ئەمەریکایی ( electron tube) بەکاردێنێت و وەردەگێڕدرێت بە (بۆریی ئەلەکترۆنی)، کەچی فیزیاگەری ئینگلیزی دەنووسێت (electron valve) و بە (زمانەی ئەلەکترۆنی) وەردەگێڕدرێت. تەنانەت رەنگە زانایانی یەك وڵات دوو زاراوەی جیاواز بۆ هەمان مەبەست بەکاربهێنن، بەکارهێنانێکی ئاڵوگۆڕ، وەك لە دوو وشەی (period) و (epoch)دا، وەرگێڕانەکانمان (بۆ دانراوەکانیان)ی ئەو

زاراوانه بەیەکێکیان دیاری ناکرێت، بۆیە جاری وا هەیە دەڵێین (سەردەم) و جاری وایش هەیە دەڵێین (چاخ).

دوور نەڕۆین، ئەگەر سەرنجی هەندێ زاراوە بدەین کە لە دوو فەرهەنگی تایبەتمەندی جوگرافیا و زەویزانیدا هەن و هەردوو فەرهەنگەکە (کۆڕی زمانی عەرەبی لە قاهیرە) داینـاون، کە (بێگومـان کـارا و شـیاوترین دامـەزراوی عەرەبە لە بوارەکانی زاراوە دۆزینەوەو گونجاندن و گەشەپێکردنیدا)، جیاوازییەکی ئاشکرا دەبینین لە هاوواتای عەرەبیی یەك زاراوەدا، بۆ نموونە:

| هاوواتای عەرەبی لە (فەرهەنگی جوگرافیادا) | هاوواتای عەرەبی لە (فەرهەنگی زەویزانیدا) | لە زاراوەی ئینگلیزی |
|---|---|---|
| سحج (پاککردن) | تذرية (بەباکردن) | ablation |
| سحج (داتاشین) | بري (دادان) | abrasion |
| الصخور الغورية (قووڵە بەرد) | صخور الأعماق (ناخەبەرد) | abyssal rocks |
| سهل غريني (دەشتی لیتەیی) | سهل طميي (دەشتی خڵتەیی) | alluvial plain |
| حدبة (کووڕی) (گومەزی، چرچی کووڕ) | قبو، طية محدبة | anticline |
| حدبة متغضنة (لۆچ) | تحدب مركب (فرەکووڕی) | anticlinorium |
| طبقة خازنة للماء (چینی ئاو کۆکەرە) | مستودع ماء أرضي (گەنجیناوی زەمینی) | aquifer |

ئەو جیاوازییانەی لێرەدا دەیانبینین، جۆرێکی چاوەڕوانکراون و رەنگە لەم قۆناغەی ئێستادا، کارێکی سروشتی بێ و ئەشێ هاوواتاکان یەکتری

تەواو بکەن و یەکێکیان ئەوی تریان ڕوون بکاتەوە. ئەم جۆرە جیاوازییە، هاوواتاکە، لە سنووری واتای زانستیی خۆی دەرناکات و بەدەگمەن زمانێکی سەردەم هەبێت، ئەو جیاوازییانەی تێدا نەبێت.

ئەگەر بەوردی سەرنجی کارەکانی کۆڕە عەرەبییەکانیش بدەین، (بەتایبەتی کۆڕی زمانی عەرەبی لە قاهیرە) دەبینین، نزیکەی گەیشتوونەتە ئەو باوەڕەی کە لەم قۆناغەی ئێستادا ناتوانرێت بەتەواوی یەك هاوواتا بۆ هەر زاراوەیەکی بیانیی دیاریکراو دابنرێت و بڕیاری داوە کە:

"پێویستە، لە زاراوە زانستی و هونەری و پیشەسازییەکاندا، هەر واتایەك، تەنیا ناوێکی تایبەتی هەبێت".

پاش چەند دانیشتنێك، بڕیاری بەندێکی تر دەدات کە:

"هەموو واژەیەکی باو لە وڵاتە عەرەبییەکاندا، دەخرێنە پاڵ ئەوانەوە کە لیژنەی کۆڕ دایناون"، "جیاوازییش لەنێوان ئەوەی کە پێویستەو ئەوەی ئێستا هەیەو کاری کردەیە، دیار و ئاشکرایە..".

ئینجا، هیچ ژیری نییە، لەم قۆناغەدا زاراوەیەك دابڕێژین و، خەرمانەیەکی پیرۆزیی بەدەوردا بکێشین و دوورە ڕەخنەو گۆڕدران بێت، بەڵکو هەر دەبێت دەرگای کۆشش کراوەو ئاوەڵە بێت بۆ ئەوانەی کە پێشنیازی پەسەندتر و گونجاوتریان هەبێت، بەتایبەتی ئەو هاوواتایانەی زۆر باو نین یان زۆر وردەکار نین، یان سێبەرێکیان هەیە، کە لە دەربڕینی واتای زاراوە زانستی یان هونەرییە مەبەستەکەی دوور دەخاتەوە، وەك لەم سێ نموونە دەستەبژێرەدا دەیانبینین، لەو کۆمەڵە زاراوە زانستییانەی (کۆڕی زمانی عەرەبی لە قاهیرە) بڕیاری داون:

یەکەم: بە وشەی (aneroidograph) وتـراوە (المسـجل المعـدني)، کـە ئەگەر بوترایە (بارومتر معـدني ذو مرسمـة) یـان (بـارو مـتر لاسـائلي مسـجل) وردتـر و پەسـەندتر بـوو، چـونکە ئەشـێ (المسـجل المعـدني)، نـاوی دەیـان ئامێری تر بێت.

دووەم: بە وشەی (Coaling station) وتراوە (محطة التموین)، کـە لـە راستیدا (محطة التزود بالفحم)، لە گوزارشتی واتاکەوە نزیکترە.

سێیەم: بە وشەی (lag) وتـراوە (التـأخر) واتـە (دواکـەوتن)، کـە ئەگـەر بوترایـە (التخلـف) واتـە (مانـەوە یـان بـەجێمان) پەسـەندتر دەبـوو، چـونکە وشەکە لە رووی فیزیاییـەوە واتـە "التـأخر مـع بقـاء بعـض الشـيء أو الأثـر المتخلف".

هـەروەها، کاتێـك وشـەکان لـە دەربڕینـی واتـادا یەکسـان دەبـن، چـێژ و سەلیقەی زمانەوانیی وەرگێڕەکـان جیـاواز دەبێـت، کـە یـەکێکیان (محشـة و منجلة و منقاش) بەکاردێنێت، کوردییەکانیان (کۆڵەوژ و داس و سمـۆ) ئـەوی تریان (محراك و ملزمة و ملقـط) پەسـەند دەکـات، کوردییـەکانیان (کەمچـە و گرە و مقاش) کە جیاوازیی لەم بابەتە، نەك هـەر شـتێکی سروشـتییە و هـەر دەبێ ببێ، بەڵکو شتێکی خوازراوە، جا کە ئـەوە پەسـەند بکـەین، (ئاینـدە) داوەر و (بـەکارهێنان) بێـژنگ بێـت، کەواتــە ئــەوە رێگەیــەکی پەســەند و ماقووڵەو لەگەڵ بنەما زانستی و لۆجیکییەکانیش ئـەگونجێ و، خۆزگـە، ئـەو پێشنیازەی شارەزایەکی یونسکۆ لە دووەم کۆنگرەی زانستیی عەرەبیـدا کـە ساڵی ١٩٥٥ سـازکرا، پێشکەشـی کـرد و پێویسـتیی دامەزرانـدنی بنکەیـەکی هەمیشەیی زاراوە زانستی و هونـەری و تەکنۆلۆجییـەکانی تێـدا دەرخسـتبوو

کــە هــەوڵی بڵاوکردنــەوەی زاراوە و رەخنەســازی و یەکخســتنیان بگرێتــە ئەستۆی راگەیاندبوو.

یاساکانی هەڵبـژاردنی سروشـتی و گەشـەکردن و مانـەوەی باشـتر، وەك زیندەوەر لەگەڵ واژەو زاراوەکانیشدا دەگونجێن و، زمان لـە رووی پێوەنـدی تونـدوتۆڵی بـەباڵاترین چـینی زینـدەوەرەوە، ئـەویش بوونەوەرێکـە رەوشـی زیندەوەری هەیەو نەش و نما و گەشـە دەکـات و دەگونجـێ، رەنگـە هەنـدێ بەشی سیس و وشك ببێت و هی تر لە شـوێنی هەڵبداتـەوە، پێویسـتە زمـانی زیندوویش، یەکبینە بەهێمانەی زیندوویی و نوێسازی ئاو بـدرێت، بـۆ ئـەوەی لەگەڵ پێشکەوتنی نەتـەوە هـاودەم بـێ و دەربـەرێت و، بـەپێی پێویسـتییە هزری و کردەیی و کۆمەڵایەتی و پیشەسازییەکانیدا ڕابگات، بەڵام دواکەوتنی زمان لە دەربردنی رۆژگار و گونجانی داخوازییەکانی ژیـان، واتـای سسـتییەو سستییش، رەوشی زیندووییە...!

یاسـاکانی هەڵبـژاردنی سروشـتی، لـە زمـان و بـەکارهێنان و رۆژگـار و گەشەکردنی سـەلیقەی زمانـەوانی و گشـتیی نەتـەوە کـار دەکـات، دەبیـنین هەنـدێ واژە لاوازن، کەچـی لەگـەڵ ڕۆژدا، بـەهێز دەبـن، هەنـدێکی تـر وا دەردەکـەون بــەهێز و دروســت بــن، کەچــی لــە بــەردەمی کــارپێکردن و تاقیکردنەوەدا خۆیان پێ ڕاناگیرێت.

هەندێ جـار، لـە ژیـانی واژەو زاراوەکانـدا بـازی وا روودەدات، کـە واتـای واژەکە لە روخساری بەکارهێنانە کۆنەکەیەوە، دەگۆڕێـت بـۆ بـەکارهێنانێکی نوێ، بۆ نموونە:

لە (المعجم الوسیط)دا، لە واتاکـانی وشـەی (المنظـار)دا دەڵێـت: ئاوێنـەو میکرۆسکۆپ و تەلسکۆپ و (منظار میدان) بەنموونەی وشەکە دێنێتەوە، کـە

ئەمەی دوایی، تەنیا ناونراوە لەو چوار ناونراوەی ئەمڕۆ واژەی (منظار)یان بەسەردا بسەپێت، هەروەها لە واتای (مجهر)دا، هەمان فەرهەنگ دەڵێت: مجهر، (مجهار)ەو مجهاریش ئەو کەسەیە بەدەنگی بەرز قسە دەکات، یان ئامێرێکە، لەرەی کارەبایی لێوە دەردەچێت و، پێی دەڵێن (میکرۆفۆن)، فەرهەنگەکە لە شوێنێکی تردا دەڵێت، (مجهر) میکرۆسکۆپە، بەڵام بەکارهێنان، ئەم واژانەی کە لە بنچینەدا یەك بابەتن، بێژاوەتەوە و (مجهر)ی جیاکردۆتەوە بۆ واتای میکرۆسکۆپ و، (مجهار)یشی تەرخان کردووە بۆ واتای میکرۆفۆن و وای لێ هاتووە بەکارهێنانی (مجهار) بۆ ئەو کەسەی دەنگ بەرز دەکاتەوە تەنیا (خوازە)یەو هیچی تر، لەبەرئەوەی بەمیکرۆفۆن شوبهێنراوە.

کاری وەرگێڕانی (یان کوردانەدنی) زاراوە زانستی و هونەرییەکان و تەنانەت کاری وەرگێڕان بەگشتی، هی ئەوە نییە هەر کەسێك بیەوێ بیکات، چونکە وەرگێڕان پیشەو هونەرە، بۆیە پێویستە نەوەیەك پسپۆڕ و تایبەتمەندی بواری وەرگێڕان و کوردانەدن، بەتایبەتی بۆ بواری وەرگێڕانی زانستیی هونەری ئامادە بکەین.

گرنگترین شت، کە بووە بەهۆی سەرنەکەوتنی وەرگێڕانی زانستی لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا و خزمەتی ئەو بیروڕایەی کرد کە دەڵێت: زمانی کوردی ناتوانێت زانستی نوێ دەربڕێت و وتنەوەو فێرکردنی بابەتە زانستی و تەکنۆلۆجییەکان بوو بە زمانی بیانی و نەبوونی ئەو نەوە پسپۆڕ و تایبەتمەندەن.

هونەرکارانی کورد، وەك ئەندازیار و پیشەساز و پسپۆرانی لقەکانی زانستی نوێ، کە زۆربەیان لە وڵاتانی دەرەوە خوێندوویانە، لەگەڵ ئەوەشدا

کە لە بواری پسپۆڕیی خۆیاندا توانا و جوانکار و داهێنەر بن، بەڵام بەداخەوە دەربارەی ڕێزمـان و بنـەماکانی وەرگـرتن و داڕشـتن و زاراوەسـازی بـەزمانی نەتەوەیی خۆیان هیچ زانیارییەکیان نییەو مرۆڤ ناتوانێ تەنانەت پسـپۆڕێك و مرۆڤێکی ئاسایی لێك جیابکاتەوە ئەگەر بەکوردی بدوێن، بەڵام ئەندازیارێکی ئینگلیـز یـان فەڕەنسـی یـان ئێرانـی و تـورك و هـی تـریش، ئەگـەر بـەزمانی نەتەوەیی دوان، یـان نووسـییان، دەتـوانن لـە ئاسـتێکی وا دابـن کـە لەگـەڵ پسپۆری و ڕووناکبیری و ئاستی زانسـتییاندا بگونجـێ، بـدوێن یـان بنووسـن، بەڵام ئەوانەی ئێمە ناتوانن، نـە بـدوێن و نـە بنووسـن و، تـا یـەکێك لـەو دوو زمانەکەی وەرگێڕ لاواز بێت، کەم و کـووڕیی وەرگێڕانەکـەی زۆرتـر دەبێـت و تێکدان و شێواندن و زیانەکە، زۆرتر زمانە لاوازەکەیان دەگرێتەوە کە زمـانی نەتەوەییە، لای هونەرکارانی ئێمەو، ئەو بەرپرسییەش لە ئەستۆی سیستمی فێرکردندایە.

وەرگێـڕان لای ئێمـە، هـەنگاوی باشـی نـاوە، بـەهۆی دەسـتەیەك لـەو ڕووناکبیرانەوە کە پسپۆڕی و هەوڵی تایبەتیی خۆیان وای لێ کردوون، بڕێکـی باش زانسـتەکانی زمـان فێـربن و شـارەزایی لـە بنەچـەو ڕێزمانەکەیـدا پەیـدا بکەن، کە ڕۆژنامەنووس و ئەدیبـەکانن، ئـەوانیش بێگومـان، بابـەتی زانسـتی وەرناگێڕن بـەڵکو زۆربـەی هـەوڵ و کۆششـیان بـەرەو وەرگێڕانـی ئـەدەبی و کۆمەڵایەتییە و زۆر جوانکار و داهێنەریان تێدا هەڵکەوتووە، بەڵام وەرگێڕانی هونەریی زانستی و تەکنۆلۆجی، ناتەواو ماونەتـەوەو نەگەیشـتوونەتە ئاسـتی پەسەند لەڕووی هونەری و زمانییەوە، ئەوەیش تـەرخانکردنێکی نامەبەسـتی بیرۆکەی نەگونجاوی و نەشـیاویی زمـانی نەتەوەییـە بـۆ گوزارشـتی زانسـتە نوێیەکان و هونەرە پیشەسازی و تەکنۆلۆجییەکان.

بــەهیوام، لــەم بارودۆخــە نوێیــەی کوردســتان، دەزگــا بەرپرســەکانی کولتوور و پەروەردە، بەرنامەیەکی خوێندن بەشـێوازێکی زانسـتی و نوێیـاو، بۆ ئامادەکردنی پسپۆڕانی وەرگێڕان ئامادە بکەن و خوێندکاران لە ئەنجامـدا پلەیـەکی زانسـتییان بـدرێتێ لـە وەرگێڕانـی زانسـتی یـان ئەدەبیـدا، بـەپێی بەهرەو شایستەیی خۆیان، بەمەرجێك یەکێك لـە پێداویسـتییەکانی وەرگـرتن لــەو بەشــەدا بــوونی بڕوانامــەی بەکالۆریۆســی ئــاداب یــان زانســت بێــت و بەرنامەیەکی خوێندنی دوو ساڵە سازبکرێت بە فێرکردنێکی خەست و خـۆڵ و چــڕوپڕی بنــەماکانی زمــانی لێ گــوێزراوەو بــۆ گــوێزراوەو ئەدەبــەکانیان و ڕێساکانی پێوانەو وەرگرتن و بینینی وەرگێڕدراوە نایابەکانی ئەو شـاکارانەی لە یەکێکیانەوە گوێزراوەتەوە بـۆ ئـەوەی تریـان، خوێنـدنێکی بـەراوردکاریی ئەو هاوواتا و زاراوانەی کـۆڕە عەرەبییـەکان و خـاوەن فەرهـەنگ و رابـەرانی وەرگێڕان لە چـەرخی راپـەڕینی کـۆن و نوێیـدا دایاننـاون، سـەرباری ئـەوەی سەرپـەرشـتانی ئـەو بەرنامەیـە، بەباشـی دەزانـن بـۆ پێویسـتەمەنییەکانی شایستەیی ئەم تایبەتمەندییە فرەلایەنە.

پێگەیاندنی نەوەیەکی وای تایبەتمەندی وەرگێڕانی هونەری و زانستی، وا لــە گــۆڕدان بــەرەو کوردانــدنی فێرکــردن لــە هــەموو بــوارە زانســتی و پیشەســازییەکان دەکــات، کــارێکی کردەیــی و ئاســان بێــت و شــارەزایانی وەرگێـڕان، بـۆ دامـەزراوە پیشەسـازی و نـەوتی و بەرژەوەندییـە گشـتی و تایبەتییەکان دەستەبەر بکات، کە بتـوانن لـە بـوارە تایبەتییەکانـدا زاراوەی باڵا ئاست و واتا دیاریکراو پێشکەش بکەن، بەوەیش بەشداری بکـەن لـەوەدا کەوا لە زمانی نەتەوەیی بکەن، ئاوێنەیەکی راستگۆی ئەو ئاستە شارستانییە بێت کە تێیدا دەژین و دەمانەوێ زمانەکەمان هاودەم و هاوڕێمان بێت...

# بەشی یەکەم
# سەرەتایەکی زانستی نوێی زمان

زمانزانیی نوێ، بابەتێکی تازەیە، خۆراواییەکان دەستیان پێ کرد، بنەماکانی چەسپین و لق و پۆپی زۆری لێ بووەوەو بوونە بەرنامە یان قوتابخانەی تایبەت، کە زانا کۆششکارەکانی ئەم زانستە دایان مەزراند، سەرەتای ئەم زانستە، پەیوەستە بەدەرچوونی کتێبی زمانزانی سویسری "فەردیناند سویسۆر"ەوە کە ناوی " Course de Linguistique Generale"یە.

ئەم کتێبە، بە سەرکەوتن، یان شۆڕشێکی نوێ دادەنرێ، بەسەر بەرنامە کۆنەکاندا و سەرەتاو بنچینەی تیوورییەکی نوێیە لە ڕێساو بنەماکانیدا.

زمانزانی (زانستی زمان)، بابەتێکی کۆنەو بوارێکی پان و بەرینی تۆژینەوە دێرینە کۆنباوەکانی گرتۆتەوە، تۆژەرەوە دێرینەکان، زۆر بایەخیان بەدروستبوونی زمان داوە و ئەم بابەتە پایەیەکی تایبەتیی هەیە لە تۆژینەوەی مرۆڤی کۆن و ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە کۆنانەیدا، کە ئەندامانی کۆمەڵە سەرەتاییەکان پێکەوە دەبەستن.

بێگومان، یۆنانییەکان بایەخێکی زۆریان بەکێشەی زمان داوە، کە بابەتێکی فەلسەفییەو بوارێکی فراوانی نووسینە فەلسەفییەکانیانی داگیر کردبوو، فەیلەسووفەکانی یۆنان، زۆر سەرقاڵی بنەمای زمان بوون بەوەی کە ئاخۆ خەڵاتێکی خوایە بۆ مرۆڤ، یان دەستکردی مرۆڤ خۆیەتی...!، ئەم دۆزە بابەتی کۆشش و جیاوازیی بۆچوونیان بوو، هەر بەوانیشەوە

(یۆنانییەکانەوە) نەوەستا، چونکە دەبینین زانایانی عەرەب و ئیسلامیش لەو دۆزە کۆڵیونەتەوەو باسی تیووریی راگیرکردن و سروش و تیووریی بنچینەیی مرۆڤیان کردووە.

"ئەرستۆ"ی فەیلەسووفی یۆنان، کۆششی زۆری هەبووە لە بوارەکانی زمانەوانیدا و، لەو بوارەدا، وتە و هێمانەکانی چەسپاند کە (ناو) و (فرمان) و ئامراز و تیپەکان بوون.

دابەشکردنەکانی ئەرستۆ لای تۆژیاران شتێکی پەسەند بوون، هەندێ تۆژیاری عەرەب و ئیسلام، لەم سەردەمەدا، کەوتنە گومانەوە لەوەی کە رێزمانی عەرەبی لەسەر پێودانگی رێزمانی یۆنانی دامەزرابێ و زاراوەکەی لەوەوە وەرگیراوەو دکتۆر ئیبراهیم مەدکوور، لە وتارێکیدا کە لە گۆڤاری زمانی عەرەبیدا لە قاهیرە بڵاوی کردۆتەوە، ئاماژەی بۆ ئەوە کردووەو وای بۆ چووە کە خەلیلی کوڕی ئەحمەدی فەراهیدی، زانستەکەی لە حەنین کوڕی ئیسحاق وەرگرتووە کە یۆنانیی زانیوەو زانستە یۆنانییەکەی وەرگێڕاوە بۆ سریانی.

کاریگەریی یۆنانییەکان، بەسەر تۆژینەوە زمانەوانییەکانەوە مایەوە لەگەڵ بوونە باوی لاتینی و جێی خۆگرتنیشی لەم بوارەدا.

ئەم شێوازە لێکۆڵینەوەیەی زمان، تا چەند سەدەیەك بە فەلسەفە کارتێکردوویی مایەوە، دواتر بۆ توێژەرەوە خۆراواییەکان دەرکەوت کە دەبێ بازنەی تۆژینەوە زمانەوانییەکانیان فراوان بکەن و خوویان دایە زمانە خۆرەڵاتییەکان، کە لای ئەوان پێیان دەوتن (زمانە سامییەکان) و بایەخێکی زۆریان بە (عیبری) و دوای ئەویش بە (ئارامی) و (عەرەبی) دا، لە ئەنجامی خوودانە تۆژینەوەی (سەردەمی کۆن) (Ancient Testament) و

(سەردەمی نوێ) (Nouverau Testament)، ئەو توێژەرەوانە هەستیان بەوە کرد، کە (شێوازی تۆژینەوەی بەراوردکاری)، باشترین ڕێگایە بۆ زانینی ئەم بابەتە مێژووییانە، هەروەك هەستیان بەوەیش کرد کە (توێژەرەوە جوولەکەکان) سوودیان لە زمانزانیی عەرەبەکان وەرگرتووە بە بەرنامە و زاراوەوە، چونکە زانیویانە، کە عەرەب و ئیسلام، هەوڵ و کۆششی زۆریان داوە لە زمانزانیی مێژووییدا..

بەڵام توێژەرەوان، لەو بارەیەوە کۆکن، کە ئەو دەقە کۆنە سانسکریتییانەی زانای ئینگلیز "ولیام جۆنز" دۆزینەوە، دۆزینەوەو داهێنانێکی مەزن بوون چەند هەنگاوێك تۆژینەوە زمانەوانییەکانیان بردە پێشەوە، (ولیام جۆنز)، ساڵی ١٧٨٦، لە کەلکەتتا و لە دوانێکیدا بۆ کۆمەڵەی ئاسیایی، ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە لێکچوونێکی زۆر هەیە لە نێوان دەقە سانسکریتییەکان و چەند زمانێکی خۆراواییدا، وەك یۆنانی و لاتینی و جەرمانی و ناخۆراوایی وەك فارسییشدا بۆ نموونە، ئەم لێکچوونە، هانی ئەو زانا ئینگلیزەی دا کە بڵێت: "سەراپای ئەم زمانانە، یەك بنەچەن"، ئەمەیش ڕێنماییەك بوو، بۆ توێژەرەوان، کە ڕێگەی هاوسەنگکاری و بەراوردکاری بگرن، یەکێك لەو زانایانە (راسك) بوو، کە لە تۆژینەوەکانیدا لە بواری پێوەندی زمانی ئایسلەندەیی بە زمانە ئەوروپاییەکانەوە، بۆی دەرکەوت و ئەمەیش بووە رەوتی توێژەرەوان بە درێژایی سەدەی نۆزدەیەم و، ئەو شێوازە مێژووییە بوو، کە لەسەر دیداری زمانەوانی دامەزرابوو..!

لێرەدا پێویستە ناوی (یسبرسن)ی زانایش بەرین، کە پایەی خۆی هەبوو لەو توێژینەوە زمانەوانییانەدا کە لەسەر بنەمای پێوەندی مێژوویی نێوان زمانەکان دامەزرابوون و ئەم زانایە وای بۆ دەچوو کە زمانەکان لە شێوە

کۆتاییه‌کانیاندا ئه‌و (بابه‌تانه‌ن) که‌ (زمانـه‌ کۆنـه‌کانیان) پـێ گه‌یشـتوون لـه‌ بنیاتی که‌مئالۆزتر له‌وه‌ی ئه‌و زمانانه‌ی تێدابوون.

ده‌توانین بڵێین، که‌ چاخی سه‌ده‌ی نۆزده‌یه‌م به‌ڕه‌وته‌ مێژووییه‌که‌یه‌وه‌، کـه‌ له‌سـه‌ر به‌رانبـه‌رکێی نێـوان زمانـه‌کان دامـه‌زراوه‌. بـه‌کۆتایی قۆنـاغێکی زمانزانی (زانستی زمان) داده‌نرێت له‌ گه‌شه‌کردنی مێژووییدا.

توێژه‌ره‌وان، له‌سه‌ر ئه‌وه‌ رێك که‌وتوون کـه‌ په‌یـدابوونی ((فه‌ردینانـد دێ سویسـۆر))، سـه‌ره‌تای سـه‌رده‌مێکی نـوێ و ره‌وتێکـی نـوێ بـوو لـه‌ لێکۆڵینه‌وه‌ی مێژووییدا و، ئه‌م زانایه‌ رایگه‌یاند که‌ لێکۆڵینه‌وه‌ی زمانـه‌وانی و بـه‌راورد و بایه‌خـدان به‌بنچـینه‌و چـۆنێتی په‌یـدابوونی و تازمـان به‌راسـتیی کۆمه‌لآیه‌تیی ره‌وش و واژه‌و واتاو ده‌نگه‌کانی لـه‌و ده‌مـه‌دا ده‌خوێنـدرێت کـه‌ کاری پـێ ده‌کرێـت، ئـه‌م ره‌وشـه‌ به‌رنامه‌یـه‌ی ناونـا "Synchronique" و بابـه‌تی ئـه‌و لێکۆڵینـه‌وه‌ مێژووییـه‌ی کـه‌ بـه‌راوردی کردۆتـه‌ (شـێوازی زاراوه‌یـه‌کی ده‌سـته‌به‌ری)یشـی ناونـا "Diachronique". بـه‌م جـۆره‌ لێکۆڵینه‌وه‌ی زمانه‌وانی، لای ئه‌م زانایه‌، بایه‌خدان بوو به‌زمان لـه‌و واقیعه‌یـدا که‌ تێیدایه‌تی و بنچینه‌و بابه‌ت و واتا و ده‌نگه‌کانی ده‌خوێندرێت، بێ ئـه‌وه‌ی پێوه‌ندییه‌ك په‌یدا بکات له‌نێوان ئه‌و ڕاستییه‌ی که‌ هه‌یـه‌و قۆناغـه‌ مێژووییـه‌ پێشینه‌کانیدا، پێویسته‌ بیر بۆ ئه‌وه‌ نه‌چێت که‌ خوێندنی مێژوویی به‌راوردکار شـتێکی نه‌ویسـتراوه‌، بـه‌ڵکو پێویسـته‌ توێـژه‌ره‌وه‌ به‌وه‌نـده‌ قایـل نـه‌بێ و هه‌میشـه‌ زۆرتـر هـه‌وڵ بـدات و بیکاتـه‌ بابـه‌تی توێژینـه‌وه‌ی و لـه‌وه‌ی تـێ بپه‌ڕێنێت و بترازێنـێ بـۆ گـرنگتر، کـه‌ توێژینـه‌وه‌ی زانسـتییانه‌ی زمانـه‌، لـه‌ راستیی هه‌نووکه‌یی کۆمه‌لآیه‌تییدا، پێی وابوو، که‌ له‌ تۆژینـه‌وه‌ی مێژووییـدا، رێبـازێکی تایبـه‌تی بگرێـت، وه‌ك ئـه‌وه‌ی زمانێـك لـه‌ سـه‌رده‌مێك لـه‌و

سەردەمانەی پێیدا تێپەڕیوە بخوێنێت و لێی بکۆڵێتەوە، لەرووی بنیات و کەرەسەو دەنگەکانیەوە بۆی رۆچوون لە زانینی تەنیا بنچینە مێژووییەکان یان زانینی پێوەندی لەگەڵ زمانەکانی تردا.

لە رێبازی (دێ سویسۆر)دا، جیاکارییەك دەبینین لە نێوان زمانی "Langue" مرۆڤایەتیدا، واتە شتێك کە مرۆڤ دروستی کردبێت، و کردبێتی بەهۆیەکی پێوەندی، واتە زمان، لە کەرەسەو بنیات و رەوشەکانیدا دەگۆڕدرێت بۆ وشەی واتادار لەو رەوشانەی کە زمان هەنی سوود دەگەیێنێت و ئامێری وا پێك دێنێت کە لێکگەیشتن و بەردەوامی دەستەبەر بکات.

بایەخدانی "دێ سویسۆر" بە واژە و پێکهاتنی لە ڕستە و واتاکەی لەو پێکهاتنەدا و شیکردنەوەی بۆ هێمانە دەنگییەکانی و لێکۆڵینەوەی دەنگەکان بە تاك و بە کۆمەڵ و ئەوجا لێکۆڵینەوەی وشە لە رووی پێوەندی بەوشەکەی ترەوە. ئەمانە هەمووی هانی کۆمەڵە توێژەرەوەیەکی دا کە پێڕەویی ئەو شێوازە نوێیە بکەن، نموونە بە یاریی شەترەنج و داشەکانی دێنێتەوەو کە لە تەنیشت یەکترەوە دادەنرێن و هەر داشە بەهایەکی تایبەتیی هەیە لەو دراوسێیەتییەدا نەك بەهای تەنیا خۆی، ئەمە وا دەگەیێنێت، کە وشە لە ڕستەدا بەها و شوێنی خۆی هەیە لە رووی بوونییەوە لەو پێکهاتەیەدا و هەر گۆڕدرانێك لە پێکهاتنیدا، دەبێتە هۆی گۆڕینی واتاو گۆڕدرانەکە، هەر هی شوێنی وشەکە نییە لە رستەدا، لە رووی پێوەندییەوە بە وشەکانی تەنیشتییەوە، بەڵکو لەوە تێپەڕێ بۆ گۆڕینی بنیاتی واژەکە لە رووی دەنگەکانیەوە.

وتمان: توێژەرەوان سوودیان لەو زانا زمانەوانانەی دوای "دێ سویسۆر" وەرگرت لە بەرنامەو کەرەسەی، ئەوەبوو ناونرا "قوتابخانەی پراگ" کە میر "نیکۆلای ترۆپتزکۆی" دایمەزراند.

ئەم ڕابەرە زمانەوانییە، زۆر بایەخی بەدەنگزانی دەدا، لەو ڕووەوە کە کەرەسەیەکی گرنگە لە وشە دروستکردندا، بەپێکەوە لکاندنیان لە چەند پێکهاتەیەکدا.

ئەمریکاییەکانیش شوێنی خۆیان هەبوو لە توێژینەوەی زمانەوانیدا، لە سەرەتاکانی سەدەی ڕابووردوودا (سەدەی بیستەم) و درێژەیان دەدا بەتوێژینەوەکانیان بەپێودانگی ئەوەی ئەوروپاییەکان لەسەری ڕۆیشتوون لە لێکۆڵینەوەی زمانە ئەوروپاییەکاندا.

ئەمریکاییەکان خوویان دایە لێکۆڵینەوەی زمانە ئەمریکاییەکان بەسوود وەرگرتن لە ڕێبازی ئەوروپاییەکان بۆ دۆزینەوەی ڕەوشی ئەو زمانانە و دۆزینەوەی پێوەندییە زمانەوانییەکان لە نێوانیاندا.

ئەمە بوو کە "فرانس بواس"ی زمانەوانی ئەمەریکایی خەریك کردبوو، "ئەدوارد سابیر" و "لیۆنارد بلۆ مفیلد" ناویان دەرکردبوو، هەریەکەیان ڕێگەی تایبەتیی خۆی هەبوو، "سابیر" بایەخی دەدا بە توێژینەوە مێژووییە بەراوردکارییەکان بەڵام ئەوەندەی پێ نەچوو گۆڕی بۆ لێکۆڵینەوەی زمانە هیندییە ئەمریکاییەکان و لە لێکۆڵینەوەکانیدا، ئاماژەی بۆ پێوەندی نێوان ئەو و زانستە مرۆڤایەتییەکانی تر کرد وەك ئەدەب و موزیك، وەك لە کتێبی (زمان)ەکەیدا نووسیبووی.

وتمان، هەریەکە لەو دوو زانا ئەمەریکاییە، ڕێگەی تایبەتیی خۆی هەبوو لە زمانزانیدا و، لەو کاتەدا کە (سابیر) وای نەئەدی کە زمان دیاردەیەکی

(غەریزی) بێت، بەڵکو بەرەفتارێکی مرۆڤایەتیی خۆویست و هۆیەکی دادەنا بۆ دەربڕینی ئارەزوو سۆزە جیاوازەکان، دەبینین، "بلۆ مفیلڈ"، سوودی لە بیر و بۆچوونەکانی قوتابخانەی رەفتاریی پەروەردەیی وەرگرتووە، ئەو قوتابخانەیەی خاوەنەکانی باوەڕیان بەوە نەبوو کە زمان دیاردەیەکی نهێنییە و بەهرەی بیرکردنەوە، شتێکە لە ناخی مرۆڤدا، بەڵکو ئەو کارتێداکردنانەن کە مرۆڤ بە ویستی خۆی و رەفتاری خۆی فێریان دەبێت و پێیان رادێت و دەبێتە دیاردەی رەفتاری. "بلۆ مفیلد" وای دەبینی، کە زۆربەی وشەکان ستەمە بتوانن واتا راستەقینەکانیان دەربڕن وەك لە وشەکانی ئەوین و تووڕەبوون و سۆزەکانی تریشدا، چونکە دوورن لە بواری ماددی وەك وشەکانی تری ئەم بەشە، بەڵام قوتابخانەی ئەمریکایی ئەستێرەی لە پرشنگدانەوەدا بوو بەهۆی تۆژینەوە. (بنیاتییە رێزمانی)یەکەیەوە کە ساڵی ١٩٧٥ داینا، بەم تۆژینەوانە، گەیشتینە ئەوەی ئەم توێژەرەوە بوێرە، ناوی نا "گۆڕینە رێزمانی پەیداکاری" بیروڕاکانی (دێ سویسۆر) کاریان کردبووە (چۆمسکی) و سوودی لێ وەرگرتبوون وەك سوودی لە بیروڕای تریش وەرگرتبوو، واتە ئەوانەی دوای تایبەتمەندیی قوتابخانەی ئەمریکاییش.

(چۆمسکی) وای دەبینی کە مرۆڤ دەتوانێ ڕستە و پێکهاتەی بێ شومار دروست بکات، بەڕەفتارکردنی لەگەڵ خەڵکیدا و، ئەم قاڵبە ئاخاوتنییانە، لە نوێبوونەوەدان لە بارودۆخی نوێی تردا، کە لە بارودۆخی تر ناچێت، ئەمەیش واتە، مرۆڤ دەتوانێ ڕستەی وا ساز بکات، کە بارودۆخەکە بەسەریدا بسەپێنێ، بەو پێیە زۆرەو بێ شومارە و ئەم کەرەسانەی دەچنە بواری پێکهاتەییەوە "لە بنیاتی زمانەوانیدا"، ئەمەیش واتە، توێژەرەوە هەر

دەبێ بایەخ بە لێکۆڵینەوەی دەنگەکان بدات لە (بنیاتی) وشەدا، لەو رووەوە کە (تاکە) و دواتر (کۆ)یە لەگەڵ دەنگەکانی دراوسێیدا توانستی زمانەوانیی تاکەکەس، لەو کۆمەڵە رێسایانەوە دێ، کە مەبەستی پێ دەردەبڕدرێت و ئەم توانستە زمانەوانییەی ئەم رێسایانە، ئیشی ئەو توێژەرەوە زمانەوانییەیە، کە (چۆمسکی) پێی دەڵێت "رێسا گۆڕدرانییەکان" و دەربڕی وتەبێژ، رەنگە پەنا بباتە بەر جۆرە ڕستەیەکی تر، لەکاتی پێویستدا و ئەوەیش مۆرکی دروستکاریی ڕێسا زمانەوانییەکانە، واتە گۆڕینی پێکهاتە ڕێسا، بەڵکو چەندەها رێسای تری نوێ دروست دەکات.

ئەو وای بۆ دەچێت، کە پێویستە تۆژینەوەی ڕێزمانی بکرێت، یان لێکۆڵینەوەی رستە لەڕووی بەشە رێزمانییەکانیەوە و بیگۆڕێت بۆ وشەکە واتای فرمانە لە ڕستەیەکداو واتای ناوە بکەر بێت یان بەرکار، پاش تێپەڕینی ئەم قۆناغە بەتوێژینەوەی دەنگەکانی ئەم بەشانەوە کە لەڕستەکەدا هەبوون.

دەبینیت توێژینەوەی زمانەوانی لە هەموو وڵاتە خۆراواییەکاندا روویان کردۆتە ئاقارێکی نوێ، بەڵام لە قوتابخانەی ئەمریکایی ناچێت. زمانزانە ئینگلیزەکان، بۆ نموونە، لە سەدەی نۆزدەیەمەوە بایەخیان بەدەنگزانی داوە، بەڵام زمانزانی بەها و پایەی بە هەوڵ و کۆششەکانی (ج. ر. فێرث)ی زانا پەیدا کردووە، کە بەدرێژایی ساڵانی (١٩٤٤-١٩٥٦) مامۆستا بوو لە زانکۆی لەندەن و هاوپیشە بریتانیاییەکانی کە پێش ئەو لە دەنگزانییان کۆڵیوەتەوە، ئەوەی نووسیویانە.

ئەم زانایە، بیروڕا کۆمەڵناسییەکانی (مالینۆڤسکی) زۆر کاریان تێکردووە، کە داوای لێکۆڵینەوەی زمانی کرد لەو ڕووەوە کە دیاردەیەکی

کۆمەڵایەتییەو پەیوەستە بەلێکۆڵینەوەی (مرۆڤ)ەوە بۆ خوێندنەوە و لێکۆڵینەوەی زمان لە چوارچێوە کۆمەڵایەتییەکەیدا، (فێرث)ی هان دا کە زمان بخوێنێت لە هێمانە سەرەکییەکانیەوە و، ئەوەبوو دەنگزانی و واتازانیی لێ کەوتەوە، کە پێی دەڵێن لێکۆڵینەوەی دەنگ و واتازانی لە رووی نیشانەو رێنماییەوەو پێی دەڵێن:

## واژەزانی (Semantics).

هەروەك دەبینین، فەرەنساییەکانیش بایەخیان بەبیردۆزی زمانەوانی داوە، رێبازی بەرنامەی مێژوویی و بەراوردکاری و دۆزینەوەی پەیوەندیی نێوانیان زمانە کۆنەکانیان گرت.

دوای ئەوە، لەو سنوورە دەرچوون، بە پەیدابوونی (فێردیناند دێ سوسیۆر)و تا ئێستایش کاریگەرییەکەی بە توێژینەوەکانیانەوە دیارە، بەڵام (قوتابخانەی پراگ) شوێنێکی دیاری هەبوو لە توێژینەوە زمانەوانییەکانی فەرەنساییەکاندا.

# زانستە زمان (زمانی زانستی)

زانستە زمانی نەتەوەیەك، ئەو زمانەیە کە ئەندامانی ئەو نەتەوەیە دەتوانن ئەو زانست و بیرۆکانەی پێی دەخوێننەوە تێی بگەن و فێری ببن، کە وایان لێ دەکات بەهۆی گونجۆکی و وردی و دروستییەوە بتوانن زانستەکە بچەسپێنن و شتی تری بخەنە سەر و داهێنان و جوانکارییشی تێدا بکەن، بەو پێیە پێویستە بۆ ئەوەی زمانێك زانستی بێت ئەم رەوشانەی تێدا بێت:

### (١) ڕوونی و ئاشکرایی:

دەبێ ئەو زمانە، بەئەندازەیەك ڕوون و ئاشکرا بێ، هیچ ئاڵۆزی و نادیاری و تێکەڵ و پێکەڵییەکی تێدا نەبێت، مەبەستی سەرەکیی زانستە زمان ئەوەیە، بتوانێ دیاردەیەك لێك بداتەوە یان ڕێگەیەك ڕاڤە بکات، کە ئەوەیش بە زمانێکی ناڕۆشن و وشەو واتا نادیار ناکرێت.

### (٢) دروستیی بنیاتی زمانەوانی و کورتبڕی:

بۆ ئەوەی بیر و هۆش بەئاسانی تێی بگات، زمانێك ئەم جیاکارییەی دەبێت، کە ئەم هێمانانەی تێدا بێت:

#### أ/ هێماسازی:

ئەو هێمایانە لە تیپەکانی ئەلفبێ ساز دەکرێن و شتە ناسراو و ئاشناکانیان پێ دەردەبڕدرێت، وەك هێمای توخمە کیمیاییەکان و ئەندازەکانی پێوان و هیی تریش..، بۆ نموونە:

O, Oxigen, H, Hydrogen, C, Carbon.. تاد

#### ب/ هاوکێشەسازییە بیرکارییەکان:

ئەو هێما شێوگانەن، کە بۆ دەربڕینی پێوەندییەکی دیاریکراو یان یاسایەك بەکاردێن.

#### ج/ وێنەسازی:

ئەو شێوە هێڵکارییانەن، کە بنیاتێکی دیاریکراو ڕوون دەکەنەوە، وەك بازنە کارەباییەکان یان دامەزراوە تەلارسازی و نەخشەسازی و ئەندازەیی و یەکگرتنە کیمیاییەکان.

### (٣) زاراوەی زانستی:

زانسـتە زاراوە، وشـەیەك یـان زۆرتـرە، كـە شـارەزایان لەسـەری رێـك كەوتوون و تەرخانیان كردووە بۆ ئـەوەی واتـای چـەمكێكی دیـاریكراو بێـت، بۆیـە دەبـێ هـەر زاراوەیـە بـۆ یـەك واتـاو هـەر واتایـەیش زاراوەیـەكی بـۆ بەكاربهێندرێت.

### (٤) دەبێ راستیی شتەكان بێت و زۆر بایەخ بەڕواڵەت نەدرێت:

كـە وتمـان، دەبـێ روونـی، شـەقڵێكی زمـانی زانسـتی بێـت، مەبەسـتمان ئەوەیە، زۆر كەس لە ئەدەب و شیعر دەدوێن و بۆ نموونـە: دەڵـێن فڵانكـەس وای وت و فیساركەس وا، دەشێ ئەو دوو بۆچوونە پێچەوانەی یەكتر بن، یان رەنگە یەكێك بیەوێ، بـیرورا جیاوازەكـانی ئـەدیب، شـاعیر، یـان سیاسـییەك بخاتە بەرچاو و، هەوڵ دەدات دژوارییەكانی یەك بخات، یان بیروڕای جیاوازی خەڵكی لەسەر پیشان بدات، ئەم شێوازە شەقڵی زانستی زمان نییە، بەڵام كە وتەی زانایەك لە بوارێكی زانستییدا باس كرا، ئیتر نابێ وتەی هـیچ زانایـەكی تر لەو بوارەدا باس بكرێ بـا مێـژووی زانسـت و ئـەدەب، لێكـەوە نزیـك بـن، بەڵام راپۆرتی زانست لە هیی ئەدەب جیـاوازە، هـەر بـەو پێیـەش مشـتومڕی فەلسـەفەو زمـان و (وتەسـازی) وەك لـە زمـان و رێزمانـدا دەوتـرێ و (بـیرورا تەرخانكردن) وەك لە سیاسەت و ئابووریدا دەوترێ، (زانستی زمان) نییە...

### (٥) ژیربێژی:

زمانی زانست، پێویستی بەژیربێژی هەیە كـە بـەرودوایی راسـتی روودانـی شتەكان ڕەچاو بكات، وەك (هۆ) پێش (ئەنجام) خستن و (لق) بردنەوە سـەر (بنەما).

### (٦) گشتگیریی ڕەوشی زانست:

ڕەوشی زانست، بەتەنیا تەرخانکراوی لایەنەکانی زانیاریی مرۆڤ نییە لە جیهانی ژمارەو سروشتدا، بەڵکو دەتوانرێ بەهەموو لقێك لە لقەکانی زانیاریی مرۆڤایەتی بوترێ، ئەگەر مرۆڤ ڕێگەی وردی و روونی و ژیربێژی بگرێت لە تۆژینەوەکانیدا.

### (٧) شەقڵی تری زمانی زانستی:

وەك، خۆپاراستن لە شێوە ڕەوانبێژییەکان، وەك لێکچوواندن و خواستە و دەستەواژەسازی و توانجسازی لە زمانی زانستیدا، چونکە زانستە زمان، زمانێکە واتاکانی راستەوخۆن و ئەو جۆرە هونەرسازییانەیان ناوێ کە نیشانەی شارەزایی کەسەکەن، بۆ رازاندنەوەی دەربڕین و ڕاستی شاردنەوەو گزیکاریی لە ڕاستیی رووداو، بەپێوەنان و پیاهەڵدان، چونکە وردیی زانستی لەنێوان (زۆرڕەوی و سستڕەوی)دایە، کە ئەمسەر و ئەوسەری پێوەنانن.

**دووەمیان:** یەکێتیی پێکهاتنە چەمکی ڕستەی زانستی، ئەگەر زانستنووسێك، ئاگری بە "سوور" یان بنەوشەیی باس کرد، پێویستە مەبەست لەوە ڕەوشی ڕەنگی گڕەکە، یان جۆری سووتەمەنییە گڕگرتووەکە پیشان بدات، نەك ڕەنگی ئاگر و ڕەنگی پۆشاك و لاجانگ و لێوی خۆشەویستەکەی، (ئەم) ڕێگەیەکە و (ئەو) ڕێگەیەکی تر..!

**سێیەمیان:** پابەندیی زمانەوانی و بیرکاریی دەربڕینە دیاریکراوەکان، ئەگەر زانایەك ویستی دووریی هەسارەیەك لە زەوییەوە دەرببڕێت، دەبێ لە دەربڕینە نادیار و دیارینەکراو و ئاڵۆزەکان دوورکەوێتەوە، وەك ئەوەی بڵێت:

سەدان میل یان، چەند ساڵێکی رووناکی لە ئێمەوە دوورە، ئەمە واتەی وتاربێژ و قسەکەری بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنە، بەڵام زانا دەبێ پابەندی

ژمارەی ورد و دیاریکراو بێت، چونکە لای ئەو، واتای ئەنجامێکی زانستی دەگەیێنێ کە پەیوەستە بەشێوازی پێوەندی بە هەسارەکەوە و کاریگەریی ئەو لەسەر ئاو و هەوای زەوی و کایە موگناتیسییەکان و کێشەکانی تری ئاسمانەوانی.

بەواتایەکی تر، پێویستە چەمکی زانستی و ئەو زمانەی پێی دەردەبڕدرێت تەواو جووت بن، کە لە هونەری ڕەوانبێژیدا پێی دەڵێن (یەکسانی)، بەرانبەر (کورتبڕی و درێژبڕی)ی زمانی ئەدەبی کە زۆر بەکاردەهێنرێت...

# بەشی دووەم

## ١-"تیووریی گشتیی زاراوە دانان و یەکخستن و تۆمارسازی"

پێشکەوتنی زانیاریی مرۆڤ و تەکنۆلۆجیا و ئابووری، تارادەیەکی زۆر پشت بەزانیاریگۆڕکێ و تۆمارکردنی دەبەستێ و ئەو چەمك و زاراوانە بەکاردەهێنرێن کە وەك بنچینەی ڕێکخستنی بیرۆکە زانستییەکان و کۆکردنەوەی زانیاریی تر هێما دەکرێن.

بەڵام زوو گەشەکردنی زانیارییە مرۆییەکان، بووە هۆی گرانیی دۆزینەوەی زاراوەی پێویست و گونجاو، چونکە هاوڕێژەیی و هاوتاییەك نییە لە نێوان ژمارەی چەمکە زانستییەکان و ژمارەی ئەو زاراوانەدا کە دەریان دەبڕن، چونکە ڕەگەوشەکانی هیچ زمانێك لە چەند هەزارێك تێناپەڕن، بەڵام چەمکەکانی ملیۆنەها دەبن و، هەمیشەیش لە زۆربوون و نەشونمادان...!،

بۆ نموونە لەبواری ئەنـدازەی کارەباییـدا، ئێسـتا چـوار ملیـۆن چـەمك زۆرتـر هەیـە، بـەڵام گـەورەترین فەرهـەنگ بەهـەر زمانێـك بـێ، شـەش سـەد هـەزار گوزەری تێدا نییە، لەبەر ئەوە هەموو زمانێك بۆ دەربڕینی چەمکە نوێیەکان، پەنا دەباتە بەر داتاشین و لێکدان و بەشداریی واژەیـی و ڕێگـەی تـر، ڕەنگـە ئەوەیش ببێتە هۆی پشێوی لە ئاستی نیشـتمانی و جیهانییشـدا، بەتایبـەتی کە پۆلێنی چەمکەکان و ڕێگەی دەربڕینیـان، لـە زمانێکـەوە بـۆ یـەکێکی تـر دەگۆڕێت و، دەبێتە هۆی گرانیی زانیاریگۆڕکێ و نەشونمایان، بۆیە پێویستە ئەو بنەمایانە یەك بخرێن کە کار دەکەنـە دۆزینـەوە و گـۆڕینی چـەمکەکان و دانانی زاراوە بەرانبەرەکانیان.

لێرەوە، زاراوەزانی هاتە کایـەوە، کـە زانسـتێکی نوێیـە، لـەم سـەدەیەدا پەیدابووەو هێشتا لەباری نەشونما و تەواوکاریدایە.

### ٢-"پـەیدابوون و نەشونمای زاراوەسازی"

لە سـەدەی ڕابـوردووەوە، زانایـانی زینـدەوەرزانی و کیمیـا لـە ئـەوروپا، دەستیان کرد بەیەکخستنی بنەماکانی زاراوە دانان لە سەرانسەری جیهانداو، ئەم بزاڤـە وردە وردە نەشـونمای کـرد و لـە نێـوان سـاڵانی ١٩٠٦ و ١٩٢٨دا، فەرهەنگی وێنەداری زاراوە تەکنۆلۆجییەکانی (شلۆمان) دەرچوو، لە شـازدە بەرگـدا و بـە شـەش زمـان، بـەهای ئـەو فەرهەنگـە لەوەدایـە، کـە تیمێکـی شارەزای نێودەوڵەتی داینـاوەو زاراوەکـانی ئەلفبێیانـە ڕیـز نـەکراون، بـەڵکو بـەپێی چـەمکەکان و پێوەنـدی نێوانیـان ڕیـز کـراون، بـەجۆرێك کـە پـۆلێنی خودی چـەمکەکان بەشـداری دەکـات لـە ڕوونکردنـەوەی واتـای زاراوەکـان و لێکدانەوەیانـدا و سـاڵی ١٩٣١ کتێبـی (یەکخسـتنی نێودەوڵـەتیی زمانـەکانی

ئەندازە)، بەتایبەتی ئەندازەی کارەبایی، دەرچوو لەلایەن (فیستەر)ەوە (Wuster) کە مامۆستای زانکۆی ڤییەننا بوو، ساڵی ١٩٧٧ کۆچی دوایی کرد، دوای ئەوەی بنەماکانی ئەم زانستە نوێیەی چەسپاند و زۆربەی زمانەوانان و ئەندازیاران ئەم کتێبەیان بە یەکێك لە چاوگە گرنگەکان دانا لە پیشەکەیاندا و، ساڵی ١٩٣٦، لەسەر داوای یەکێتیی سۆڤێتیی جاران، بە نوێنەرایەتیی ئەکادیمیای زانستیی سۆڤێتیی (لیژنەی تەکنیکیی زاراوە) پێك هات لەناو (یەکێتیی جیهانیی کۆمەڵەی پێوانە نیشتمانییەکان ISA)دا، کە دوای شەڕی جیهانی، لیژنەیەکی نوێ (لیژنەی تەکنیکی)، شوێنی (لیژنەی تەکنیکیی زاراوە)ی گرتەوە، کە تایبەتمەندە لە دانانی بنەماکانی زاراوەو ڕێکخستنیاندا و بەشێکە لە (ڕێکخراوی جیهانیی یەکخستنی پێوانەیی (ISO)) کە مەڵبەندەکەی لە جنێفەو (فێرگەی نەمسایی پێوانەکان) لە ڤییەننا، ڕازگریی (لیژنەی تەکنیکی)ی گرتۆتەوە ئەستۆ.

ئەم لیژنەیە، بەهەوڵ و کۆششێکی زۆر و بەرچاوی لە بواری (یەکخستنی بنەماکانی زاراوە دانان)دا، وەك لە لاپەڕەکانی داهاتوودا باسی دەکەین، ناسراوە.

ئۆدوین هۆڵمسترۆم (Holmstrom)، یەکێکە لە گەورە شارەزایانی یونسکۆ، کە هانی ئەو ڕێکخراوە جیهانییەی دا، (فەرمانگەی زاراوە نێودەوڵەتییەکان) دابمەزرێنێ و پارەی پێویستی بڵاوکردنەوەی بیبلۆگرافیایەکی دوو بەرگی تەرخان بکات، کە ناونیشانی فەرهەنگە تایبەتمەندەکانی زانست و تەکنۆلۆجیایان تێدایەو لەم ساڵانەی دواییدا چاپێکی نوێی لێ زیادکراوی بڵاوکرایەوە.

ساڵی ١٩٧١، بەهاوکاریی نێوان یونسکۆ و حکومـەتی نەمسا، مەڵبەنـدی نێودەوڵـەتیی زانیارییـە زاراوەییـیـەکان (Infoterm) لـە ڤییـەننا دامـەزراو مامۆستا هەڵمۆت فێلبەر (Felber)، مامۆستای زاراوەسازیی زانکۆی ڤییەننا بـەڕێوەی دەبـات، کـە بـەکارایی و چـالاکیی فراوانـی لـەو بـوارەدا ناسـراوە، گرنگترین ئامانجەکانی ئەو مەڵبەندە، ئەمانەن:

(١) هاندانی تۆژینەوە زانستییەکانی بیردۆزی گشتیی زاراوەسازی و دانان و تۆمارکردنی زاراوەو سازکردنی خولی راهێنان لەو بوارەدا.

(٢) تۆمارکردنی ئەو زانیارییانەی کە پێوەنـدییان بـە زاراوە و دامـەزراوە نیشتمانی و نێودەوڵەتییە گشتییەکانی ئەو بوارەو شارەزایان و پرۆژەکانەوە هەیە.

(٣) رێکخسـتنی هاوکـاریی نێودەوڵـەتیی بـواری زاراوە و ئـاڵوگۆڕی و زانیاریگۆڕکێ لەو بارەیەوە.

(٤) لێکۆڵینـەوەی توانسـتی هاوکـاریی نێـوان بانکـەکانی زاراوە و بنچینەکانی زانیاریگۆڕکێی نێوانیان، ئەم مەڵبەندە، چەند کـۆنگرەو کـۆڕێکی جیهانیی سازکرد.

**یەکەمیان**: (یەکـەم کـۆڕی جیهـانی دەربـارەی هاوکـاریی نێودەوڵـەتیی بواری زاراوە) بوو کە ساڵی ١٩٧٥ لە ڤییەننا ساز کراو بە روونی، پێویسـتیی رێکخـراوە نێودەوڵەتییـەکانی هاوکـاریی زانیاریگۆڕکـێ دەربـارەی زاراوە و ئارەزووی زۆری خۆی لـەو بـوارەدا خسـتەڕوو، یـەکێك لـە ئەنجامـەکانی ئـەو کـۆڕە، ئامـادەکردنی رابـەرێك بـوو بـە نـاوی رێکخـراوە کاراکـانی بـواری زاراوەسـازی و چـالاکییەکانیانەوە لەبەرئـەوەی چـەند کەڵـە رێکخراوێکـی

نێودەوڵـــەتی، بەپەرۆشـــەوە کۆمپیوتـــەریان بـــەکارهێنا بـــۆ هـــەڵگرتن و تۆمـارکردنی زاراوەو پێویسـتیی رێککـەوتن لەسـەر ئـەو بنـەما جیهانییانـەی زانیاریگۆڕکێ ئاسـان دەکـەن، مەڵبەندەکـەی ڤییـەننا، لـە نیسـانی ١٩٧٩دا، یەکەم کۆنگرەی ئەو بانکە نێودەوڵەتییانەی زاراوەی ڕێکخست بەمەبەستی:

(١) چەسپاندنی بنەماکانی هاوکاریی نێودەوڵەتیی بواری زاراوە زانستی و تەکنۆلۆجییەکان و ئاڵوگۆڕیان و مەرجەکانی ئەم هاوکارییە.

(٢) گەشەپێکردنی ئەو کۆمەڵـە بنچینە رێنماییـەی دامەزرانـدنی بـانکی نوێی زاراوە ئاسان دەکات.

(٣) بەرچاوخســـتنی بیرۆکەیـــەکی ڕوونـــی ئـــەو کێشـــە ســـەرەکییانەی ڕووبەڕووی بانکەکانی زاراوە دەبنەوە و پێشنیازکردنی چارەسەر بۆیان.

مەڵبەندی زانیارییـە نێودەوڵەتییـەکانی زاراوە (Infoterm) بـەهاوکاریی ئەکادیمیای زانستیی سۆڤێتیی، کۆڕێکی جیهانیی دەربارەی کێشە تیووری و بەرنامەیییـەکانی زاراوەسـازی لـە مۆسـکۆ ڕێکخسـت، لـە نێـوان (٢٧–٣٠)ی تشـرینی دووەمـی ١٩٧٩دا بـۆ لێکۆڵینـەوەی فەرهەنگسـازی و بـارودۆخی هەنووکەیی و توانستی گەشەپێکردنی و کێشەکانی ڕێکخستن و هاوئاهەنگی و ڕێکخســـتنی زاراوەو فێرکردنـــی زاراوەســـازی و پێوەنـــدی زاراوەســـازی بەزانسـتەکانی تـرەوە، کۆڕەکـە، لـە کۆتـایی کۆبوونەوەکانیـدا، پێویسـتیی قووڵکردنەوەی هاوکاری و ئـاڵوگۆڕی بـیروڕا و شـارەزایی لـە هـەردوو ئاسـتی نیشـتمانی و جیهانیـدا، بـۆ چـارەکردنی کێشـە تیـووری و بەرنامەیییـەکانی زاراوەسـازی و گەشـەپێکردنی نموونەیـەکی بـانکی زاراوەی تایبـەتی چـەند بوارێکی دیاریکراوی راسپارد، هەروەك خۆزگەی خواست کە ئاکاری کاروباری هەڵسـووڕاوانی بـواری زارەوەو سروشـتی کارەکانیـان و کۆکردنـەوەی ئـەو

بەرنامــە زانکۆییپیانــەی کــە بــەکاردەهێنرێن، یــان ڕەنگــە لــە خوێنــدنی زاراوەسازیدا بەکاربهێنرێن، دابنرێت و پێویستیی وڵاتە گەشندەکانیش ڕەچاو بکرێت.

دوا کۆنگرە، لە بواری زاراوەسازیدا (کۆڕی جیهانیی دەربارەی کێشەکانی هاوواتــایی و پێناســاندنی زاراوەســازی بــوو، کــە لــە (کوبیــك)ی کەنــەدا و لــە حوزەیرانی ١٩٨٢دا و، کۆڕی تایبەتیی زاراوەســازی، لــە کــۆنگرەی جیهــانیی فەرهەنگسازان لە زانکۆی ئەکستەر کە ئەیلولی ١٩٨٣دا سازکران.

## ٣-"پێناسەی زاراوەزانی"

لەگەڵ ئەو گەشەکردنە مەزنەی زانست و تەکنۆلۆجیا و نەشونمای خێرای هاوکاریی نێودەوڵەتیی، پیشەسازی و بازرگانی و بەکارهێنانی کۆمپیوتــەردا، بۆ کۆکردنەوەو هــەڵگرتنی زاراوەو چارەســەر و ڕێکخســتنیان، ڕێگــەی کــۆنی کۆکردنــەوەی زاراوە و ئــەلفبایی ڕیزکردنــی و دانــانی بەرانبــەرەکانیان لــە زمانــەکانی تــردا، بەشــی پێویســتییەکانی ســەردەمی نــەدەکرد، بۆیــە، زانــا تایبەتمەندەکان و، زمانەوان و فەرهەنگسازان، گەشەیان بــە زانســتێکی نــوێ کرد و ناویان نــا (زاراوەزانــی) کــە بەگشــتی دەتــوانین بــەم جــۆرە پێناســەی بکەین:

"*<u>ئەو زانستەیە، کە لە پێوەندی نێوان چەمکە زانســتییەکان و ئــەو زاراوە زمانییانەدا کە دەریان دەبڕن</u>*" دەدوێ و، زانستێکی هاوبەشە لەنێوان دەقــی زانستەکانی زمان و لۆجیك و راگەیاندن و بوارە تایبەتمەندە زانســتییەکاندا و ئەم زانستە بۆ تایبەتمەندانی زانســت و تــەکنۆلۆجیا و وەرگێــڕ و کارمەنــدانی

ڕاگەیاندن و هەموو ئەوانەی کە پێوەندییان بە پێوەندییە پیشەیییەکان و هاوکاریی زانستییەوە هەیە، گرنگە.

لە ڕاستیدا، زاراوەسازی، لە سێ لایەنی پەیوەستی تۆژینەوەی زانستی و لێکۆڵینەوەی بابەتی دەدوێت، کە ئەمانەن:

یەکەم: زاراوەسازی، لە پێوەندیی نێوان چەمکە پێکداچووەکانی (ڕەگەز– جۆر، گشت– بەش) دەدوێ، بەشێوەی سیستمەکانی ئەو چەمکانە پیشان دەدرێت، کە بنچینەی دانانی ئەو زاراوە پۆلێنکراوانە پێکدێنێت کە لە زانستێك لە زانستەکاندا، گوزارشتیان لێ دەکات.

دووەم: زاراوەسازی، لە زاراوە زمانییەکان و پێوەندییەکانی نێوانیان و ڕێگەکانی دانانیان و ئەو سیستمانەی کە پیشانیان دەدەن لە بنیاتی زانستێك لە زانستەکان دەدوێت و بەو پێیە، زاراوەزانی، لقێکی تایبەتە لە لقەکانی واژەزانی یان وشەزانی (Lexicolgy) و زانستی گەشەکردنی واتای واژەکان (Semasiology).

سێیەم: زاراوەسازی، لەو ڕێگە گشتییانە دەدوێ کە دەبنە هۆی دروستکردنی زمانی زانستی و تەکنۆلۆجی بێ گوێدانە کارپێکردنە کردەیییەکانی خودی زمانێکی سروشتی، بەوەیش زاراوەسازی، دەبێتە زانستێکی هاوبەش لەنێوان زانستی زمان و لۆجیك و بوون و ڕاگەیاندن و بابەتە تایبەتمەندەکان و زانیاریزانی (Epistimology) و پۆلێنکردن، هەموو ئەم زانستانە لەلایەنێك لە لایەنەکانیاندا لەشێوە ڕێکخستنی پێوەندیی ئاڵۆزی نێوان چەمك و زاراوە دەدوێن.

## ٤-"تیووریی گشتیی زاراوەسازی"

هــــەروەك (زمــــانزانیی گشـــتی)، لــــە تۆژینــــەوەی سروشـــتی زمــــان و سیستمەکەی دەدوێت بەشێوەیەکی گشتی، لە کاتێکدا (زمانزانیی تایبـەتی)، زمــانێکی دیـــاریکراوی لێکۆڵینـــەوە و شـــیکردنەوەیە، تیـــووریی گشـــتیی زاراوەزانی، لەو بنەما گشتییانە دەدوێ کە دەستیان گرتـووە بەسـەر دانـانی زاراوەدا، بەپێی ئەو پێوەندییانەی کە لە نێوان چەمکە زانستییەکاندا هـەن و چارەسەری کێشە هاوبەشەکانی نێوان نزیکەی هەموو زمانەکان و لـە هـەموو بوارەکانی زانیاریدا، دەکات بـەڵام تیووریيـە تایبەتییـەکانی زاراوەزانـی، لـەو کێشانە دەکۆڵێتەوە، کە پێوەندیـدارن بـە زاراوەکـانی بوارێـك لـە بوارەکـانی زانیارییەوە، وەك زاراوەکانی کیمیا و زیندەوەرزانی و هیی تریش.

تیووریی گشتیی زاراوەسازی، لەو چـەمك و زاراوانـە دەدوێ، کـە دەریـان دەبڕێ و ئەنجامی تۆژینەوەکانی ئەم تیووریيـە، وەك بنچـینەی گەشـەکردنی بنەما فەرهەنگییە زاراوەسازییەکان و یەکخستنیان لـە بـواری جیهانـدا وایـە. گـرنگترین بابەتــەکانی تۆژینــەوەی تیــووریی گشــتیی زاراوەزانــی ئەمەیــە: سروشتی چەمکەکان و پێکهاتن و تایبەتمەندییەکانیان و پێوەنـدیی نێوانیـان و سروشــتی پێوەنــدیی نێــوان چــەمك و شــتە تایبەتمەندەکــەو چــۆنێتیی تـــەرخانکردنی زاراوە بـــۆ چـــەمك و بەپێچەوانەیشـــەوەو بـــار و سروشـــتی زاراوەکان.

بەڵام تیووریيە تایبەتەکانی زاراوەسازی، واباسی ئـەو بنەمایانـە دەکـات، کــە بــاری زاراوە لـــە بوارەکـــانی زانیـــاریی تایبەتمەنـــددا، وەك کیمیـــا و زیندەوەرزانی و پزیشکی و هیی تریش..

چەند رێکخراوێکی نێودەوڵەتیی تایبەتمەنـد بەشـداری لـە گەشـەپێکردنی تیووریيـە تایبەتییـەکانی زاراوەدا دەکـەن، هەریەکـەیان لـە بـواری تایبـەتیی

خۆیدا، وەك ڕێكخراوی دروستیی جیهانی و دەستەی نێودەوڵەتیی تەكنیكە كارەباییەكان و هێشتا تۆژینەوە لە تیوورییە تایبەتییەكانی زاراوەسازی، لەباری نەشونمادان.

## ٥-"دانان و ئامادەكردنی زاراوە"

مەبەستمان لە دانان و ئامادەكردنی زاراوە، هەموو ئەو چالاكییانەیە، كە پەیوەستن بەكۆكردنەوەو شیكاری و ڕێكخستنی زاراوەو زانینی هاوواتاكانی و بەهەمان زمان پێناسەكردنی یان بەراوردكردنی بەزمانێكی تر و كۆكردنەوەی چەمكە تایبەتییەكانی بوارێك لە بوارەكانی زانیاری و لێكۆڵینەوەی پێوەندیی نێوان ئەو چەمكانە، ئەوجا وەسفی ئەو بەكارهێنانەی كە بەكردەوە هەیە بۆ دەربڕینی چەمكەكە بەزاراوەیەك، یان تەرخانكردنی زاراوەیەكی دیاریكراو بۆ هەر چەمكێك، ئامادەكردنی زاراوە پێوانەییەكان بە سێ قۆناغدا تێدەپەڕێت كە ئەمانەن:

(١) لێكۆڵینەوەی سیستمی ئەو زاراوانەی ئێستا كاریان پێ دەكرێت لە بوارێكی دیاریكراودا، یان بە واتەیەكی تر، لێكۆڵینەوەی بەكارهێنانی كردەیی زاراوەكانی ئەو بوارە، كە لێكۆڵینەوەیەكی وەسفییە.

(٢) گەشەپێكردنی سیستمی زاراوەكان، واتە چاكسازیی بەكارهێنانی كردەییی زاراوە، كە كردەیەكی پێوانەییە، دانانی زاراوە وردەكان لەبەردەم چەمكە زانستییەكاندا، بنچینەی بەرهەمهێنانی زاراوەی پۆلێنكراو و، سیستمەكانی پۆلێنكردن و فەرهەنگە واتاییەكانە.

(٣) بڵاوكردنەوی ڕاسپاردە تایبەتییەكانی ئەو زاراوە یەكخراوە پێوانانەی دەستەیەك داینـاون كـە دەسـەڵاتێكی یەكخستەیی و بەگشتی كردنی بەكارهێنانی هەیە.

## ٦-"یەکخستنی پێوانەیی زاراوەکان"

دەشێ چەمکەکان و سیستمەکانی (زاراوەکان) لە زمانێکەوە بۆ یەکێکی تر جیاواز بێت و، مەرج نییە لە هەموو زمانەکاندا چونیەك بێت. واتای زاراوە، یان ئەو چەمکەی گوزارشتی لێ دەکات لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر جیاوازەو ئەم دیاردە زانستییە، یەکێك لە کۆسپ و گرفتە ئاڵۆزەکانی کردەی پێوەندی، یان زانیاریگۆڕکێ لەسەر هەردوو ئاستی نەتەوەیی و جیهانی پێك دێنن، بۆیە پێویستە زاراوەکان بەشێوەیەکی پێوانەیی یەك بخرێن کە لەسەر بنچینەی رێککەوتن لەسەر چەمك و سیستەمەکانیان رێك بکەون (یان بەواتایەکی تر، لەسەر واتا و بوارە ڕابەرییەکانیان). لەو پێناوەیشدا، پسپۆران لێکۆڵینەوەی بەراوردکاری بۆ واتا جیاوازەکانی چەمکەکان دەکەن، لە زمانە جیاوازەکاندا.

ئەرکی یەکخستنی پێوانەیی زاراوەیش، دەکەوێتە ئەستۆی دامەزراوە نەتەوەییەکانی سەر ئاستی نەتەوەیی، وەك ئەکادیمیای زانستیی کۆڕە زمانەوانییەکان بۆ نموونە، بەڵام ئاستی جیهانی (رێکخراوی جیهانیی یەکخستنی پێوانەیی ISO) لە جنێف جێبەجێی دەکات.

یەکخستنی پێوانەیی، بەشێوەیەکی گشتی، بایەخ بە تەرخانکردنی زاراوەیەك بۆ هەر چەمکێکی زانستی دەدات، ئەویش بەخۆڕزگارکردن لە هاوواتایی و هاوبەشیی واژەیی و هەموو ئەو شتانەی دەبنە هۆی ئاڵۆزی و سەر لێ تێکچوون لە زمانی زانستی و تەکنیکیدا. بەوردی ئەم یەکخستنە، بەم هەنگاوانەی خوارەوە جێبەجێ دەبێت:

(١) جێگیرکردنی واتای زاراوەکان بە پێناسەکردنی.

(٢) جێگیرکردنی شوێنی هەر چەمکێك لە سیستمی چەمکەکاندا بەپێی پێوەندییە لۆجیکی و خۆکردەکان لەنێوان چەمکەکاندا.

(٣) تـەرخانكردنی هـەر چـەمكێك بـۆ یـەك زاراوەی روون، كـە بـە وردی هەڵبژێردرابێت، لەنێوان ئەو هاوواتایانەدا كە هەن.

(٤) دانانی زاراوەیەكی نویّ بۆ چەمكەكە، كاتێك كە نەتوانریّ زاراوەیەكی گونجاو بدۆزرێتەوە، لەنێوان ئەو هاوواتایانەدا كە هەن.

تۆژینەوەكانی تیووریی گشتیی زاراوەسازی، یاریدەدەر بوون بۆ گەیشتنە ئەو بنەمایانەی دانانی زاراوە بەڕێوە دەبـەن و، لـەو بنـەما بنچـینەییانە بـۆ نموونە: بنەمای دەستپێكردن لەو چـەمك و پێوەندییانـەوە كـە لـە نێوانیانـدا هەن، لـەجیاتیی دەسـتپێكردن لـە زاراوەكانـەوە بـۆ گەیشـتنە چـەمكەكان و بنەمای ئابووری لە زماندا، لەكاتی زاراوەداناندا، بۆ ئاسانكاریی جێبەجێكردن و داب و نـەریت و گرتنـەخۆ و بنـەمای پێڕەویـی بـەكارهێنانی زمانـەوانی و ئەوەی بەپێی نەریت بەسەر ئەو زاراوانە هاتووەو نەگۆڕینی مەگـەر بـۆ هـۆی پەسەند و بەهێز.

هۆكاری واژەیی و وشەسازی و واتایی هەن، كە زمان بـەكاریان دەهێنێـت بـۆ ئامـادەكردنی ئـەو زاراوانـەی چـەمكە زانسـتی و تەكنیكییـە نوێیـەكان دەریاندەبڕن، كە ئەمانەن:

(١) لێكدان (التركیب) Constraction

(٢) داڕشتن (الاشتقاق) Derivation Compounding of words

(٣) خواستن (المجاز)– خستنە سەری واتایەكی نوێی وشەیەك كە هەبێ، یان فراوانكردنی واتاكەی Metaphor

(٤) داتاشین (النحت) Coinage

(٥) دەنگە وەرگێڕان (الترجمة الصوتیة) Transliteration

(٦) وەرگێران (الترجمة) Translation

## ٧-"تۆمارسازی، له زاراوەسازیدا"

*<u>مەبەستمان له تۆمارسازی له بواری زاراوه سازیدا، کۆکردنەوه و تۆمارکردن و چارەسەر و بڵاوکردنەوەی ئەو زانیارییانەیه که پێوەندییان بەزاراوەوه هەیەو</u>* سێ جۆره زانیاری دەگرێتەوه که ئەمانەن:

(١) تۆمارسازیی سەرچاوەی زاراوه

(٢) تۆمارسازیی زاراوه

(٣) تۆمارسازیی زانیاری دەربارەی دامەزراوه فەرهەنگی و زاراوەسازییەکان.

## ٨-"تۆمارسازیی سەرچاوەکانی زاراوه"

ئەم جۆره تۆمارسازییه، سوود و خزمەتگوزاریی وای هەیه که توێژەرەوان و فەرهەنگسازان و هەڵسووڕاوانی بواری زاراوه، ناتوانن دەستبەرداری ببن و، زانیاریی بیبلیۆگرافییان دەربارەی سەرچاوەی زاراوەکان دەداتێ. مەبەستمان له زانیاریی بیبلیۆگرافی، ناوونیشانی سەرچاوەکەو ناوی دانەر و پەخشکار و شوێنی پەخش و کاتی و ژمارەی بەشەکانی و چاپ و ریزی سەرچاوەکه له زنجیرەکەدا ئەگەر بەشێکی زنجیره بڵاوکراوەیەك بوو. گرنگترین سەرچاوەکانی زاراوه ئەمانەن:

(١) رابەری ئەو بنەمایانەی دانانی زاراوه و یەکخستنی بەڕێوه دەبەن.

(٢) فەرهەنگەکانی زاراوه یەکخراو و زاراوه زانستی و تەکنیکییەکانی بواره تایبەتمەندە هەمەجۆرەکان.

(٣) ئەو کتێبانەی له زاراوەزانی دەدوێن.

(٤) گۆڤاره تایبەتمەندەکان.

(٥) وتار و تۆژینەوه بڵاوکراوەکان.

دەتــوانرێ ئــەو زانیارییانــە، بــەکتێب یــان لیســت بــڵاو بکرێنــەوە و دەیشتوانرێت لەسەر شریتی موگناتیسێنراو بپارێزرێن.

گــرنگترین دەســتکەوت، لــە تۆمارســازیی سەرچــاوەکانی زاراوەدا، ئــەو بیبلیۆگرافیــای فەرهەنگــە زانســتی و تەکنۆلۆجییــە تایبەتمەندانــەن کــە "فیســتەر" ئامــادەی کــردن و یونســکۆ یەکــەم بــەرگیانی ســاڵی ١٩٥٥ و دووەمیانی ساڵی ١٩٥٩ بڵاوکـردەوە، دوای ئـەوە (Infoterm) چـاپێکی لێ زیادکراوی نوێی ئەو بیبلۆگرافیایەی، ساڵی ١٩٧٩ بڵاوکردەوە.

گۆڤــارە تایبەتمەنــدەکانیش، زانیــاریی بــەنرخیان دەربــارەی زاراوەو سەرچاوەکانی تێدایە.

### ٩-"تۆمارسازیی زاراوە"

جۆری دووەم لە جۆرەکانی تۆمارسازیی ئەو زانیارییانەی پێوەندییان بـە زاراوەوە هەیــە، تۆمارســازیی خــودی زاراوەکــان و هــەموو راســتییە پێویستییەکانە لەو بارەیەوە، یان بەواتایەکی تر، کۆکردنـەوەو تۆمـارکردن و شـیکاریی زانیارییـە زاراوەییەکانـە، واتـە کـە پێوەنـدییان هەیـە بەچـەمکی زانستییەوەو ئەو زاراوەیـەی کـە گوزارشـتی لێ دەکـات و پێناسـەکەی و ئـەو رەوتــەی تێیـدا هـاتووەو ئـەو سەرچـاوەیەی زانیارییـەکانی لێ وەرگـیراون و بــەهای زاراوەکـە (واتــە ئەگــەر یــەکخراوە، یــان لەســەری پێکهـاتوون، یـان پەسندکراوە یان پێشنیاز کراوە...تاد).

تۆمارسازیی زاراوە لە رووی شێوازی پێرەویکراوەوە سێ جۆرە:

(١) تۆمارسازیی دەستیی زاراوە، بە بەکارهێنانی بلیت یان ئەو کارتانـەی لە کارتداندا ڕیز دەکرێن.

(٢) تۆمارسازیی میکانیکیی زاراوە، بە بەکارهێنانی مایکرۆفیلم و، مایکرۆفیش.

(٣) تۆمارسازیی ئەلەکترۆنیی زاراوە، بە بەکارهێنانی کۆمپیوتەر بۆ دامەزراندنی بانکی زاراوە.

## ١٠-"بانکی زاراوە"

ئەو گەشەکردنە مەزنەی زاراوە زانستی و تەکنیکییەکان و بڵاوبوونەوەی بەکارهێنانی کۆمپیوتەر بۆ چەسپاندنی زانیاری و دامەزراندنی ئەو بانکی زاراوانەی کۆمپیوتەر بەکاردێنن بۆ هەڵگرتنی زاراوەو چارەکاری و گێڕانەوەیان، بەپێی بەرنامەیەك، بەتایبەتی گەشەی پێکراوە بۆ مەبەستی ئەو دەزگایانەی چاودێریی زاراوە دەکەن و بایەخی پێ دەدەن، چەند بانکێکی تایبەتمەند پەیدا بوون، هەریەکەیان جۆرە زاراوەیەکیان تێدایە، بۆیە وا پێویست دەکات ئەو زاراوانە لە ناوخۆیاندا هاوکاریی یەکتر بکەن و لەسەر ئەو بنچینانە رێك بکەون کە بەپێی ئەو بنچینانە زاراوە هەڵدەگرن و دەشیان گێڕنەوە.

بانکەکانی زاراوە لە جیهاندا هێشتا بە پەنجەکانی دەست دەژمێردرێن، بەڵام هەندێکی تریان لە قۆناغی ئامادەکردن و نەخشەسازی و دروستکردندان.

# "ڕێسا بنچینەییەکانی هەڵبژاردن و دانانی زاراوەی زانستی"

ئەگەر سەرنجی ئەو بەرنامانە بدەین، کە کۆڕە زمانی و زانستی و فێرگە زمانەوانییەکان دایانناون، دەبینین خەریکە هەموویان لە ناوەرۆکدا کۆك بن لەوەدا کە چەند بنەمایەکی بنچینەیی هەیە بۆ هەڵبژاردن و دانانی زاراوەی زانستی پشتیان پێ دەبەسترێ، کە نوێنەرانی کۆڕە زمانەوانییە عەرەبییەکان و مەڵبەندە زمانەوانییەکان و وەزارەتەکانی پەروەردەو فێرکردنی وڵاتە عەرەبییە بەشدارەکانی (کۆنگرەی یەکخستنی بەرنامەکانی دانانی زانستە زاراوەی نوێ)، کە بنکەی هاوئاهەنگیی بە عەرەبی کردن لە ڕۆژانی ١٨–٢٠ی شوباتی ١٩٨١دا لە ریبات سازی کرد، پاش تاوتوێ کردن و هەڵسەنگاندنی ئەو بەرنامەو تۆژینەوانەی لەلایەن توێژەرەوە و کۆڕە زمانەوانی و دەزگا تایبەتمەندەکانەوە ئامادەکرابوون بڕیاری ئەم بنەمایانەی خوارەوەی دا:

(١) پێویستە، گونجان، یان هاوبەشیی، یان لێکچوونێك لە نێوان (زمانەواتا) و (زاراوە واتا)ی هەردوو زاراوەیەکدا هەبێت، مەرجیش نییە، زاراوەکە، هەموو واتا زانستییەکەی خۆی بگرێتەوە.

(٢) دانانی یەك زاراوە، بۆ یەك چەمکی زانستیی هاو ناوەرۆك لە یەك بواردا.

(٣) خۆپاراستن لە فرەواتایی یەك زاراوە لە بوارێکدا و پەسندکردنی واژەی تایبەتمەندانە بەسەر واژەی هاوبەشدا.

(٤) پێداچـوونەوەو بووژاندنـەوەی کەلـەپووری عـەرەب، بەتایبـەتی ئـەو زاراوە زانسـتییە عەرەبییانـەدا کـە پێشـتر بـەکارهێنراون و ئەوانـەی ئێسـتا دەتوانرێ بەکاربهێنرێن و ئەو واژە عەرەبێنراوانەیش کە هەن.

(٥) هـاو ڕەوتـی بەرنامـەی جیهـانیی هەڵبـژاردنی زاراوەی زانسـتی بـین، لەمانەدا:

أ/ ئاگاداریی نزیکخستنەوی زاراوەی عەرەبی لە هـی جیهـانی بکـەین، بـۆ ئاسانکردنی بەراوردکاریی نێوانیان بۆ زانا و توێژەرەوە.

ب/ پشتبەستن بەپۆلێنی دەییی جیهـانیی پـۆلێنی زاراوە، بـەپێی بـوار و لقەکانی.

پ/ دابەشـکردنی چـەمکەکان و تـەواوکاری و دیـاریکردن و پێناسـەو ریزکردنیان بەپێی هەر بوارێك.

ت/ بەشداریی تایبەتمەندان و بەکارهێنەران لەدانانی زاراوەدا.

د/ درێژەپێدانی تۆژینەوەو لێکۆڵینەوە، بۆ ئاسانکاریی پەیوەندیی نێـوان زاراوەساز و بەکارهێنەکان.

(٦) بەکارهێنانی رێبازە زمانەوانییەکان لەدانانی زاراوەی زانستیی نوێدا، بەپەسندکاریی ئەم ریزبەندییە:

کەلـەپوور، دانـان (بـەواتا فراوانکـردن و داڕشـتن و عەرەبانـدن و داتاشین)یشەوە.

(٧) پەسـندکردنی وشـە عەرەبییـە رەسـەنە باوەکـان، بەسـەر عەرەبێنراوەکاندا.

(٨) له ناچاریدا نەبێ، خۆپاراستن لـه وشـەی ڕەشـۆکی، مەگـەر لـەنێوان چـەند شـێوەیەکی زمـانی عەرەبیـدا هاوبـەش بـن، ئەوسـایش ئامـاژە بـۆ ڕەشۆکێتییەکەیان بکرێت و بخرێتە ناو دوو کەوانەوە.

(٩) پەسندکردنی شێوگی کورت و پاراو و ڕوون و خـۆ دوورخسـتنەوە لـە واژە ناقۆڵا و ناپەسندەکان.

(١٠) پەسندکردنی ئەو وشانەی بواری داڕشتنیان تێدایە.

(١١) پەسـندکردنی وشـەی تـاك، چـونکە داڕشـتن و لێ وەرگـرتن و خستنەسەر و کۆکرنەوەیان ئاسانە.

(١٢) پەسندکردنی وشەی ورد و ڕوون، بەسەر وشەی گشتی و نادیاردا و، چـاودێریی گونجـانی زاراوە عەرەبییەکـە، لەگـەڵ زانسـتە واتـای زاراوە بیانییەکەدا، بێ پابەندی بەبێژە واتای زاراوە بیانییەکەوە.

(١٣) لەباری هاو واتا و نزیکە هاوواتادا، ئەو واژەیە پەسـند دەکرێـت کـە ڕەگەکەی ڕوونتر چەمکە بنەڕەتییەکە دەردەبڕێت.

(١٤) پەسـند کردنـی وشـەی بـاو بەسـەر وشـەی دەگمـەن یـان نـامۆ و نائاشـنادا، مەگـەر واتـای زاراوە زانسـتییەکە، لەگـەڵ واتـای بـاوی وشـەکەدا پێکداچوون و تێکەڵییەکی پەیداکردبێ.

(١٥) کە چەند واژەیەکی هاوواتا یان واتا لێك نزیك هەبوو، دەبـێ، واتـای وردی زانستیی هەریەکەیان دیاری بکەین و واژەی زانسـتیی بەرانبـەرەکانیان هەڵبژێرین، لەکاتی هەڵبژاردنی زاراوەی وادا پێویستە، هەموو واژە واتـا لێـك نزیك یان واتا لێکچووەکان کۆبکرێنەوەو هەموویان وەك کۆمەڵەیەك چارەسەر بکرێن.

(١٦) ئاگــاداریی ئــەو زاراوە و بنــەما زانســتییانەی پســپۆڕان لەســەر بەکارهێنانیان رێککەوتوون، سا ئیتر عەرەبێنراو بن یان وەرگێڕدراو.

(١٧) دەبێ عەرەباندن، لە کاتی پێویست و ناچاریدا بێت، بەتایبەتی ئەو زاراوانــەی کــە شــێوگێکی جیهانییــان هەیــە، وەك واژە بنەچــە یۆنــانی یــان لاتینییەکان، یان ناوی ئەو زانایانــەی وەك زاراوە بــەکارهێنراون یــان تــوخم و ئاوێتە کیمیاییەکان.

(١٨) دەبــێ لــەکاتی عەرەبانــدنی واژە بیانییەکانــدا، چــاودێریی ئەمانــە بکرێت:

أ/ ئەگــەر واژە عەرەبێنراوەکــە، چــەند ئاخــاوتنێکی جیــاوازی هــەبوو لــە زمانە بیانییەکاندا، رەوانترینیان لەسەر زمان هەڵدەبژێرین.

ب/ شێوە گۆڕینی واژەکە، تاکو لەگەڵ شــێوگە عەرەبییەکــەدا گونجــاو و هەموار کراو بێت.

پ/ زاراوە عەرەبێنراوەکە، بەعەرەبی دابنرێت و پابەندی رێساکانی زمــان بێت و بۆ لێ وەرگرتن و داتاشین شیاو بێت، پێشگر و پاشگر بگرێتــە خــۆی و لەگەڵ شێوگی عەرەبیشدا بگونجێت.

ت/ ڕاســـتکردنەوەی ئـــەو وشـــە عەرەبییانـــەی زمانـــە بیانییـــەکان شێواندوویانن و، بە بنەما پەتییەکەی خۆیان بەکاربهێنرێنەوە.

د/ دەبێ زاراوەکان بەگشتی و عەرەبێنراوەکان بەتایبەتی سەر و بۆریــان بۆ دابنرێت، بۆ ئەوەی بەڕاستی و وردی و دروستی بێئاخێورێن.

# پێناسینی زاراوەی کوردی

پێویستە، هەموو بابەتێکی زمانەوانی، لە ڕوانگەیەکی نەتەوەیییەوە شی بکرێتەوەو لێی بکۆڵدرێتەوەو هەڵبسەنگێنرێت، چونکە زمان گوزارشتی هەست و سۆز و ئاوێنەی بیر و هۆشەو بەدرێژایی ڕۆژگار، بنەما و دەستوورەکانی لە ڕووی دەنگسازی و وشەسازی و ڕستەسازی و شێوازەوە لە بۆتەو هەناوی ژیاندا پەیدابوون و دەتوانین بڵێین، زمان نەتەوەیە و نەتەوەیش زمانە، بۆیە دەبێ بۆ پاراستنی لە دەستکاری و شێوەسازی و پینەکردنی، زمانزانی بەکاربهێنین و نابێ بە هیچ جۆرێك وشەی بیانی و زاراوەی ناڕەسەن و دەربڕینی نازگماك بخەینە ناو فەرهەنگی زمانی نەتەوەیییەوە.

زمانەوانان، بەدرێژایی مێژووی زمانی مرۆڤ، یۆنانی بن یان ڕۆمانی یان هیی هەر نەتەوەیەکی تر، هەموویان لەسەر ئەوە کۆك و یەکدگیرن کە زاراوە "وشە"یە..، بەوەیش ڕووبەڕووی پرسێك دەبینەوە، ئاخۆ (وشە) بەپێی (ڕێزمان)، کە بڕبڕە پشتی زمانە، شوێن و پلە و پایەیەکی هەیە، یان ئاکامێکی ڕواڵەتەو لە بنیاتنانی زماندا، ئەرکێکی ئەوتۆی نییە؟!، بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسە، زمانەوانە شوێنکەوتووەکانی (ئەرستۆتالیس)، لەو باوەڕەدان کە:

(وشە)، بەردی بناغەی زمانەو هەرگیز نابێ بەبێ بنەما و دەستوور سازبکرێت و واتاکەی بگۆڕدرێت، ئەرستۆتالیس بۆ دەستکاریکردنی واتای وشە، بەمەبەستی زاراوەسازی چوار بنەمای داناوە کە ئەمانەن:

(١) گواستنەوەی واتای وشە، لە ڕەگەزەوە بۆ جۆر.

(٢) گواستنەوەی واتای وشە، لە جۆرەوە بۆ ڕەگەز.

(٣) گواستنەوەی واتای وشە، لە جۆرەوە بۆ جۆر.

(٤) گواستنەوەی واتای وشە، بەپێی ڕادەی پێوەندی.

شوێنکەوتوانی (هۆراس)ی رۆمانی، لەو باوەڕەدان کە، ڕەسەنی و ناڕەسەنیی (وشە) لە بنیاتنانی زماندا، گرنگ نییە، بۆیە لە میانەی بەراوردکاریدا، (وشە) دادەنێن بە گەڵای درەخت و، (ڕێزمان) بە ڕەگ و ڕیشە، کە لە ڕاستیدا ئەم هەڵسەنگاندنە، لە ڕاستیی کێشەکەوە دوورە، چونکە (وشە) لە زەمینەی (زاراوە)دا، پێوەندیی بە هەست و نەست و سەرنج و تێڕوانینی نەتەوەوە هەیەو هەرگیز هێمایەکی بێ گیان و مردوو نەبووە و نییە و نابێ.

بەو پێیە، کە (زاراوە) بە (وشە) بناسێنین، دەبێ (ئاوەڵناوی رەسەن)ی بخەینە پاڵ و بڵێین:

"زاراوە، وشەیەکی رەسەنە" و، وشەیش بەگشتی سێ بەشە: ئامراز و ناو و فرمان و، لەبەرئەوەی ئامراز و فرمان بەزۆری بۆ زاراوەسازی دەست نادەن، دەبێ واژەی (وشە) لە پێناسەکەدا بکەین بە (ناو) و بڵێین:

**"زاراوە، ناوێکی ڕەسەنە".**

زمانەوانە هاوچەرخەکان، بەپێی ڕێگا دیاریکراوەکانی ئەرستۆ، بۆ گۆڕینی واتای (وشە) لە واتایەکەوە بۆ واتایەکی تر، تێبینییان هەیەو ڕێگای تر دەخەنە پێش چاو:

**یەکەم:** فراوانکردنی واتای وشە و بەزاندنی سنووری لە چەمکێکی تایبەتەوە، بۆ مەبەستێکی فراوان، بۆ نموونە: زاراوەی (سەرچاوە) لە فەرهەنگدا، بۆ واتایەکی دیاریکراو کە (سەرچاوەیەکی ئاو)ە بەکارهێنراوە، بەڵام لە بواری ڕووناکبیری و زانستیدا، بووە بە زاراوەیەکی ژیاریی بەربڵاو.

**دووەم:** تایبەتمەندکردنی واتای (وشە) و گواستنەوەی لە بوارێکی بەربڵاو و فراوانەوە بۆ ئەرکێکی دیاریکراو، بۆ نموونە:

وشەی (بەر)، بۆ بەری دار و درەخت و (بەر)ی –تویێی ناوەوەی– پۆشاك و جل و بەرگ و سنگ و (بەر)ۆك و تۆل، بزنەکە (بەر)ی هاویشت، ژێر، خواردە لە (بەر) ماڵانەوە هات، پێش و پێشتر (بەر لە من) ڕۆیشت، پۆشین.. کەوام لە (بەر)ا بوو، لا، ڕۆخ، تەرەف.. ئەو (بەر) ملکی منە، ئەمبەر زەویی تۆیە، ڕادە و ئەندازەو بارست، ئەم کووتاڵە (بەر)ی پانە، چۆغەکەت (بەر)دارە یان بێ (بەر)، بەرهەڵدا (بەرەڵا) و ئازاد، لە زیندان (بەر)بووم، ئەسپەکە (بەر) بووە، پاشگری هەڵگر، کێش، (ڕەنجبەر، فرمانبەر، بارەبەر)، وەرگر (میراتبەر)، ڕووی تەماشا، بەم بەرێ خودایەدا، بەهرەو داهات، بەروبۆت ئەمساڵ چۆن بوو؟، بەرورگ، تووکەبەر، ڕووەو (بەرەو سلێمانی دەچم)، (بۆر)ی سەرتیپ، بەش، ئەوەندەم (بەر) ناکەوێ..تاد

کە بۆ (بەر)ی پۆشاك بەکاری بهێنین و بیکەینە (زاراوە)، واتا گشتییەکەی تەنگەبەر دەکەین و بۆ مەبەستێکی تایبەت بەکاری دێنین.

**سێیەم:** گواستنەوەی (وشە) لە (واتا)یەکەوە بۆ (واتا)یەکی تر، لەبەر جۆرە پێوەندی و لێکچوونێك، (ڕێنووس)، واتا ڕاستەقینەکەی بەهۆی

لێکچـوونەوە بـووە بـە (زاراوە)یـەك، بـۆ دەربڕینــی ڕێ و شـوێن و شـێوازی نووسین.

لەو ڕووەوە کە (وشـە) لـە زەمینـەی (زاراوە)دا، پێوەنـدیی بـە هەسـت و نەست و سەرنج و تێڕوانینی نەتەوەوە هەیەو هەرگیز هێمایـەکی بـێ گیـان و مـردوو نییـە، زانـای بـەناوبانگ (بروکـا) لـەم رووەوە دەڵێـت: "مەڵبەنـدی ئاخاوتن، لە توێی سێیەمی لای چەپی مێشکی مرۆڤدایەو مرۆڤ هـەر وشـەیەك لـە نەتەوەیەکـەوە فێـر دەبێـت، لـەو مەڵبەنـدەدا تۆمـاری دەکـات و لـەکاتی پێویستیدا، بیری دەکەوێتەوەو بۆ ئاخـاوتن و گفتوگـۆ لەگـەڵ هـاو زمانانیـدا بەکاری دەهێنێ، بۆیە (وشە بەکارهێنان)، کارێکی هۆشمەندانە و دەروونییەو بەدوو هەنگاو جێبەجێ دەبێت:

**یەکـەم:** هـەنگاوی تۆمـارکردنی زاراوە لـە مێشـکی مرۆڤـدا، کـە لـە رێـی یەکێك لە هەستیارەکانەوە، لە ژینگە وەردەگیرێ و وەك دەنگە هێمایەك، لـە بری کەرەسە ناولێنراوەکەی دەچەسپێنرێت.

**دووەم:** هەنگاوی هەژاندنی زاراوەکەیە، لە تۆمارگەکەیەوە، کاتێـك مـرۆڤ هەست بەو کەرەسە ناو لێنراوە دەکات و دەیەوێ لێی بدوێت.

ئەم دوو هەنگاوەی زاراوە وەرگرتن و بەکارهێنانی، ئیسپاتی دەکـەن کـە زمانی نەتەوەیی، زەمینەیەکی بێ خاوەن نییە و بـێ بنـەما ڕەشـەبا لـەملا و لەولاوە تۆوی ناهەمواریی پێدا بوەشێنێ، بەڵکو سەرچاوەی نـەمری و ژیـانی کۆمەڵە.

لەم بوارەدا، زۆر لە مێژە (الشريف الجرجانی) زاراوەی پێناسە کردووە و وتوویەتی: "زاراوە، ڕێکەوتنی کۆمەڵە کەسێکە لەسەر ناونانی شتێك یان کارێك، بە وشەیەك کە لە (واتا)یەکەوە گواسترابێتەوە بۆ (واتا)یەکی تر."

دوای ئەو زانایە، (الكفوي)، لەسەر هەمان ڕەوت هەنگاوی ناوە و بە دووبارەکردنەوەی وتەکانی (الجرجانی) زاراوەی پێناسە کردووە و چەند ڕوونکردنەوەیەکی نوێی خستۆتە سەر لایەنەکانی پێناسەکەو وتوویەتی:

(زاراوە)، وشەیەکی تایبەتە، لە یەکێك لە بابەتەکانی زانیاری و زانست و ڕووناکبیری و شارستانێتی دەدوێ و لە کاروباری ڕۆژانەدا، بەهۆی ئەوانەوە کە پێوەندییان بەو بابەتانەوە هەیە بەکاری دەهێنن، بێگومان پێناسەکەی (جرجانی) و ڕوونکردنەوەکەی (کەفەوی) دەربارەی زاراوە، هەموو شتێك لەم ڕووەوە پێکناهێنن، چونکە ئەمانە هەموویان سەرەتایەك بوون بۆ ڕەچاوکردنی پێناسینی (زاراوە)، بەڵام ئەم سەرەتایەو ئەوەی لەبەر ڕووناکییەکەیدا ئەنجام دراوە، ئێستا پێکەوە یەکانگیر بوون و چوار جیاوازییان بۆ چەمکی زاراوە دەستنیشان کردووە:

**یەکەم:** ئیسپاتی دەکات، کە زاراوە جۆرە وشەیەکە.

**دووەم:** ڕوونی دەکاتەوە کە زاراوە چەند کەسێك سازی دەکەن و بۆ ئیش و کاری تایبەتیی خۆیان بەکاری دێنن.

**سێیەم:** ئەوە دووبارە دەکاتەوە، کە زاراوە واژەیەکی نوێیە، دوو واتا یان زۆرتری هەیە.

**چوارەم:** ئەو لێکدەداتەوە، کە ڕێبازی سەرەکیی دانان و سازکردنی زاراوە، گواستنەوەی وشەیە، لە واتایەکەوە بۆ واتایەکی نوێ، کەوابێ هەموو وشەیەك زاراوە نییە، بەڵام هەموو زاراوەیەك وشەیەو ئەو وشەیەیش،

سنوورێکی تەسکی هەیە، چەند کەسێك لە کۆڕێکی ژیاندا پەرژینیان کردووە و لە وشەی فەرهەنگییەوە وەرگیراوە.

لەم کورتە باسەوە، دوو شتی سەرەکیمان بۆ دەردەکەوێت:

(١) زاراوەساز، یەکێك یان زۆرتری دەستەیەکی پسپۆڕ و خاوەن جۆرە تایبەتمەندییەکە، لە کۆڕێکی زانیاری یان ژیانیدا.

(٢) زاراوە، لە بوارێکی تایبەتی و مەودایەکی دیاریکراودا بۆ دەربڕین بەکاردێت، بۆ نموونە:

زاراوەی (ڕێزمان)، زمانەوانێك یان زۆرتر سازیان کردووەو لە بابەتێکی زمانیدا بەکاری دێنن و، زاراوەی سێگۆشەزانی، سازکارانی، بۆ بەکارهێنانی خۆیان لە بواری بیرکاری و ئەندازیاریدا سازیان کردوون، ڕەنگە ئەم دوو خاڵە، لە زاراوەسازیی کوردیدا شوێنی مشتومڕ بن، چونکە دەبینین کە خەڵکی ناشی و ناتایبەتمەند، زاراوە ساز دەکەن و زاراوەسازانی کورد لەم کارەدا هەموو یەکگرتوو نین، بۆیە لەم بوارەدا دوو دیاردەی نابەجێ بەرچاو دەکەون:

**یەکەم:** بە هەڵە داتاشینی زاراوە.

**دووەم:** دانانی لە زاراوەیەك زۆرتر بۆ یەك واتا.

لە ئەنجامدا دەگەینە ئەوەی کە:

(١) زاراوەی کوردی، ناوێکە، دەشێ (سادە) و دەشێ (ناسادە)یش بێت.

(٢) ئەم (ناوە)، وشەیەکی کوردیی ڕەسەنە.

(٣) پێویستە، لەنێوان زاراوەو واتاکەی پێشوویدا، جۆرە پێوەندییەك هەبێت.

(٤) دەبێ (زاراوە)، کە بەر رووناکیی یەکێك لـە ڕێبازەکـانی پەیـدابوون و سازکردنی (وشە)ی کوردیدا ساز کرابێت.

(٥) دەبێ (هەر زاراوەیەك)، تەنیا بۆ (یەك مەبەست) دانرابێت.

(٦) نابێ خەڵکی ناشی و ناتایبەتمەند لە زمان و بابەتێکدا (زاراوە) سـاز بکەن.

(٧) (زاراوە)، تایبەتـە بـە بابـەتێك، یـان لایـەنێکی زانیـاری و ژیـاری و ڕووناکبیری.

کەواتە، لەبەر ڕووناکیی ئەم حـەوت خاڵـەدا، دەتـوانین زاراوەی کـوردی، بەم جۆرە پێ بناسین:

"نـاوێکی ڕەسـەنە، لـە فەرهـەنگی نەتەوایـەتیی کوردییـەوە، بـەپێی ڕێبازێکی وشەسازیی کوردی، بۆ مەبەستێکی دیاریکراو، لە کۆڕی پسـپۆڕیدا، سازکراوە".

# سەرچاوەكان


١ـ ئیبراهیم ئـەمین باڵـدار، زاراوە و زمـان لـە كـاروانی زانیـاریی ئـەمڕۆدا، گۆڤاری رۆشنبیری نویٚ، ژمارە (١١٤)، ساڵی ١٩٨٧، لاپەڕە (١٥٤–١٦١).

٢ـ د. كامیل بەسیر، پیٚناسینی زاراوە، گۆڤـاری رۆشـنبیری نـویٚ، ژمـارە (١١١)، ساڵی ١٩٨٦.

٣ــ د. نەسـرین فـەخری، ریٚبـازی بـە كـوردی كردنـی زاراوە، گۆڤـاری رۆشنبیری نویٚ، ژمارە (١١٤)، ساڵی ١٩٨٧، لاپەڕە (١٢٣–١٦٢).

٤ـ أحمد شفیق الخطیب، معجـم المصـطلحات العلمیـة والفنیـة والهندسـیة، المقدمة، الطبعة الاولى ١٩٨٧.

٥ـ الكتور محمـد ضـاري حمـادي، مقـال ـ مجلـة المجمـع العلمـي العراقـي، المجلد الحادي والثلاثون (٢)، لسنة ١٩٨٠، ص(١٦٢–١٨٩).

٦ـ الدكتور ابراهیم السامرائي، العربیـة تواجـه العصـر، سلسـلة الموسـوعة الصغیرة، العدد (١٠٥)، لسنة ١٩٨٢.

٧ـ الـدكتور علـي القـاسمي، مقدمـة في علـم المصـطلح، سلسـلة الموسـوعة الصغیرة، العدد (١٦٩)، ١٩٨٥.

# ملخص البحث

## المصطلح واللغة

جمال عبدول

إن التطور السريع في العلوم والتكنولوجيا أدّى الى إزدياد عدد المفاهيم التي لاتتسع لها الألفاظ اللغوية، وكان لابُدّ من البحث عن وسائل علمية تنظم عملية وضع المصطلحات التي تعبّر عن المفاهيم بدقة، ومن هنا نشأت المصطلحية (علم المصطلح) في القرن المنصرم وهي علم مشترك بين اللسانيات والمنطق وعلم الوجود والإعلامية وحقول التخصص العلمي، وأدّى ازدياد المصطلحات ازدياداً هائلاً إلى استخدام الحاسب اللألكتروني وإنشاء بنوك المصطلحات لتوثيق المصطلحات وجمع المعلومات المتعلقة بها كمصادرها والمؤسسات العاملة في هذا المجال. ولاحاطة القاريء بأفكار جوهرية عن تلك الأمور، تناول البحث موضوعات تتضمن معلومات أساسية حولها من عناوينها الرئيسية: (حول وضع المصطلح العلمي وتطور اللغة، مقدّمة في علم اللغة الحديث، اللغة العلمية، النظرية العامّة لوضع وتوحيد وتوثيق المصطلح، القواعد الأساسية لاختيار ووضع المصطلح العلمي..... الخ).

# Abstract

## TERMINOLOGY AND LANGUAGE

The swift advancemenr in science and technology led to an increase in linguistic concepts, which inevitably set the quest for the systematic coining of terms to express them as precisely as possible. Hence the emergence of the science of terminology in the last century, a discipline which combines linguistics, logic, ontology, journalism and scientific disciplines.

This enormous increase in terminology gave birth to the use of computers, and the establishment of terminology banks to record, gather and document any relevant information.

In order to acquaint the readers with the essential ideas about terminology, this study deals with all that is intrinsic to the topic as indicated in subheadings, such as: scientific terminology and development of language, an introduction to linguistics, the language of science, the coining and unifying of terminology, the basis for selection and others.

# ئاشنانەوە لە کوردستاندا

## دانراوی
## مامۆستا مەلا وەسیم

**محەمەد عەلی قەرەداغی**

### پێشەکی

دۆزینــەوەی هــەر دەســتخەتێکی کــۆنی مامۆســتایانی کــورد هەڵدانــەوەی لاپەڕەیــەکی ونبــوو و شــاراوەی مێــژووی ئــەدەب و ڕۆشــنبیریی و کولتــووریی کوردە، بایەخ و سوودی ئەو لاپەڕەیەش خۆی لـە بـە بایـەخی ئـەو دۆزراوەدا دەنوێنێ کە تازە سەر هەڵدەدا.

دیاریی ئەم جارەم دۆزینەوەی لاپەڕەیەکی کەم وێنەی مێـژووی ئـەدەب و زانستی کوردە، لاپەڕەیەك بە بیری مندا نەهاتووە - و باوەڕیش ناکەم بەبیری ڕۆشنبیراندا هاتبێت - کە مامۆستایانی پێشوومان خۆیان لـە قـەرەی کـاری وا دابێت.

ئەم دۆزینەوەیە ڕەنگە - نەك بە پێوانی بارودۆخی ڕۆشـنبیری کـورد - بـە پێـوانی ڕۆشـنبیری گـەلانی جیهـانیش دەستپێشـخەرییەکی کەموێنـە بێـت. مامۆستایەکی کورد پـێش زیـاتر لـە (٢٣٠) سـاڵ بـیر لـەوە بکاتـەوە باسـێکی

تێروتەسەل و تەڕ و پاراو و بەپێز لەسەر دروستکردنی ئاش بنووسێت، کە تا ئێستە من وێنەیم نەدیوە و، رەنگە وێنەیشی نەبووبێت.

سەرەتا چەند خاڵێك لە بایەخی ئەم کارەدا دەنووسم:

<u>یەکەم:</u> کارەکە بە زمانی کوردییە.

<u>دووەم:</u> کارەکە تاکۆتایی کە لە ٢٧٥ بەیت زیاترە لەسەر یەك قافیە و سەروا رۆیشتووە، کە ئەمە خۆی ـ نەك لە شیعری تەعلیمیی ـ لە چامەی ئەدەبی کوردیشدا کەموێنەیە.

<u>سێیەم:</u> لە نووسینێکی زوومدا ئاماژەم بۆ ئەوە کردووە کە دەڕاسە و، تەرەکتۆر سەدان وشەی رەسەنی کوردیی جووت و گا و دروێنە و خەرمانکوتانیان پێچایەوە[١]، لەم نووسینەیشەوە بۆمان دەردەکەوێت کە وشەی (ئاشە مەکینە) هەگبەیەك وشەی رەسەنی کوردیی کە لە ئامرازەکانی ئاشی ئاو پێکدەهاتن پێچایەوە و، ئەم نامیلکە تۆمارگەیەکی بە ئەمانەتی ئەو وشە رەسەنانەیە کە ئەگەر ئاوا نەبوایەت و پێش ئەوەی مەبەست و واتاکانیان لە بیربچێتەوە بمانزانیایەن و فەرهەنگۆکمان بۆ بکردایەن، دەیان وشەی رەسەنی کوردیمان دەخستە سەرخەرمانی فەرهەنگی کوردیی و بۆ بەرامبەریی چەندین شت کە رەنگ بێ بۆ بەرامبەریان دابمێنین، بە کارمان بهێنایەن[٢].

---

(١) بڕوانە: محەمەد عەلی قەرەداغی، چەند لکێك لە زمانی سێبەری ئەسپە شێدا.

(٢) زانایانی عەرەب کە بە درێژیی لەسەر زانستی عەرووزی عەرەبیی رۆیشتوون و ناویان بۆ بەحرەکانی داناوە ناوەکانیان بەزۆریی لە ئامرازەکانی دەوار وەرگرتووە، چ دەبێ ئەگەر ئێمەیش لە ئامرازەکانی ئاش ناو بۆ چەند کەرەسەی پیشەسازیی سەردەم دابنێین؟

## دانەری ئەم کتێبە کێیە؟

دانەری ئەم کتێبە خۆشبەختانە لەکۆتایی کتێبەکەیەوە لە دوو لایەنی پڕ بایەخ دەدوێ ـ با بەکورتیش بێت ـ کە هەردووکیان بۆ ئێمە مایەی شادمانیی و جێگەی سوودن:

<u>یەکەمیان:</u> مێژووی دانانی کتێبەکەیەتی کە لەو بارەوە نووسیویەتی:

**سەنە هەزار و صەد و نەوەد بی**
**هەفت سالی هەنی هەم چاگە و دمای**
**[جە رعافنە و راوم!] کەردەن**
**هیچ کەس نەواچۆ پەی چێش ژاویای؟**

بەم پێیە سالی (١١٩٧ك/ ١٧٨٢ز) کتێبەکەی داناوە.

لە دوای ئەمەیشەوە لە بەیتێکدا ناوی خۆی ئاوا نووسیوە:

**واو، سین، ی، میم، ئەرجوو دارۆ**
**پەرێش بوانان سوورەی دۆعای**

بەگوێرەی سەرەتای ئەم بەیتەیش ناوی پێکهاتووە لە (و س ی م) کە دەکاتە (وەسیم).

بەلام ئەو وەسیمە کێیە؟ دوای گەڕان بە سەرچاوەکاندا و پشکنینی ناوی زانایان، ناوی دوو وەسیم ناو دەبینین: شێخ محەمەد وەسیمی یەکەم کە سالی (١١١٨ك/١٧٠٦ز) لە دایك بووە، سالی (١١٧١ك/١٧٥٧ز) کۆچی دوایی کردووە. محەمەد وەسیمی دووەم کە سالی (١٢١٩ك/١٨٠٣ز) لە دایك بووە و

ساڵی (١٢٧٥ك/١٨٥٨ز) کۆچی دوایی کردووه[٣]. بەڵام بەپێی ئەو مێژووەی کە لە کتێبەکەدا نووسراوە، ئەم دانراوە بۆ مێژووی هیچ کام لەو دوو محەمەد وەسیمە دەست نادات. چونکە مێژووەکە پێش لە دایکبوونی دووەم و دوای مردنی یەکەمە. مێژووی نووسینەوەی کتێبەکەیش کە لە ساڵی (١٢٣٣ك/١٨١٧ز)ە پاڵپشتی ئەوە دەکات کە بۆ محەمەد وەسیمی دووەم دەست نادات.

ئەگەر هەڵەیەك یان ئاڵۆزییەك لە نووسینەوەی دەستخەتەکەدا لە شوێنی مێژووەکەدا هەبێت ئەوە دەگونجێ بۆ شێخ محەمەد وەسیمی یەکەم بێت، ئەمەیش دوور نییە، چونکە ئەم شێخ محەمەد وەسیمە گەلێ دانراوی جۆراوجۆری لەگەلێ بابەتدا بەشێوەی گۆرانیی هەیە و، دەکرێ ئەمەیش یەکێك بێت لە دانراوە نەزانراو و باسنەکراوەکانی.

خۆ ئەگەر ئەمە نەچێتە سەر دەبێ بڵێین: لەنێوانی ئەو دوو شێخ محەمەد وەسیمەدا وەسیمێکی دی هەیە کە تائێستە نەناسراوە و، ئەویش پیاوێکی زانا و بە توانا و خاوەن بەرهەم و دانراوی شاکاری وەك ئەم نامیلەکە بووە کە لەبەردەستماندایە. لەم حاڵەدا دەبێ بە چاوەڕوانیی بمێنینەوە تا یان نوسخەیەکی دی دەست دەکەوێت و مێژووەکەیمان بۆ روون دەبێتەوە، یان ناوی شێخ وەسیمی دانەری ئەم کتێبەمان ـ ئەگەر جگە لە یەکێك لەو دووانە بێت ـ لە سەرچاوە و شوێنگەلی دییەوە بۆ روون دەبێتەوە.

---

(٣) بروانە: بابا مردوخ روحانی شیوا، تأریخ مشاهیر کرد، سروش، تهران، خیابان استاد مطهری، نبش خیابان دکتر مفتح، ساختمان جام جم، چاپ اول، ١٣٦٤، ل٢٣٧، ٤٠٥.

## باسێکی دەستخەتەکە

ئـەم دەسـتخەتە بریتییـە لـە دەسـتخەتێکی کـۆنی شـڕی پـەڕپووتی دڵۆپەلێدراو، بەگوێرەی ڕەنگی لاپەڕەکانی بەلای کەمییەوە دوو تـا سـێ جـار دڵۆپە لێیداوە و، تەڕ بووە و خووساوە، بـەڵام خۆشـبەختانە مەرەکەبەکـەی ئەوەندە چاك بووە و چاك گیراوەتەوە ئەو هەموو تەڕبوونە نەیشـۆردوەتەوە، هەر چەندە هەندێ شوێنی تێکەڵ و پێکەڵ کردووە.

شیرازەی پساوە و لێی لەناوچووە، کەسێك هاتووە چەند پەڕەی دی، کـە لە ناوەڕۆکدا لە یەك ناچنی هێناوە، لەپێشی ئەو دانراوەوە دایناوە، ئەو چەند پەڕە لە باسی شەرحی چل فەرموودەی پێغەمبەر ـ د ـ و هەندێك صەلاّواتدان. بـەڵام کاغـەزەکانی ئەوەنـدە خـراپن پـاون و لـە خۆیانـەوە دەکـەون و هەڵدەوەرن. ئەوەی ئێمە مەبەستمانە ئەو نامیلکەیە کە لە باسی ئاشنانەوەدا نووسراوە.

دەستخەتەکە لە سەرەتاوە لێی کەوتووە و ـ هەرچەند وا دیارە زۆر نییە ـ نازانین چەندی لێ کەوتووە.

دووبارە خۆشبەختانە کاغەزەکەی ئـەم جۆرەکـەی جیایـە و باشـتر خـۆی گرتووە و دوای ئەو هەموو کارەساتەی بەسەری هـاتووە هێشـتا هـەر باشـە و زۆر نەڕزیوە.

ئـــەم باســـی ئاشـــنانەوەیە ٢٤ لاپەڕەیـــە، پێوانەکـــەی (١١×١٥)یـــە، ناشـارەزایانە و بـە بـەن و پـەتێکی ئەسـتوور لـە پێسـتێکی قـاوەیی دووبـەر گیراوە. هەر چۆن هەیە ئەو پێستە پاراستوویەتی.

سەرەتای نامیلکەکە نەماوە و، ڕەنگە پەڕەیەك یان زیاتری لێ کەوتبێت.

کۆتاییەکەی ماوە، نووسەرەوەکەی لە کۆتاییەوە نووسیویە:

"تمت شد فی ید الحقیر الفقیر فتح الله بن عبدالله سنه (١٢٣٣هـ/١٨١٧م)".

که جارێکی دی چاو بەم دەستخەتەدا بگێڕینەوە بۆمان دەردەکەوێت کە مامۆستای نووسەرەوەی دەستخەتەکە ـ کە دیارە دانەرەکەی نییە ـ بە خەتێکی خۆشی خۆشخوێن دەستخەتەکەی نووسیوەتەوە، بۆ گەلێك لەو وشانەی خوێندنەوەیان ئاسان نییە، یان خوێندنەوەیان رووییەك زیاتر هەڵدەگرێت، سەر و بۆری کردووە و، کارئاسانیی بۆ هێنانەوە سەر رێنووسی ئەمڕۆی کردووە.

لە دەستخەتەکەدا هەندێ ـ با کەمیش بن ـ نیشانەی سەرەتای رێنووسی کوردیی دەبینرێت، وەك بەکارهێنانی (٥) هێی خڕ لەباتی (فەتحە ـ سەر).

هەندێ وشەی سەرنجڕاکێش لە رووی نووسینەوەوە لە دەستخەتەکەدا دەبینرێن، وەك (بەیتەور) لەو نووسینە کۆنانەدا من دیومن هەموویان (بیطور = بەیطەور) نووسراوە، بەلام ئەم مامۆستا ـ ئیتر نازانم هەر دانەرەکەی وای نووسیوە یان داهێنانی نووسەرەوەکەیە ـ تێکڕا بە (بەیتەور) نووسیویەتی.

هەروەها لە هەندێ شوێندا وشەی لە تەك وشەی دیدا لکاندووە بە یەکەوە، بۆ نموونە (زیادشکرە) ئەمە لە دەستخەتەکانی دیدا وام نەدیوە بەڵکو (زیادش کرە ـ زیادش کەرە) نووسراوە. هەروەها (یکتمن) لەباتی (یەك تمەن) و وشەگەلی دیکەیش.

هەروەك دیاردەیەکی دی: بۆ هەموو ئەلفێکی درێژ وەك: (دار)، (ئاچۆ)، (ئارد)، (ئاو)، (هاران) گەلێ جارنیشانەی (مەد ـ درێژ)ی بەم شێوە (آچو، آرد، آو، هارآن) داناوە. جاری وایش هەیە بواردوویەتی. بەلام بۆ ئەلفی کورت وەك: (ئەگەر)، (ئیمجار)، (ئەر)، (ئەوەڵ).... هیچی دانەناوە و هەر (اگر، ایمجار، ار، اول...)ی نووسیوە.

کارێکی دیش هەیە ڕەنگە تایبەتمەندی ئەم دەستخەتە بێت، ئەویش ئەوەیە (واوێك هەیە لە زاراوەی گۆرانیدا دەلکێنرێ بەدوای وشەوە وەك (وەختو)، (چارەکێو)، (ئەصلو) کە واوی عەطف نییە لەم دەستخەتەدا بە زۆری لکێنراوە بە وشەکەوە.

## مێژووی ئاش لە کوردستاندا

ڕەنگە زیادەڕەویی نەکەم و دوور نەڕۆم ئەگەر بڵێم: ئاش کۆنترین پیشەسازییە لە کوردستاندا. بەڵام بەداخەوە لا لەم بارە بە نرخەی ژیانی کوردەواریی نەکراوەتەوە و، تائێستە من نەمدیوە بەشێوەیەکی شیاو و ڕەسا لەسەر ئەم پیشەسازییە نووسرابێت.

کە دەڵێم: ئاش کۆنترین پیشەسازییە لەوەوە بۆی دەچم کە مرۆڤ - هەموو مرۆڤ، دیارە کوردیش - ڕاستەوخۆ ژیانی بەسراوە بەو پیشەوە، چونکە هەر کەسێ لوێچێ گەنم یا جۆ یان هەرزن یا گاڵی بووبێ کە ویستبێتی بیکات بە نان یان کولێرە یان بە گێتکە، پێویستی بەوە بووە بیهاڕێت و بیکات بە ئارد، ئەمەیش بە دەستاڕ یان بە ئاش کراوە و، دەستاڕیش کەمتر، چونکە ڕەنجی زۆری دەوێت و بەرهەمی کەمیش دەدات.

هەروەك مێژووی ئاش بەگشتیی نازانین، نایشزانین مرۆڤ لە درێژایی ژیانیدا چەند جۆر ئاشی داهێناوە و بە کاری هێناوە بۆ پێویستی هاڕینی دانەوێڵە، چونکە مەرج نییە لە هەموو شوێنێکدا بارودۆخ گونجاو بووبێت بۆ ئەو ئاشنانەوەی تا سەردەمێك لەمەوپێش لە کوردستاندا دەوری هەبوو.

ئەوەتا مامۆستای دانەری ئەم نامیلکەی باسی دەکەین، ناوی چەند جۆر ئاش دەهێنێ، کە دەمێکە لە کوردستاندا یان هەر باویان نەبووە یان باویان نەماوە، لەم رووەوە نووسیویە:

وا چـــوو: ئاســـیابی چـــەندێ نـــەوعێنی
هـــەم چـــنای نـــەوعێ مەبۆشـــان نیـــای!
یـــەکێ زەنبـــوورەك، یـــەکێ تـــەنوورەن
یـــــەکێ مـــــەگێلۆ تـــــیرش لاوەلای
یـــەکێ بـــە ئەســـپ و ئێســـتر مـــەگێلۆ
یـــەکێ ناونـــــە، یـــــەك ئاســـــاوو وای
ئـــەمما جـــەی مـــەکان نـــاوە باونـــە
چـــون ئاســـانەنە پـــەی هـــیچ نـــەزانای

مامۆستامان لێرەدا ناوی چوار پێنج جۆر ئاش دێنێ کە ئێمە ناویانمان نەبیستووە و، دوا ناویان کە ئاشی ئاوە دەفەرمووێ: ئەمەیان لە هەموویان ئاسانترە و بۆ خەڵکی سادە و هیچ نەزان ئەرك و زەحمەتی زۆری ناوێ.

دووبارە زیادەڕەویی ناکەم ئەگەر بڵێم: هەموو گوندێکی کوردستان ئەگەر چەند ئاشی تێدا نەبووبێت ئاشێکی تێدابووە، دیارە مەبەستم ئەو گوندانەیە کە بارودۆخیان لەبار بووە بۆ ئەوەی ئاشیان تێدا بنرێتەوە.

رەنگە ئەم ئاشەئاوانەیش بکرێن بە دوو سێ بەشەوە: بەشێکیان هەر ئاشی زستانە بووە و، کە کەوتوونەتە بەهار و ئاو کز بووە، ئەو ئاشانەیش ئاویان کەوتووە و، پەکیان کەوتووە.

**هەر بە بیرەوەریی من لە زادگای مندا ئاشی زستانە هەبوو، کە زستان ئەهات و ئاو زۆر دەبوو ئەو ئاشە ئەنرایەوە و کاری ئاوایی و چەند شوێنی دیکەیشی مەیسەر دەکرد، تا بەهار دەهات و وردە وردە ئاو کز دەبوو، ئەوسا دەبوایە باراش بۆ شوێنی دوور ببرایەت و، لەوێ نۆرەی بۆ بگیرایەت، تا نۆرەی نەهاتایەت بۆی نەبوو باری خۆی لێ بکات و، پەندی (ئاش و تەنوور بە نۆرەیە) لەوەوە هاتووە، هەروەها پەندی (دەوەن بە ئاش)یش.**

**هەر بە بیرەوەریی من دوو سێ ئاش هەبوون کە هاوین و زستانیان بۆ نەبوو، ئاوی بنەوانەکانیان زۆر بوو، هەمیشە ئاشگێڕ زیاتر ئاویان پیا دەهات و ئاشەکان پەکیان نەدەکەوت، وەك: ئەستێڵ و، بانی خێڵان و، دەرەدۆین و، پساکان... ئاشی ئەم شوێنانە هەمیشە لە گەڕدا بوون و ـ بەتایبەتی لە هاوین و پایزدا ـ خەڵك لە شوێنی دوورەوە باراشیان بۆ دەبردن و نۆرەیان تێدا گیرا بوو.**

**رەنگە بێ جێ نەبێ ئەگەر بڵێم: بە (شنۆ) گوتراوە (چلاش) ئەمەیش لەوەوە هاتووە کاتی خۆی چل ئاشی تێدابووە.**

**(ئەمەم لە کەشکۆڵی صەدباریی و دەمی مامۆستا حەمە بۆر وەرگرت).**

**هەر لەو شوێنە ئاودارانەدا، وا بووە چەند ئاشی بە ڕز تێدا نراوەتەوە و، شوێنی وا بووە پێیان وتووە: حەوت ئاشان، وەك گوند هەبووە بە ناوی (ئاشەوا) کە چەندین ئاشی تێدا بووە[٤].**

---

(٤) ئاشەوا: ئێستە هاوینە هەوارێکە لە ناوچەی بادینان، لە کۆندا چەندین ئاشی تێدا نراوەتەوە، چونکە شوێنەکە لێژ بووە و ئاوی زۆر بە خوڕ لەسەرەوە هاتووەتە خوارەوە. ناوەکەیشی دەگونجێ لەوەوە هاتبێت کە دەڵێن: حەسەناوا، عەلیاوا، ئاشەوایش بەوە ناونرابێت کە بە ئاش و بۆ ئاش ئاوەدان کراوەتەوە.

خـۆ ئەگـەر بـە وردیـی سـەرنجی مۆزەخانـەکان بـدەین، یـان بـە شـوێنە کۆنەکاندا بگەڕێین نموونەی هاڕینی سەرەتایی جۆراوجۆر هەبووە و ئێستەیش تاك و تەرایان ماوە. بە بیرەوەریی من لە خوارووی گوندی تەکیەوە بـەردێکی گەورە هەبوو ناوەکەی چاڵ کرابوو پێیان دەگوت (هـارە گلیلەکـە). هـەروەها ئێستەیش لەسەر تەختی قەڵای (بـاوەکورۆیی) دوو سـێ چـاڵ هـەن کـە بـاش دیارن کاتی خۆی شتیان تێدا هاڕراوە.

## کاری من لەم دەستخەتەدا

کە ئەم دانراوەم دەستکەوت و چـاوێکم پێـداگێڕا و ئەمسـەرە و سـەرێکیم کرد و لە بابەت و ناوەڕۆکەکەی گەیشتم، ماوەیـەك دامنـا و نـەموێرا خـۆم لـە قەرەی ئەوە بدەم شتێکی لە تەکدا بکەم، چونکە ناوەڕۆکەکەی ـ نەك بە من ـ بە رۆشنبیرانی ئەمڕۆ نامۆیە و، وشە و زاراوەکانی زۆر بە کەمیی لە فەرهەنگە کوردییەکاندا هەن و، کەسانێکیش کە مانای ئەو زاراوانە بە دروسـتیی بـزانن،

---

هەر بە بۆنەی ئاشەوە کاکە حەمە بۆر دەڵێت: لای سلێمانیدا ئاشێ بووە پێیان وتووە (ئاشە پەپوولە) لەسەردەمی فەرمانڕەوایی شێخ مەحموودا کە سلێمانیی بوردومان کراوە، شێخ بارەگای گواستوەتەوە، یەکێك لەو شتانە گەنجینەکەی بووە، کە هەر چی پارە و لیرەی هەبووە لە سێ سندووقدا بووە، نراوە لە هێسترێك و زەلامێك رەشووی هێسترەکەی راکێشاوە، تەیارە هاتووە بۆردومانی کردووە، ئەو زەلامەی هێسترەکەی راکێشاوە بەرکەوتووە و کوژراوە، ئەو چەکدارانەیش لە تەکیدا بوون پەرتەوازە بوون و خۆیان شاردوەتەوە، هێسترەکەیش بەلەسە بووە و خۆی کردوە بە ئاشە پەپوولەدا، خاوەن ئاشەکە کە (.......) بوون بارەکەیان خستووە و، گەنجینەکەیان شاردوەتەوە و، دوایی هەر چەند ئەشکەنجەیان داون و، بەندیان کردوون نەچوونەتە ژێر و، ئەو سامانەیان بۆ خۆیان چەپاو کردووە.

هەر بەو بۆنەوە دەڵێم: لە دەوروبەری گوندی تەکیەی زادگای مندا چەند ئاش هەبووە لەوانە: ئاشی بەرانبەر، ئاشی کوورە، ئاشی دوودەر.

ئەگەر مابن، دۆزینەوەیان ئاسان نییە و، بابەتی وا تا ئێستە لە رۆشنبیریی و ئەدەبی کوردیدا بلاْونەکراوەتەوە، تا پەنای بۆ بەرم و بەراورد لەنێوانیاندا بکەم و شتێك بە شتێك بکەم. بۆ نموونە ئەگەر ئەمە باسی راووشکار، یان سەیرانی کیژان و سەردانی مەزار، یان باسی گوڵ و نەوسوەیل و بەهار، یان باسی کەژ و کۆ و نسار و لالەزار، یان باسی چنار و تافگە و جۆیبار... بوایەت چەندین نموونەیان لە دیوانی شاعیرانی کۆندا هەیە و، پەنام بۆ ئەو بابەتانە لەو دیوانانەدا دەبرد و لەبەر رۆشنایی ئەواندا ئەمیشم شتێك لێ دەکرد، بەلاْم نەبوونی هیچکام لەمانە پشتی سارد دەکردمەوە و دەستم لە عاستی قەڵەمدا گۆی نەدەکرد.

ماوەی چەند مانگێك دەستخەتەکەم وەك خۆی دانا، بەلاْم دوایی گوتم: ئەگەر هەر ئاوا دایبنێم دەبێ چارەنووسی چی بێت؟ دەبێ دوای من کەسێك ببێت لە من باشتری لێ بزانێت و کاری باشی بۆ بکات؟ گومانم لەمانەدا هەبوو، بۆیە گوتم: باچیم بۆ دەکرێت بیکەم و، بە هەڵە و ناتەواویشەوە بێت بیخەمە بەردەستی رۆشنبیران و، ناوی بەگوێی رۆشنبیراندا بدەم، لەوە باشترە بە چاوەڕوانیی چارەنووسی نادیارەوە دایبنێم. چونکە ئەم دانراوە بەم شێوەی کە هەیە لە لێواری گۆڕ و مردندایە و، ئەگەر نەیشتوانرێ بە تەواویی ببووژێنرێتەوە و گیانی بە بەردا بکرێتەوە، ئەوا نیوە گیانێکیشی بە بەردا بکرێتەوە هەر لەوە باشترە بە گیانەڵلاْ و چاوەڕوانیی مردنەوە بهێڵرێتەوە!

بۆیە ورەم بەرنەدا و، وزەم دا بە خۆم و دەست لە دەست و قووەت لە خودا دەستم کرد بە نووسینەوەیی و، زۆر لەسەرخۆ و دوای هەڵسەنگاندن و لێکدانەوەی وشەکان، بە بیر و بۆچوونی خۆم هەر چیم بۆ خوێنرایەوە هێنامەوە سەر رێنووسی کوردیی و، هەرچیشم بۆ ساغ نەکرایەوە بە

ڕێنووسەکەی خۆی لەنێوان دوو کەوانەدا و، لە تەك ئامرازی سەرسوڕماندا دامنا. هەندێ جاریش شوێنەکە بە تەواویی کوژابووەوە، یان هەر بۆم نەخوێنرایەوە ئەوە خاڵم لە شوێنەکەیدا دانا.

بەم کارەیش ـ بە بڕوای خۆم ـ لە لایەکەوە ئەم ئەندازەم لە دانراوەکە لە چنگ مۆتەکەی لەناوچوون دەرهێنا، لە لایەکی دیشەوە دانراوەکە، ـ وەك خۆم بۆم خوێنراوەتەوە لە تەك وێنەی تەواوی لاپەڕەکاندا ـ دەخەمە بەردەستی ڕۆشنبیرانی کورد، بەڵکو لای کەسێك نوسخەیەکی دی پەیدا ببێ، یان کەسانی لە من شارەزاتر بە کارەکەی مندا بچنەوە و، ئەوەی من بۆم ئەنجام نەدراوە ئەوان تەواوی بکەن، بەمە و بە هەمووما‌ن کارێکی بە نرخی مامۆستایەکی گومناوی کورد بخەینە کتێبخانەی کوردییەوە.

دەبێ لێرەدا بەسەر ئەوەدا نەڕۆم کە گومانم نییە هەڵەی زۆرم لە هێنانەوە سەر ڕێنووسی ئەو بەشەیشدا هەیە کە هێناومەتەوە سەر ڕێنووسی کوردیی، بەڵام ئەوەی پاساوی ئەوەم بۆ دەدات دوو شتە:

**یەکەم:** سەرچاوەی باسەکە، یان کەسانی شارەزام دەست نەکەوت تا پەنایان بۆ بەرم.

**دووەم:** هەرچیم لە دەست هاتبێت درێغیم نەکردووە و، شەونخوونیی و گەڕان و خۆماندوو کردنم لە پێناویدا بەلاوە گران نەبووە.

هەروەها لێرەدا دەڵێم: یادت بەخێر کا فەرەج[٥]، ئێستە لە کوێت بێنم یەکە یەکە مانای ئەو زاراوانەم پێ بڵێیت کە سەریان لێ دەرناکەم!

## فەرهەنگۆك

لە زۆری ئەو دەقە کەلەپوورییانەدا، کە تا ئێستە بلاوم کردوونەتەوە ـ بە تایبەتی دەقە (گۆران)یەکان ـ هەوڵم داوە فەرهەنگۆك بۆ هەندێك لە وشە و زاراوەکانی ناو دەقەکە بکەم.

بۆ ئەم نامیلکەیش حەزم دەکرد فەرهەنگۆك بکەم و مانای وشە و زاراوەکانی بکەم، بەلاّم وەك وتم ئەم بابەتە نامۆیە و، وشەکانی بە گوێ و هەست و بیری رۆشنبیری ئەمڕۆ نائاشنان و، کەسانێکی وا دەست ناکەون مانای ئەو وشانە بزانن. بیرم لەوە کردەوە بە یارمەتیی فەرهەنگە کوردیەکان ئەم کارە بکەم، کە سەری فەرهەنگەکانیشم دا بینیم ئەوانیش لەم بوارەدا زۆر هەژار و مەودا تەسکن و، جێگەی متمانە و پشت پێ بەستن نین، بۆ نموونە یەك وشە دەخەمە بەرچاوی خوێنەری ئازیز و، وەك بڵێن: (مشتێ نموونەی خەروارێکە).

(٥) کا فەرەج خزممان بوو هەمیشە بە زستان ئاشەوانی ئەو ئاشە زستانەیە بوو کە لە بەرانبەری گوندی تەکیەوە دەنرایەوە. کەم رۆژ بوو لە تەك باوکمدا ـ خوا لێیان خۆشبێت ـ بە یەکەوە لە ماڵەوە دانەنیشن. ئەم پیاوە تا ئەم سالأنەی دوایی لە ژیاندا بوو، بەلاّم لەلایەکەوە من لە بەغدا و ئەو لە تەکیە و دوایی لە سلێمانیی و، لەلایەکی دیشەوە بە بیرمدا نەهاتووە کە رۆژێ لە رۆژان دەستنووسێکی وام بێتە پێش تا زوو کەرەستەی بۆ بخەم!

بۆ ئەم مەبەستە (پازناو)م کرد بە نموونە و، ماناکەیشی بەگوێرەی سێ فەرهەنگی کوردیی دەنووسم:

**پازناو:** مەڵغەی بەرداش هەڵێنان. (ف) اهـرُم سنگ آسیا برداشتن. (هەمبانە بۆرینە، هەژار، چاپی یەکەم. سروش، ل٩٨).

**پازناوك:** دارێکە وەك بێڵەکان دەکرێ بە نوێڵ و بەرداشی پێ هەڵدەگیرێ. (فەرهەنگی خاڵ، چاپی دووەم، ئاراس، ل٦٣).

**پازناو:** دارێکە وەکو تێڵا وەکو نوێڵ ئەخرێتە ژێر پێی ئاش و پێی ئاشی پێ بەرز و نزم ئەکرێت بۆ ورد و درشتیی ئارد بەپێی خواست.

پێی ئاش تا بەرز بێ ئاردی زبرە، تا نزم بێت و دابخرێت ئاردی وردە. (فەرهەنگی کشتوکاڵ، مەعرووف قەرەداغی، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، ل٥٦).

ئەمە بۆ شتێکی ناسراوی ئاش سێ کەس بە سێ جۆر مانایان لێداوەتەوە. جا بۆ شتەکانی دی کە لە نامیلکەکەدان بەشی هەرە زۆریان لە فەرهەنگەکاندا هەر نین و باسیان نەکراوە(٦)، دەبێ چی بکرێت؟ بەڵام هەر چۆن هەیە و چیم بۆ کرا و چەندم لە دەقەکە و لە نووسینانی مامۆستایان دەستکەوت، بە چنگەکرێ و چنگەکووڕێ فەرهەنگۆکێکم خستە پاشکۆی بابەتەکەوە، بەڵکو لەمەولا باشتری بۆ بکرێت و دەوڵەمەندتر بکەوێت و، بەڵکو (کێ دەڵێ) نوسخەی دیکەی دانراوەکە دەربکەوێت.

---

(٦) هەر بۆ نموونە ئەمە چەند دانەیەك لەو وشانە: جیرهار، بەلەکی، بەرزەنە، وارنە، خلەچیر، هوربڕنە، بەرمانك، زەردەپل، قەمچش، چەمچش، پلە، نیری، جواما، کەمەرگا....

## دەقی هۆنراوەکە

رەویەت موحتاجیی ندارت حدود!
ئاڕێو موحتاج بۆ هەم بەرا و خودای
کارش مەسازی جێت دڵ وەش مەبۆ
وەشی هەی وەشی بەهەشت و دنیای!
واچوو: ئاسیابی چەندێ نەوعێنی
هەم چنای! نەوعێ مبۆشان! نیای
یەکێ زەنبوورەك، یەکێ تەنوورەن
یەکێ مەگێڵۆ تیرەش لاولای
یەکێ بە ئەسپ و ئێستر مەگێڵۆ
یەکێ ناونە، یەك ئاساو و وای!
ئەمما جەی مەکان ناوە باونە
چون ئاسانەنە پەی هیچ نەزانای
بیناش بنێمێ بە پاکیی دەروون
بە ذەوق و زینەت چەنی (بسم اللە)ی
کەسێ نەجایێ بیناش ئاساوەن
کوورەگاش کنۆ دما و جوامای
دۆزەقەی ئاسا و با مودەووەر بۆ
(مشیو و دآیرنی) بە جەدوەل کێشای
..... بش بێ زیاد و کەم
بڵندیش (با بو!) قەد و کەمەرگای
(چاکو وار!) طووڵش چەهار گەزێ بۆ
گەزێ پەهنایش نەبا خەلەطیای
...... سەرەتا بە وار دیوارش کەرە

دیوار مەحکەم دەستکار و پەندای!
دیوار مەحکەم ئەر (بۆ توی بێ بر!)
(مبو تعدل!) دایرە نیای
بەینشان جە یەك چارەك کەم نەبۆ
نەك خجڵ مانی وەختو خجڵیای
هەم چا نە واتم زیاتر نەبۆ
تا پێت راحەت بۆ وەختو هاڕنیای
ئەر واچی عەیب و کەم و زیادی
با پێت بواچوو گیانو برای:
ئەگەر بەینشا بێ حەد زیاد بۆ
ئانە خەراوەن پەی هاوسەراونای
ئەگەر بەینشان چانە کەمتەر بۆ
(قتّب!) مەگیران وەختو هاڕنیای
دارێوە هەنی وە نیو ئەدیشان
داری وەرینی نەوەرش نە پای
چاکو وارداریش پابنی بانی
تاکە بڵند بۆ وەرو ئاردەشای
هەر وەختێ کەردت داربەندیی تەمام
مەبۆ هەڕ و خاك وە سەرش کێشای
جەو دما تەختە و خوانیش بتاشە
چهار سووچ مەبۆ (پاناپش!) ینەدای
سەرانش هەردوو مشاربڕ کەرە
درازییش با بۆ قەدو (کوورەکای!)
جە هەردوو سەرش چهار ئەنگوشت کەم بۆ
هەردوو لا مەبۆ تەوەنیش نیای

مـــــــەبۆ ســـــــەریۆش بنخانـــــــە کـــــــەری
فاقـــەش یـــەك چـــارەك ئەصـــل موددەعـــای
چـهار ئەنگوشــت بــەینو هــەردوو پەلــەیش بــۆ
تاکـــە مەحکـــەم بـــۆ تـــیش نیانـــە پـــای
ئـــەو ســـە جـــەو دمـــا چـــەنی ئەســـکەنە
ســـۆراخ (دوری کـــن!) جـــە هـــەردوو لای
چـــەو دمـــا چـــوویێ راســـتُ (مربـــع)
ئـــەر مـــودەووەر بـــۆ قەیـــدش نـــە جـــەلای
بـــاوەرە ســـەریۆ زبانـــەش بـــڕە
ئـــەو قـــەدەر فاقـــەی جـــەی وەر کـــۆك کرنـــای
ئاچـــووبە پەنـــەش مواچـــانی پـــاە
بـــەو پـــاوە بەنـــدەن پـــەرێ هـــارگێلای
ســـۆراخێ جـــەی وەر نـــە فاقـــەت کـــەردەن
یـــەکێ هـــەنی کـــەر نـــە زوان و پـــای
ئـــەو زوان و پـــای بـــێ زیـــاد و کـــەم
مـــەبۆ نەفاقـــەی مـــەذکـــوورەش نیـــای
وەختـــێ پـــات نیـــا (نـــدلی خـــوانی!)
مـــەبۆ جـــەلاوە مـــێخش ویـــارای
مـــەبۆ ئاچـــووبە ســـەخت چـــووپێ بـــانی
تـــا شـــکت نـــەبان وەخـــت وپانیـــای
جـــەو دمـــا مـــەبۆ بشـــمێ ئـــەوداری
راســـت و دوو دارەی خـــوانی ســـەراونای
دوودارەی مەحکـــەم قـــەدیم واتمـــان
بـــەینو هەردووشـــان (نـــوا کـــلاّش دای!)
(یـــونی تختـــی راســـتی رو دمنـــی!)

مـــــەبۆ نـــــە وەر و نـــــە پشــــتش نیـــای

هـــەر لاشـــان صـــافەن بـــەرەش پـــەی خـــوانی

خـــــوانی نـــــەگیران وەختـــــو هـــــۆرێزای

تــــــەوەنیٚ پــــــانی صـــــافی زەریفــــــی

یــۆ پـــەی ســـەرخوانی، یـــەکیٚ پـــەی لاوپـــای

هەردووشـــــــان بـــــــادا مەحکـــــــەم نـــــوانی

نمــــــــەبۆ فــــــریٚ ئەشکەنجەشـــــــان دای

بـــــاز هـــــــەم تـــــووووەنی پـــــانی بـــــاریکی

جـــە ســـەرخوان مـــەبۆ چـــێر ســـەرش نیـــای

کەســـــیٚ نـــــەزانۆ هـــــەر پاســـــە خاصـــــە

ســـەرخوانش بـــەرز بـــۆ کـــەمیٚ ئـــەولاو پـــای

جـــــەو دمـــــا مـــــەبۆ پـــــاش وە پاکـــــەری

ســـــەرش نـــــە فاقـــــە و خـــــوانی ســـــازنای

(ســـــیر ســـــیرنش!) دیـــــاری کـــــری

قـــــولانجیٚ ســـــۆراخ پـــــەرێش هۆرکنـــــای

ســـــە چـــــهارەك چـــــوش پـــــو نـــــە ویـــــارە!

ئاچـــوون مەواچـــان پـــێش: شمشـــێر و پـــای

بـــا جـــا پـــاش جـــە لاو ئاردەشـــانیٚ بـــۆ

نـــەوا خەڵـــەت بـــی بـــەریش پـــەی ئـــەولای

وەختـــیٚ پـــانیش تـــەمام کـــۆك کریـــا

بیمـــــیٚ ســـــەروکار نـــــاو و بارەگـــــای

بینـــــای بارەگـــــەش چـــــاگە بیناکـــــەر

گـــەزیٚ چـــە پشـــت و بینـــا و بارەگـــای

ئـــا گـــەزە واتم پـــەی پـــەنج گـــەز نـــاوی

بـــاوا دوو گـــەز بـــو از...... پـــەی دای

**ـ هەندێ تایبەتمەندی (داستان)**

١ـ لە ڕووی مۆرکەوە (داستان) مۆرکی نەتەوەیی پێوە دیارە، چونکە خاوەنی دیارە، مێژووی نووسینەوەی دیارە، ئاشکرایە کە بە چ زمانێك تۆمارکراوە، هەندێ جار قارەمانەکانیشی قارەمانی نەتەوەیی دیار و ناسراون، ئەو زەمینەیەش دەناسرێتەوە، کە ڕووداوەکانی (داستان)ەکەی تێدا ڕووداوە، داب و نەریت و سلوکیاتی قارەمان و کەسەکانی دیکەی دەوروبەری هەمووی دەناسرێنەوەو دیارن هی چ نەتەوەیەکن، بۆیە بە ئاسانی دەزانین کامە (داستان) هی کامە نەتەوەیە، بۆ نموونە (داستان)ی (دمدمنامە)، قارەمانەکەی (خانی لەپ زێڕین)ە، ئەویش میرێکی گەورەی کوردەو مێژووی ژیان و فەرمانڕەوایەتییەکەی لە ڕیزبەندی میرانی کوردی ڕۆژهەڵات دیارە، نووسەرەکەشی (مەلا کەریمی فیدایی)یە، دیارە کوردەو خەڵکی کوردستانە، داب و نەریتی نێو داستانەکە هی کوردانن، لەبەر ئەوە بەیتێکی نەتەوەییە.

لێرەدا دەبێت ئاماژە بۆ ئەوە بکەین، کە داستاننووس هەموو جارێك ڕووداو و قارەمانی نەتەوەیی هەڵنابژێرێت بۆ داستانەکەی، بەڵکو بەلای ئەوەوە ڕووداوی گرنگ و قارەمانی گەورە گرنگن، بۆیە ئەگەر تەماشای ئەو داستانانەی ئەدەبی کوردی بکەین، کە ئەم لێکۆڵینەوەیە کاری لەسەر کردوون، دەبینین قارەمان و ڕووداوی (شیرین و خوسرەو) هی فارسن، (یوسف و زولەیخا) عیبرییە، (لەیلا و مەجنون) عەرەبییە، (مەم و زین) و (دمدمنامە)ش کوردین. بەڵام هەموویان داستانی ئەدەبی کوردین، چونکە بە زمانی کوردی تۆمارکراون.

٢ــ لە ڕووی زەمەنی نووسینەوە (داستان) بۆ ڕۆژگاری قۆناغی سەرهەڵدانی ئەدەبیاتی کلاسیزمی بەرز دەگەڕێتەوە، چونکە کە کورد پەنای بۆ ئەدەبیاتی کلاسیزم بردو چووە ناو سیستمی عەرووز بۆ نووسینەوەی بەرهەمەکانی، ئیدی داستان سەری هەڵدا، واتە: داستان مۆدەیەکی

پێشکەوتووترە، لە (بەیت)، کە ئەو لـە گـەڵێ ڕووەوەو گرنگترینیـان لـە ڕووی کێشەوە بە زۆری بە کێشی پەنجە دەنووسرێت.

٣ـ (داستان)ەکان هەر هەموویان لەلایەن خاوەنـەکانیان نووسـراونەتەوە، ئـەوەش بۆتــە زامنکــەری مانــەوەی داســتانەکان بــەبێ هــیچ گۆڕانکــاری و دەستکارییەك.

٤ـ سەرچاوەی (داستان)ەکان ڕووداوە زۆر گەورەو دیارەکانی عەسـکەری و مێـژوویی و کۆمەڵایـەتی و واقیعییـەکانن، ئەمانــە بــە خــەیاڵ و ســۆزێکی جوانەوە تێکهەڵکێش کراون بە سەرچاوەکانی دیکەی وەکو ئاین و سروشت و داب و نەریت و...هتدەوە.

## بەشی دووەم: تیۆرەکانی (داستان)

### یەکەم: لە ڕووی ناوەڕۆکەوە

لە ڕووی ناوەڕۆکەوە، (داستان) لە ئەدەبیاتی کلاسیزمی کوردیـدا، چـەند جۆرێکی هەیە، کە هەر ئەو جۆرانەی لە ئەدەبیاتی ئەو نەتەوانەش هەنە، کـە لەم جۆرە شیعرەیان هەیە، گرنگترینی ئەو جۆرانەش بریتینە لە:

١ـ داستانی قارەمانی

٢ـ داستانی ئاینی (کۆمەڵایەتی)

٣ـ داستانی ئەڤینی

#### ١ـ داستانی قارەمانی:

ئەمە ئەو جـۆرەی داسـتانە، کـە ناوەڕۆکەکـەی بـە دوورودرێـژی ڕووداوی زنجیرە شەڕێکی دوورو درێژی قارەمـانی داسـتانەکە دەگێڕێتـەوە، نموونـەی

ئەوە لە ئەدەبیاتی کلاسیزمی کوردیدا (دمدمنامە)یە، کە ئەمە ڕووداوەکانی بەرگریکردن و خۆڕاگری کۆمەڵەیەك کوردی قارەمانی یەك لە قەڵاکانی کوردستانی ڕۆژهەڵات لەخۆ دەگرێت، کە بۆ پارێزگاری لە ئازادی و ئابڕوو و سەربەرزی ئاین و نەتەوەیی خۆیان، ئەو کوردە قارەمانانە بە سەرۆکایەتی سەرۆکە خۆشەویستەکەیان (خانی لەپ زێڕین)، کە ئەوان لەبەر زۆر خۆشەویستییان بۆی بە برا گەورەیان ناودەبرد، لە کاتێکدا لای نەتەوەکانی تر داستانی قارەمانی گرنگترین جۆری داستانەو تەنانەت لای یۆنانییەکان، وەکو خرایە ڕوو، داستان بریتی بوو لە قارەمانی نامە، کەچی لای کورد ئەم جۆرەی داستان لە دوای تەواوی جۆرەکانی تری داستان دەنووسرێت و بەدوای ئەوان دەکەوێت.

٢ـ داستانی ئاینی (کۆمەڵایەتی):

ئەمە ئەو جۆرە داستانەیە، کە لە واقیعی کۆمەڵگاوە دروست دەبێت، لە گەرمەی جموجۆل و بەیەك تێکەڵبوون و لەبەریەکڕاچوونی حەز و بەرژەوەندییە تایبەتییەکان لە مرۆڤەوە ڕوودەدات، نموونەی ئەم جۆرە لە ئەدەبیاتی کلاسیزمی کوردیدا داستانی (یوسف و زولەیخا)یە، کە چیرۆکی ئەم داستانە لە ڕێگەی قورئانی پیرۆزەوە کەوتۆتە بەر گوێ و دیدەی موسڵمانان بە گشتی و موسڵمانانی کوردیش بە تایبەتی، کە لای کورد ئەو سوڕەتەی قورئانی پیرۆز، کە ڕووداوەکانی ئەم باسە لەخۆ دەگرێت و بە سوڕەتی (یوسف) بەناوبانگە، گرنگیی زۆری پێدەدرێت و بەردەوام تا ئەمڕۆش، خەڵك بە زۆری ئەم سوڕەتە دەخەنە سەر ڕیکۆردەرەکانیان و چێژی زۆر لە باسە ئاینی و کۆمەڵایەتییە سەرنجڕاکێشەکەی وەردەگرن.

وەکو ئاماژەی بۆ کرا، بەم شێوەیە ئەم باسە دەکەوێتە بەر گوێی کورد و لەلایەن شاعیرێکی وەکو (سەلیم سلێمان) تەواوی ڕووداوەکانی ژیانی پێغەمبەر یوسف (درووود و سڵاوی خوای لەسەر) لە داستانێك بە ناونیشانی (یوسف و زولێخا) تۆمار دەکرێت.

٣ـ داستانی ئەڤینی:

ئەم داستانانە ناوەڕۆکەکەیان چیرۆکی ئەڤینییەکە، کە لە نێوان کوڕ و کچێك دروست دەبێت، ئەم کوڕو کچانە هەرچەندە مافی خۆیانە بەیەکتر شادبن و ژیانی خێزانی خۆیان بەو شێوەیەی خۆزگەی بۆ دەخوازرێت بەدەست بێنن، بەڵام بە هۆی لە یەك جیا سەرەنجام کچ و کوڕەکە بە ئاواتی خۆیان ناگەن و بە کارەسات تەواو دەبن، نموونەی ئەوەش داستانەکانی (شیرین و خوسرەو) و (لەیلا و مەجنون) و (مەم و زین)ن.

<u>دووەم: لە ڕووی داڕشتنەوە:</u>

لە ڕووی (داڕشتن)ەوە داستان بە لانی کەم ئەم تیۆرانەی خوارەوەی هەیە، داستاننووس بە ڕەچاوکردنی ئەو تیۆرانە بەرهەمەکەی دەنووسێت، بۆ نموونە:

١ـ داستان سەرەتا بە ناوی خوداوە دەست پێدەکات، باسێك بۆ گەورەیی و قودرەت و دەسەڵات و سیفەتە جوانەکانی دیکەی خودا تەرخان دەکات، کە لەمەدا (بەیت)یش هەر وەهایە، بۆ نموونە:

خانای قوبادی لە داستانەکەی خۆیدا (شیرین و خوسرەو) بەم دێڕە دەست پێدەکات:

- به نامی ئەو کەس شیرینی ئەرمەن

پەیدا کەرد، (فەرهاد) پەیش بیٚ بە کۆکەن.[٧]

(سەلیمی هیزانی) لە داستانی (یوسف و زولەیخا)دا بەم پێشەکییە دەست پێدەکات:

- دیباجەییٚ نامە نامیٚ مەعبوود

قەیووم و قەدیم و حەیی و مەوجوود

سازندەئیٚ مومکناتیٚ کەونەین

دارێندەئیٚ کائیناتیٚ بەحرەین

بیٚ مەبدەئو بەستەئو قەدیمی

غەففارو عەزیم و هەم ڕەحیمی.[٨]

(ئەحمەدی خانی) لە داستانی (مەم و زین)دا بەم پێشەکییە دەست پێدەکات:

- سەرنامەیی نامە نامی ئەڵڵا

بیٚ نامیٚ وی ناتەمامە وەڵڵا

ئەی مەتڵەعی حوسنی عیشق بازی

مەحبوبی حەقیقی و مەجازی.[٩]

(حارسی بەتلیسی) لە داستانی (لەیلا و مەجنوون)دا بەم پێشەکییە دەست پێدەکات:

ـ فەهرەستیٚ کتابیٚ ناڤیٚ مەعبوود

قەییوم و قەدیم و حەیی و مەوجوود

بیٚ شوبهە و میسال و عەدل و خالق

سازندەئی مومکینات و فالق

بیٚ ئەووەل و ئاخر و عەزیمی

وەههاب و کەریمیی و ڕەحیمی.(١٠)

(مەلا کەریمی فیدایی) لە داستانی (دمدمنامە)دا بەم پێشەکییە دەست پێدەکات:

ـ بە نێوی ئەوەی بۆ زەوی بۆتە خێو

خوداوەندی دەشت و خوداوەندی کێو

خوداوەندی دەریایی پڕ ئاو و شین

نەخشکێش و ڕەنگڕێژی فەرشی زەمین

خوداوەندی بنیادەم و جنن و دێو

خوداوەندی هەورازو ڕژدو نشێو.(١١)

هۆی چوونە ناو باسیش بە ناوی خودا، دیارە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە شاعیرانی داستاننووسی ئەدەبی کوردی، کەسانی موسڵمان و دەرچووانی خوێندنی شەرعی (حوجرە)کانن، لای ئەوانیش وەك هەر موسڵمانێکی دیکە، دەستکردن بە هەر کارێك بە بێ ناوهێنانی خودا، کارەکە بێ پێز و نرخ دەکات و نابێتە کارێکی تەواو و نایاب، چونکە بە ناوهێنانی خودا بەرەکەتی خودایی دەڕژێتە نێو تواناکانی شاعیر و بەمە خەیاڵی دەوڵەمەند دەبێت و

شتی جوان و جوانتری بۆ دێت، بەڵام بە پێچەوانەوە دیارە کارەکەی ناتـەواو دەبێت، بینای ئەو بیروڕایەش لەسەر بڕواهێنان بەو فەرموودەیەدا دامەزراوە، کـە تیایـدا پێغەمبـەر (درووود و سـڵاوی خـوای لەسـەر) ئـەو ڕاسـتییە لـە موسڵمانان دەگەیەنێت و دەفەرموویێت: (كل كلام أو امر ذي بال لا يفتح بـذكر الله عز و جـل فهـو ابـتر أو قـال أقتـع)[١٢]، جـا لـە سـۆنگەی ئـەو ڕاسـتییەوە نووسینیش وەك هەر کارێکی تر بە ناوی خواوە دەست پێدەکرێت.

٢ــ دەسـتکردن بـە مـەدحی پێغەمبـەر: دیـارە مـەدح و پێهەڵـدانیش بـە پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خـوای لەسـەر) کـارێکی دیکـەی موسـڵمانانە، بـە تایبەت زانـاو نووسـەرەکانیان، کـە لـە دوای ستایشـی خـودا، پیاهەڵـدان بـە پێغەمبەریان بەلاوە گرنگەو بە شانازییەوە وەکو ئەدای ئەرکێکی ئیمانی ئـەو کارە دەکەن، داستانەکانی ئەدەبی کوردیش هەموویان پەیڕەوییان لەم خاڵـە کردووە، بۆ نموونە:

ـ گا چون نیزامی، گا چون مەولەوی
گا وێنەی خوسرەو شوعەرای دەهلەوی
مکەرۆ جە وەصف (خير المرسلين)
میخلات پڕ میشك خەتا خەتی چین
بە شنۆی نەسیم خامەی بۆ سونبول
مشکاوۆ خونچەی تەعریفش چون گول.[١٣]

ـ ئەی شەمسێ مونیرێ عالەم ئارا
تەختێ فەلەکێ ژ بۆ تە صەحرا

خورشید ژ بۆ تو گۆییێ مەیدان

قورصا قەمەرێ بۆتە چەوگان

سووند خوارێ ب تە خودایی غەففار

موختار تو کری جەنابی سەتتار.[١٤]

ـ هێژا نە زەمین نە ئەڤ سەما بوو

ئەو سەروەرێ جوملە ئەنبیا بوو

خەڵقا فەلەکان ژ بۆ وی ڕابوو

سەجدا مەلەکان ژ بۆ وی ڕابوو

ئەو ڕەحمەتێ جوملە عالەمین بوو

ئادەم د میيانێ مائو تین بوو.[١٥]

ـ سەر حەڵقەیێ ئەنبیان محەمەد

مەه چاکر و ئافتابێ موسنەد

شاهێ عەرەبی عەجەم ب پێ کەت

(بوو جەهل) ژ جاهلی ژ ڕێ کەت

دیباجەیێ صنعەتێ ئیلاهی

سەرداری سفێدیی و سییاهی.[١٦]

ـ محەمەد وتەی بێ درۆ و هەقە

درۆزن گەلی کافری سەر ڕەقە

**له تۆ بی هەموو دەم سەلات و سەلام**

**له لایەن خودا ئەی نەبی وەسسەلام.**[١٧]

٣ـ دوای ئەم بابەتانەی سەروو، داستاننووس دێته پاڕانەوه لـه خـودا بـۆ ئەوەی له نووسینی بەرهەمەکەی سەرکەوتنی پیێ ببەخشێ.

دیاره پشت بەستن به خوداو پاڕانەوه لێی بۆ ئەوەی خودا سەرکەوتن بـه داستاننووس ببەخشێت له نووسینەوەی داستانەکەی، مەبەست لێی ئەوەیه، کـەوا خـودا فکـری داسـتاننووس کـۆ و دەوڵەمەنـد بکـات و شـتی جـوانی بـۆ بێنێـت، ئـەوەش وەکـو ئاماژەمـان بـۆی کـرد مەسـەلەیەکی دیکەیـە لــه لاپەڕەکانی پێشـەوەی داسـتاندا داسـتاننووس دەیخاتـه بەرچـاو، تیایـدا بـه شێوەیەکی جـوان و ئـەدەبێکی بـەرز ئـەوەی مەبەسـتییەتی لـه خـودای داوا دەکات، بۆ ئەوەی بیێ ئومێدی نەکات و ئەو مەبەستانەی بۆ وەدی بێنێت، تا بەم هۆیەوه سەرکەوتنی بۆ مسۆگەر بێت، ئەوەتا دەبینین:

**ـ یا ڕەب به فیراق فەرهاد کۆکەن**

**به خورشید حوسن شیرین ئەرمەن**

...

**وێنەی نیزامی صەیقەل دەر زەینم**

**به سورمەی دانش ڕەوشەن کەر عەینم.**[١٨]

**ـ دیسان تو ب فەزڵ و ڕەحمەتا خوه**

**ئیحسان تو بکەی ب هیممەتا خوه**

ئەو نامە تە کر ئیلاهی کامل
هەققە کو تە کر ژ بۆ مە حاصل
هێڤی دکەم ئەی جەنابی باری
مەحفوز بکی ژ عەقلێ تاری
مەحرووس بکی تو جوملە وەقتان
یا ڕاحیم و یا ڕەحیم و ڕەحمان.[١٩]

- یا ڕەب مەدە دەستێ خەلقێ ناساز
ڤێ شاهیدێ دلێ ڕووبایێ تەنناز.[٢٠]

- یا ڕەببی ئەڤی نگارێ فاخر
نووبارەئێ باغێ دەورێ ئاخر
مەحفوز بکەی ژ بێ فەصالان
سەتحی و سەقیم و بێ متالان
پەی کر مە هلانی خامەیا خوە
تەسلیمی تە کر مە نامەیا خوە.[٢١]

- تکایە دەکەم من لە یەزدانی پاك
خوداوەندی ئاو و خوداوەندی خاك

- ببەخشی بە من هێزی شیعری جوان
کە بەیتێکی دانێم ڕێك و ڕەوان.[٢٢]

٤ـ داستاننووس شانازی بەوە دەکات، کە ئەو بەرهەمەی نووسیویەتی، تەواوی هی خۆیەتی و لە فەرهەنگی بیر و ڕۆشنبیری خۆی هەڵیهێنجاوە، هیچی لە کەس وەرنەگرتووە، بۆ نموونە:

ـ مونشی ئەی ئینشای شیرین تەڕ جە قەند
بەی تەور تەحریر کەرد نەزمی دل پەسند.[٢٣]

ـ ئەڤ نامە نویسندەئێ دەوران
تەشبیهێ گولەك د نێڤێ خاران
هندی ب ئەزییەت و جەفایێ
ئیخراج مە کر د گەل عەنایێ.[٢٤]

ـ مەوزوع و مەقاصد و حیکایەت
مەڕموزو مەناقیب و دیڕایەت
ئوسلوب و صیفات و مەعنا و و لەفز
ئەصڵەن نەکرن مە ك ژوان قەرز
بیلجوملە نەتایجێ د فکرن
دوشیزە و نەوعەروس و بیکرن.[٢٥]

ـ یاڕەبی ئەڤی نگارێ فاخر
نووبارەئێ باغێ دەورێ ئاخر.[٢٦]

**ـ دەبێ لێ بدەم لافی ئەسکەندەری**

**بەڕێز و بەقەدرم لە کن گەوهەری**

**ئەوا نامەی دمدمم من کرد تەواو**

**ئەبەو نامە خەزنەی دەکەم من بڵاو.**[٢٧]

٥ـ داستاننووس دوعای ئەوە دەکات خوای گەورە بەرهەمەکەی لە دەست و زمانی پیاوی خراپ و، دڵڕەش بپارێزێت:

**ـ ئومێدەن بە زات دانای شیرین کار**

**مەزمون ئەی نەزم جەواهیر نیگار**

**چوون ڕازی شیرین نادیرەی ئەییام**

**شیرین بۆ بە کام کاففەی خاص و عام.**[٢٨]

**ـ هێڤی دکەم ئەی جەنابی باری**

**مەحفوز بکی ژ عەقڵێ تاری**

**مەحرووس بکی تو جوملە وەقتان**

**یا ڕاحیم و یا ڕەحیم و ڕەحمان.**[٢٩]

**ـ یا ڕەب مەدە دەستێ خەڵقی ناساز**

**ڤێ شاهیدێ دڵ ڕووبایێ تەنناز.**[٣٠]

ـ یاڕەبی ئەڤی نگاریٚ فاخر
نووبارەئیٚ باغیٚ دەوریٚ ئاخر
مەحفوز بکەی ژ بیٚ فەصالاّن
سەتحی و سەقیم و بیٚ متالاّن.(٣١)

ـ خودایە ئەمن زەحمەتم بردووە
سەدیٚکم لەبەر دمدمی بەستووە
لە دەست جرجە مشکان تۆ بیکە دوور
کەلیٚنی دەنا تیٚ دەخەن دەچنە ژوور.(٣٢)

٦ـ چوونە ناو باس لە (داستان)دا زۆربەی جارەکان، بە گێڕانەوە دەست پیٚ ناکات و داستاننووس بە زاراوەکانی: (وەها باس ئەکەن)، (یارانی مەجلیس گویٚ بگرن)، (وایان نووسیوە)و دەستەواژەی دیکەی هاوشێوە داستانەکەی پێشکەش ناکات، بەڵکو ئەم سادەییەی جێهێشتووە و یەکسەر باسێك دەکاتەوەو لەوێوە درێژە بە باسەکانی دەدات، یانیش دەشێت لە هەندیٚ (داستان)دا دوای دەستپێکەکەی بڵێت: (ڕیوایەت گێڕەوەکان وەهان ڕیوایەت کردووە)، کە زۆر جار ئەو زاراوەیە بەکاریش ناهێنرێت وەکو گوتمان، بەڵام ئەگەر لە هەندیٚ (داستان)دا بەرچاویش بکەوێت، ئەمە مانای وانییە تەواو وەکو بەیتبێژەکانی کردبێت، بەڵکو بە شێوازێکی ئەدەبی بەهێزتر و قەبەتر ئەو باسەی دەخاتە ڕوو، ئەوەتا (خانای قوبادی) داستانەکەی خۆی (شیرین و خوسرەو) بە شێوەیەکی دیکە دەست پیٚ دەکات، ئەویش ئەوەیە دوای سەرەتایەك بۆ (ستایشی خوا) و بەشێکی دیکە

بۆ وەسف و مەدحی پێغەمبەری خوا (درووود و سڵاوی خوای لەسەر) بە ناونیشانی (میعراج نامە)، یەکسەر دەست بە داستانەکەی دەکات و دەنووسێت:

**ـ شوعەرای شیرین نەزم شەکەر ریزەی راز**

**شێخ نیزامی تەور شەفیعا ئەنداز**

**بە رەشح خامەی میشکین چوون مانی**

**بەی تەور ئینشا کرد لەوح مەعانی**

**چوون بە حەسبەل ئەمر قەدیمی لا مەوت**

**نەوشێروان نۆشا مەی جە شیشەی فەوت.**(۳۳)

(سەلیمی هیزانی) لە (یوسف و زولەیخا) دوای پێشەکییەکانی کە سێ پێشەکین، یەکەمیان تایبەتە بە: (دەر حەققێ عەزەمەتێ خودانێ)، دووەمیان تایبەتە بە: (دەر وەصفێ ڕەسولێ ئەعزەم و وەصفێ معراجا وی)، سێیەمیش تایبەتە بە: (دەر سەبەبێ نەزما ڤێ قصصەتێ)، یەکسەر و بەم شێوەیە دەست بە نووسینی داستانەکەی دەکات:

**ـ تەحریر بکەم ژ نوو ڕوایەت**

**تەجدید بکەم ژ نوو حیکایەت**

**ئەمما ب سەعادەت و ب عونوان**

**ئەم بەحسێ بکەین ژ پیرێ کەنعان**

**یەعقوبێ هەبوو د بورجێ ڕەفعەت**

**چەند ئەختەرێ مەتلەعا نبووەت.**(۳٤)

(ئەحمـەدی خـانی) لـە (مـەم و زیـن)ەكـەی دا، دوای پێشـەكییەكانی لـە بارەی باسـی گرنگـی وەكـو: (پەسـنێ خـودێ)، (گـازی و لاڤـایی)، (پەسـنێ پێغەمبەر)، (خواستنا مەهدەر ژ پێغەمبەر)، (كول و دەردێ مە كوردا)، (چما ب كوردی نڤیسییە؟)، (مەی ژ مەیگێڕ خوەستن)، وەها دەست بە باسـەكانی داستانەكەی دەكات:

- نەققاشێ صەحیفەیێ حیكایەت
نەققادێ سەبیكەیێ ڕیوایەت
كێشا ب ڤی تەڕحێ ڕەسم و ئاین
لێ دا ب ڤی تەرزێ زەڕب و تەزیین
گۆ: پادشەهەك زەمانێ سابیق
ڕابو د حكومەتا خوە فائیق.(٣٥)

لێـــرەدا ڕاســـتە (خـــانی) ئامـــاژە بـــەوە دەكـــات، كـــە نووســـەرو حەكایەتگێڕەوەكان بەو جۆرە قسەیان كـردووە، بـەڵام ئـەوە بـە شـێوازێكی ئەدەبی بەرزە، نەك بـە سـادەیی و ئاسـانی هـەر لـە دەسـتپێكەوە، گـوتبی: (نووسەرانی پێشوو وایان نووسیوە).

(حارسی بەتلیسی)ش لـە (لـەیلا و مـەجنون)دا، دوای پێشـەكییەكانی بـە ناونیشـانی: (دیباچـە)، (ئیقـراڕ ب ئیرسـالا نـەبی و ڕەسـولان و ئیسـباتا كـو محەمـــەد ســـەروەرە ل وی مـــەقبولان)، (د مـــەدحا پێشـــڕەوێ جوملـــەئێ مەخلوقات حەزرەتێ سەییدول سادات)، (سەبەبێ نەزما كتابێ بـۆ هـەڤالان)، هاتۆتە سەر نووسینەوەی داستانەكەی و بەم شێوەیە دەستی پێكردووە:

- ڕاوییێ عەزیزێ خوەش ڕیوایەت
ئەڤ قصصە دکر وەها حیکایەت
کو ژ مولکێ عەرەب حەمییە نامەك
عالی هیممەت و غەقلێ تەمامەك.[٣٦]

دیارە (حارسی بەتلیسی)ش ئامـاژەی کـردووە بـەوەی کـە گێـڕەرەوەی حەکایەتەکان وایان گێڕاوەتەوە، بەڵام ئەویش شێوازەکەی جیایە لە شێوازی نووسەرانی (بەیت) و ئەدەبییانەتر باسەکەی پێشکەش کردووە.

هەرچی (مەلا کەریمی فیدایی)یە، ئەویش لە (دمدمنامە)کەی خۆیدا، پاش پێشـەکییەکانی بـە ناونیشـانەکانی: (باسـێ لـە خـودای مـەزن)، (باسـێ لـە پێغەمبـەری مـەزنی ئیسـلام)، (باسـێ لـە قورئـان)، (چـوونی پێغەمبـەر بـۆ میعراج)، (داوای فیدایی لە خودا بۆ یاریـدەدانی لـە دانـانی بـەیتی دمـدم دا)، هاتووە بەم شێوە داستانەکەی دەست پێکردووە:

- لەنێو کورد ئەوەی کە گەل دۆست بوو
ئەمیرخان خانی برادۆست بوو
هەر ئەو بۆ گەل و هۆزی غەمخۆر بوو
هەر ئەو دەست و دڵباز و شت زۆر بوو
بە هێزو سوپا وەك سولەیمان بوو
لە تیرەو ڕەگی هۆزی گۆران بوو.[٣٧]

٧- داستان لە ئەدەبی کوردیدا بە زۆری (تراژیدی)یە، ئـەوەتا هـەموو ئـەو داسـتانانەی لـەم لێکۆڵینەوەیـەدا لێکۆڵینـەوەیان لەسـەر کـراوە، کـە پێـنج

داستانە ناودارەکـەن: (شـیرین و خوسـرەو ـ مـەم و زیـن ـ لـەیلاو مـەجنون ـ دمدمنامە، یوسف و زولەیخا)، هەموو ئەوانە تراژیدین، ئەوەش دیارە لەوەوە سەرچـاوەی گرتـووە، کـە کـاری تراژیـدی زیـاتر کاریگـەری دەبێـت و زۆرتـر دەمێنێتەوە.

٨ـ داستان بە زمانی کەسی سێیەم دەنووسرێت، واتـە پاڵـەوان هەمیشـە کەسی سێیەمە، ئەو ڕۆڵی سەرەکی و شاکەسی داستانەکە دەبینێت.

٩ـ داستان ئەگەر قارەمانی بوو هەمیشـە دوو قارەمـانی هەیـە، قارەمـانی سـەرەکی ئـەو سـەرکردەیەیە، کـە داسـتاننووس پیـای هەڵدەدا، قارەمـانی دووەمـیش ئەوەیانـە، کـە دوژمنـی قارەمـانی سـەرەکییە، لـەو بارەشـدا داستاننووس هەمیشە سیفەتە جوان و بەهێزەکان دەداتە قارەمانی یەکـەم و سیفەتە قێزەون و لاواز و خراپەکانیش دەداتە قارەمانی دووەم، بـۆ نموونـە: (خـانی لـەپ زێـڕین و شـا عەباسـی سـەفەوی) و (مـەم و زیـن) و (لـەیلا و مەجنون) هەریەکەیان قارەمانی سەرەکی داستانەکانن، ئەوەتا دەبینین:

مـەلا کـەریمی فیـدایی لـە بـارەی (ئـەمیر خـان)ی قارەمـانی داسـتانەکەی دەنووسێت:

ـ ئەمیر خان بەگزادەیی پڕ هونەر
زرێی شێرە مەردانی کوردی لەبەر
لە بەخشیندا دوژمنی ماڵ بوو
لە ڕۆژی شەڕدا ڕۆستەمی زاڵ بوو
لە کاتی شەڕی شیر و تیر و کەوان
لە مەیدانی شەڕدا دەبوو قارەمان.[٣٨]

ئینجا دێتە وەسفکردن و پیاهەڵدانی ئەمیر خان لە شەڕداو دەنووسێت:

**ـ شەڕی قارەمانانی دمدم مەکان**

**دژی زوڵم و یاسایی زەححاکەکان**

**شەڕی کاوەیی کوردی بێ ترس و لەرز**

**ئەمیر خان سەرکردەیی پایەبەرز.**(٣٩)

ئینجا باس لە قەڵای ئەمیرخان دەکات و بە بێ وێنەی پەسن دەدات:

**ـ قەڵایێ لە دونیایە بێ وێنە بوو**

**لە سەختی و بڵندی نموونەی نەبوو**

**لەوێدا گەلی کوردی پڕ هۆش و بیر**

**بە تۆپ و تفەنگ و بە شمشیر و تیر.**(٤٠)

لەولاشەوە مەلاکەریمی داستاننووس دادەبەزێتە سەر سوپاکەی دوژمنی ئەمیرخان، کە قزڵباشەکانن و بە ترسنۆك و شکاو پەسنیان دەدات:

**ـ قزڵباش دەکەوتن لە دەوری قەڵات**

**مەرگ بۆ سەفەویانی ڕووڕەش دەهات**

**لە بۆ ئەو کەسەی کە قزڵباش بوو**

**لەشی وی گەنم مەرگ بەرداش بوو.**(٤١)

دواتریش باس لە خراپی و ناشرینی شا عەباس دەکات و وەسفی خراپی دەداتە پاڵ، بۆ نموونە لەو پارچەیە باسی لە دونیا دەرچوونی شا عەباس دەکات و دەنووسێت:

- که چەنگی لە عەباس شا دا مەرگ
ئەوی کرد باریك هەر وەك زەرگ
بە دەس مەرگ نەیما بزۆزی و سڵی
بەبێ موڵك و لەشکر دەچۆ بن گڵی
لە گۆڕا کە بێ ڕێزو دەرمندە بوو
لە ڕەفتاری پێشووی شەرمندە بوو.[٤٢]

سەلیمی هیزانی وەسفی هەریەکە لـە (یوسـف) و (زولـەیخا) بـەم شـێوەیەی خوارەوە دەکات، لە بارەی (یوسف)ەوە دەڵێت:

- مالك فەککری د یووسفێ پاك
تەشبیهی قەمەر د ئەوجێ ئەفلاك
دونیا کرییە ئەوی مونەووەر
صەحرا کرییە زیادە ئەنوەر
قەت فەوتی نەکر ل با خوە دانی
گۆیا کو دڤێتی وی هلانی.[٤٣]

لە بارەی (زولەیخا)شەوە دەڵێت:

- قیزەك هەبوو وی زیادە زیبا
ناڤێ وێ کچێ ب خوە زولەیخا
مەحبوبە د نیڤ زەمان و دەهرە
بەلکی ب مەسەل پەری و حوورە

**ڕۆژێ قە نەدیتبوو سی یا وێ**

**ماهـ ژی نەگەیشتبوو ڕێیا وێ.[٤٤]**

حارسی بەتلیسی لە بارەی کەسایەتی (مەجنون)ەوە هەر لە باوك و بنەماڵەکەی و ڕۆژی هاتنە دونیایەوەی دەست پێدەکات، بۆ ئەوەی نرخ و پایەی ئەو قارەمانەی داستانەکەی هەر لە سەرەتای هاتنە دونیاوەی بخاتە بەر چاو و دەنووسێت:

**ـ کو ژ موڵکی عەرەب حەمییە نامەك**

**عالی هیمەت و عەقل تەمامەك**

**صاحب دەر و چادر و عەماری**

**مەشهورە ب عززو نامداری**

**تفلەك بەخشی وی رەببی مەعبوود**

**مەهپارەیەکی حەلاوە ئەندوود**

**مەحبوب و لەتیف و خووب و دولبەر**

**تابەبدە ژ ڕەنگێ شەمسێ خاوەر**

**بابی کرە شاهی و نەشاتە**

**دان صەدقەو درهەم و سماتە**

**پاشی صەدەقات و شادمانی**

**ئسمێ وی ب ناڤێ قەیس دانی.[٤٥]**

لەم پارچەیە داستاننووس دەری دەخات، کە پایەی مەجنون (قەیس) چەند گەورەیەو لە چ بنەماڵەیەکی ناودار و باوکێکی گەورەو دیندار و بە دەسەڵاتە. ئینجا لە بارەیەوەی دەڵێ:

**حینا کو سنینی عومری دەھ بوو**

**لاوەك ب جەمالێ شوبهی مەھ بوو.**(٤٦)

ئینجا داستاننووس دڵسۆزی و ڕادەی خۆشەویستی و ئەمەکداری مەجنون دەخاتە بەر دەست و دەنووسێت:

**ـ ئەز پادشەھم ب تورەیا عشق**

**زنجیرێ جونوونە صورەیا عشق**

**کووڤی ژ مەڕا عەساکری سەخت**

**هەم سەڵتەنەت و حەیات و هەم تەخت**

**نادەم ئەز ئەڤان ب موڵك و ماڵان**

**ئەی شەیخ مەکە ئەڤان متاڵان.**(٤٧)

لە بارەی کەسایەتی دووەمی داستانەکەش، کە لەیلایە، داستاننووس دەنووسێت:

**ـ دوختەك عەرەبی ب ناڤێ لەیلا**

**هەمسەر گەڕیا ب قەیسی شەیدا**

**خوش نادرە دوختەرەك لەتیفە**

**بۆ جان و دڵی عەجەب زەریفە**

**دەریایێ حەیا و عزز و عیسمەت**

**کانا ئەدەبێ و گەنجێ ڕەئفەت.[٤٨]**

١٠ـ داستاننووس ساڵی لێبوونەوە لە نووسینی داستانەکەی دەخاتە ناو بەرهەمەکەی و لە دواپین بڕگەکانی داستانەکەی ئەو مێژووە تۆمار دەکات.. بۆ نموونە:

خانای قوبادی مێژووی (شیرین و خوسرەو)ەکەی بەم شێوەیە دەنووسێت:

**ـ (عزیز القدر)ێ ئەو چون نیزامی**

**بپەرسۆ تەئریخ ئەی نامەی نامی**

**(غەین) و (قاف) و (نون)، (جیم) کەرۆ حیساب**

**لێش مبۆ ڕەوشەن چون قورص ئافتاب.[٤٩]**

ئەم تیپانە بە ژمارەی تیپەکانی ئەبجەد دەکەنە ساڵی ١١٥٣ی هیجری، وەك چۆن هەر (خانا) خۆی لە دێڕەکانی دواتریدا بە ڕوونتر ئەو مێژووە دەردەخات و دەنووسێت:

**ئەوڕۆ کە خامەی عەنبەر شەمامە**

**وەش بۆ کەرد جە مێشك ئینشای ئەی نامە**

**تەئریخی هیجرەت ختم (المرسلین)**

**موتیعی دیوان شەرحی شەرع و دین**

**ڕۆی دووشەممە بی (زی حیججەی حەڕام)**

**هەزار و پەنجاو یەکسەد سێ تەمام.[٥٠]**

ئەم مێژووەش دیارە مێـژووی دەسـتپێکردنیەتی بـە نووسـینی (شـیرین و خوسرەو)، چونکە وەکو لە سەروو ئامـاژەی پێـدەکات، گوایـە ئیلـهامی دڵـی کراوە، کە بێت شاکارێکی بەو شێوەیە بنووسێت.

(سەلیم سلێمان) مێژووی (یوسف و زولەیخا) بەم شێوەیە تۆمار دەکات:

**ـ لەورا ب حیکایەتێ شەنییە**

**تەئریخ ژ ئسمێ حەق غەنییە.** (٥١)

بە حیسابی ئەبجەد وەکو (تەحسین دۆسکی) لە نوێترین لێکۆڵینەوەی لەو بوارەدا دەری خستووە و، ڕاکەی جیایـە لـە ڕای ڕۆدینکـۆ و ژاپـا و کەسـانی دیکـەی پێشـە خـۆی، (حـق = ١٠٨) و (غـنی = ١٠٦٠) کـەوابێ مێـژووی هۆنینەوەی یوسف و زولـەیخا ی سـەلیم سـلێمان بریتییـە لـە سـاڵی ١١٦٨ی هیجری بەرانبەر بە ساڵی ١٧٥٤ یان ١٧٥٥ی زایینی. (٥٢)

ئەحمەدی خانی ساڵی لێبوونەوە لە نووسینی (مەم و زین)ەکەی بە ساڵی ١٠٦١ی هیجری دەستنیشان دەکات و، لە دوایین دێڕەکانیدا دەنووسێت:

**ـ لەورا کو دەما ژ غەیب فەك بوو**

**تەئریخ هەزار و سێست و یەك بوو.** (٥٣)

(حارسی بەتلیسی)ش مێژووی (لەیلاو مەجنون)ەکەی وەها تۆمار دەکات:

**ـ نەهـ ڕۆژ تەمام پاشی نەورۆز**

**مەنقووش م کر بگێن پیرۆز.** (٥٤)

ئەوە ئەوە دەگەینێت کە لە ٣١ی مانگی ئـازار و پـاش نـەورۆز بـە ١٠ ڕۆژ حارسی بەدلیسی (لەیلا و مەجنون)ەکەی خۆی نووسیوە، هەرچی سەبارەت بە ساڵەکەشیەتی دەنووسێت:

**مەغزێ دەڤ و لێڤ و سەعیێ سننە**

تەئریخ ژ وی لەو ژ (مەغزێ سننە) (لەیلاو مەجنون)ی حارسی بەدلیسـی. بڕوانە: حارسێ بەدلیسی، لەیلا و مەجنوون، بەرهەڤکرن: تەحسین دۆسـکی، ل٤٢.

دیارە ساڵەکە بەو شێوە دەدۆزرێتەوە:

مغز: (م = ٤٠) + (غ = ١٠٠٠) + (ز = ٧) = ١٠٤٧.

سنە: (س = ٦٠) + (ن = ٥٠) + (هـ = ٥) = ١١٥.

بەم پێیەش ١٠٤٧ + ١١٥ = ١١٦٢

کەوابێ ١١٦٢ ساڵی نووسین و تەواوبوونی (لـەیلاو مـەجنون)ی حارسـی بەدلیسی.[٥٥]

ـ هەرچی (مەلا کەریمی فیدایی) نووسەری (دمدم نامە)شە، ئەویش سـاڵی لێبوونەوە لە نووسینی (دمدم نامە)کەی لـە دوایـین دێڕەکانیـدا دەستنیشـان دەکات ، کە ساڵی ١٣٦٧ی (هەتاوی)یە و دەنووسێت:

**ـ کە مێژووی هەتاوی وەسەر گەڕ دەکەوت**
**هەزاری دەگەڵ سێسەد و شەست و حەوت**
**لە هاوینی ئەو ساڵە دەستم بە کار**
**دەکرد چوومە دمدم بە کەیف و دەمار**

دەکەوتم وەنێو بەیت و باوی ئەوی
ملم نا لە کێوی بڵند و نەوی.[٥٦]

١١ـ داستان هەردوو شێوازی گێڕانەوە کە هی (هەقایەت و ئەفسانەو سەربردەکان)ە، لەگەڵ وتووێژ، کە هی (دراما)یە، بە یەك تێکەڵ دەکات، بۆیە هەندێ شوێنی (گێڕانەوە)یە و هەندێ شوێنی (وتووێژ)ە.

١٢ـ داستان سەرەتاو ناوەڕاست و کۆتایی هەیە، بیسەر یان خوێنەر بە ئاسانی هەستیان پێدەکات.

١٣ـ سەرچاوەی داستان ڕووداوە واقیعییەکانە، بۆ نموونە (مەمی ئالان) سەرچاوەی (مەم و زین)ە، یوسف و زولەیخای میسری سەرچاوەی (یوسف و زولەیخا)یە، شەڕی خانی لەپ زێڕین و شای سەفەوی کە ڕووی داوە و ڕاستەقینەیە، ئەوە بووەتە سەرچاوەی داستانی قەڵای دمدم و سەربردەی قەیس و لەیلا بووەتە سەرچاوەی لەیلا و مەجنوون و... بەم شێوەیە.

١٤ـ کۆتایی داستان دیسانەوە بە پاڕانەوە دێت:

لە کۆتایی داستاندا، کە داستاننووس لە بەرهەمەکەی دەبێتەوەو ئەوەی مەبەستیەتی دەیخاتە چوارچێوەی بەرهەمەکەی، کۆتایی پاڵەوانەکان هەمیشە بە بەیەك نەگەیشتنی ئاواتەکان و بە کارەسات تێچوونی پاڵەوانەکان دێت، جا ئاواتەکە چ بەیەکگەیشتنی کچ و کوڕێك بێت وەکو لە داستانە ئەڤینییەکان ئەوە بەدی دەکرێت، یان چ سەرکەوتنی نەتەوەیەك بێت، وەکو

لـە داسـتانە قارەمانییـەکان ئـەوە بـەدی دەکرێـت و لـە هـەردوو باریشـدا کارەساتە گەورەکەی دوایین بەشـی داسـتانەکە خوێنـەر دەهـەژێنێت، ئیـدی داستاننووس دەگاتە ئـەوەی کـە ژیـان وەهایـە کۆتاییەکـەی بـۆ مـرۆڤ هـەر گەڕانەوە بەر ڕەحمەتی خوایە، ئینجا لەوێ بـە گـوێرەی کردەوەکـانی خـۆی پاداشت وەردەگرێتەوە، ئەگـەر بـاش و خوانـاس بـوو بـە بەهەشـت و ئەگـەر خراپ و خوانەناس بوو بە دۆزەخ، بۆیە جارێکی دیکە شاعیر ڕووی پاڕانەوەی دەکاتە خوای گەورەو وەکو بەندەیەکی لە خواترس داوای بەخشین و چـوونە بەهەشتی لێ دەکات، کە ئەو مەبەستە بـە شـێوازی جۆراوجـۆر لـە دەربڕینـدا بەرجەستە دەکەن، بۆ نموونە:

**- یاران بە زاری بە دیدەی نماک**

**سەرداران بە هەم سپاردەن بە خاک**

**دەوران بێ پۆ کارش دوو ڕەنگەن**

**ئاخر جای گشتمان ئەو ماوای تەنگەن.**[٥٧]

هەرچـەندە سـاغکەرەوەی ئـەو (داسـتان)ە بـە پشـت بەسـتن بـە قسـەی نووسەرەوەی ئەو (داستان)ە، ئاماژە بەوە دەکات، کە لە بەشی کۆتایی ئـەو (داستان)ەدا هەندێ شت ون بووە، وەکو دەڵێت:

**تەمام بکەرێم بە فەزڵی بێچوون**

**ئەشعاری کوردی خەرەم ماوەروون**

**هەرچەند خاتیمەش ناتەمام بییەن**

**جە ئێد زیادتر نوسخەیێ نییەن**

بۆیـه نووسـەرەوەی (داسـتان)ەکـه خـۆی لای خـۆی و لـه پـەراوێزدا ئـەو زیادەیەی بۆ دەکات:

**ئومێدم ئێدەن جه لوتف ئەڵڵاه**

**عەفومان کەرۆ له جوملەی گوناه**

**به زەبەردەستێی ئەحمەدی حەبیب**

**قەترێ جه ڕەحم بکەرێم نەسیب.**(٥٨)

(سەلیم سلێمان) وەها دەپاڕێتەوە:

**ـ ئەز ئاسیم و موزنیب و خەرابم**

**هەرچەندە خەبیس و نا سەوابم**

**ئەز موجریمەکم ژ پایی تا فەرق**

**ئەز مامە د فەزڵ و ڕەحمەتا حەق**

**ڕۆژا کوو ببیتە حەشر و مەحشەر**

**وەجهی مە بکی زییادە ئەنوەر.**(٥٩)

(ئەحمەدی خانی)ش وەها دەپاڕێتەوە:

**ـ ئیسال گەهیشتە چل و چاران**

**وی پێشرەوی گوناهکاران**

**ڤێکدا ژ مەناهییان گەلەك مال**

**یەك پول نەهن ژ حوسنی ئەعمال**

**ئەووەل کو تەدا ژ عیشقێ مەتڵەع**

**ئاخیر بدە وی تو حوسنێ مەقتەع.**(٦٠)

(حارسی بەتلیسی)ش دەنووسێت:

**ـ مامە د خەما خوە دا ئیلاهی**

**چار و مەدەدا مە ڕوو سییاهی**

**مەوتا مە حەقەو ئەز نەوێرم**

**لەوڕا گونەهان عەجەب ددێرم**

**ڕاکی ل م کەی و من ڕەهاکەی**

**بۆ خاتریٚ ئالیٚ موستەفا کەی.**(٦١)

<u>**سێیەم: لە ڕووی (فۆڕم)ەوە**</u>

**لە ڕووی (فۆڕم)ەوە داستان بە لانی کەم ئەم تیۆرانەی خوارەوەی هەیە، داستاننووس بە ڕەچاوکردنی ئەو تیۆرانە بەرهەمەکەی دەنووسێت، بۆ نموونە:**

**١ـ داستاننووس دەبێت شاعیر بێت، چونکە داستان بە هۆنراوە دەنووسرێتەوە، نەك بە پەخشان، وەکو لە سەروو نموونەی زۆر خراونەتە بەرچاو بۆیە لێرەدا پێویست بە درێژکردنەوە ناکات.**

**٢ـ هۆنراوەی داستان دوورو درێژەو ژمارەی دێڕەکانی دەشیٚ بە لانی کەم لە (٩٠٠) یان (١٠٠٠) دێر کەمتر نەبێت، ئەوپەڕەکەشی بە پێی هەلگرتنی بابەتی داستانەکەو توانای دەربڕینی داستاننووسەکە دەشێت درێژ، یان زۆر درێژ بێت، بۆ نموونە: (شیرین و خوسرەو)ی (خانای قوبادی) بریتییە لە (٥٥٢٦) دێڕ، (یوسف و زولەیخا)ی سەلیم سلێمانی هیزانی (٢١٢٧) دێڕە، (مەم و زین)ی ئەحمەدی خانی (٢٦٥٥) دێڕە، لە ئەدەبیاتی نەتەوەکانی**

تریش داستانی زۆر درێژ هەیە بۆ نموونە: (شیرین و خوسرەو)ی (نیزامی گەنجەوی) ئەو چاپەی کە ئەکادیمیای ئازەربێجان لە ساڵی ١٩٦٠ لە باکۆ چاپی کردووە بریتییە لە (٦١٨٨) دێڕ، (.. (شانامە)ی (فیردەوسی) ٦٠٠٠٠ بەیت شیعرەو (مهابهارتە)ی هیندی ١٠٠٠٠٠ سەد هەزار بەیت شیعرەو (ئەلیادەی هۆمیرۆس) (١٦٠٠٠) بەیت شیعرە).[٦٢]

٣ـ هۆنراوەی داستان دابەش دەبێتە سەر ژمارەیەکی زۆر (سەرە باس)ی لاوەکی، کە ئەمە لە (ڕۆمان)دا وەکو بەشی لە یەك جیا و تەواوکەری یەك بە ژمارەکانی (١) و (٢) و (٣) و...هتد دابەش دەکرێت، واتە بەشەکانی داستان ناوی تایبەتی خۆیانیان هەیە، بۆ نموونە:

ئەمانەی خوارەوە هەندێ لە سەرەباسە گرنگەکانی (شیرین و خوسرەو)ن، هەر لە سەرەتاوە بەم شێوەیە باسەکان بە دوای یەکدا دێن:

ـ سەرنامە

ـ میعراج نامە

ـ تەوەلود شودەنی خوسرەو

ـ ڕەفتنی خوسرەو بباغ با غولامان

ـ نشستن خسرەو بەر تەختی شاهی

ـ حیکایەت کردنی شاپور ئەز شیرین

ـ ڕەوانە نمودن خسرەو شاپورڕا ب ئەرمەن بجیهەتی شیرین

ـ خەبەر پورسیدەنی شاپور مەکانی شیرن ڕا

ـ کشیدەنی شاپور صوڕەت خسرەوڕا نوبەتی ئەڤڤەل

ـ کشیدەنی شاپور صوڕەت خسرەوڕا نوبەتی دووم

ـ کشیدەنی شاپور صوڕەت خسرەوڕا نوبەتی سووم

- خەبەر دادەنێ شاپور شیرین ڕا ئەز کەیفییەتی صوڕەت

- تەدبیر کەردەنێ شاپور بەجیهەتی شیرین و فرستادەنی ئو ب مەدائین

- ڕەفتەنی شیرین ب مەدائین

- ناپیدا شودەنی شیرین و خەبەر خەبەر ئاوردن جیهەتی مهین بانو

- ڕەسیدەنی شیرین بە چەشمەیی تاق بستان

- قەهرکردنی خسرەو ئەز هورمز و ڕەفتـەن ب ئەرمـەن و دەر مییـان ئـاب بشیرین ڕەسیدەن

- ڕەسیدەنی شیرین ب مەدائین و ئامەدەنی خسرەو ب ئەرمەن

ئیتر بەو شـێوەیە باسـەکان بـەرەو دوا دەڕۆن، یـەك لـە دوای یـەك وەکـو زنجیرەیەکی بە دوای یەك بەستراودا تا تەواوی داستانەکە دەگەیننە کۆتایی.

لە (مەم و زین)یشدا بە هەمان شێوە (داستان)ەکە دابەش کراوەتە سـەر چەندین بەشی بە دوای یەکدا هاتوو، ئەمانەی خوارەوە ناونیشانی هەندێ لـە بەشەکانی سەرەتاکەینە:

- پەسنێ خودێ

- گازی و لاڤایی

- پەسنێ پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خوای لەسەر)

- خواستنامەهدەر ژ پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خوای لەسەر)

- کول و دەردێ مە کوردا

- چما ب کوردی نڤیسییە

- مەی ژ مەیگەر خواستن

- میرێ بۆهتان و خوشکێت وی

- ڕندی و ئەڤین

ـ تاجدین و مەم

ئـیتر بـەم شـێوەیە، هـەر لـە سـەرەتای هۆنراوەکـە تـا دەگاتـە کۆتـایی، چەندین ناونیشانی لاوەکی لە پـێش خوێنـەردا زەق دەبنـەوە، بـە هـەموویان داستانەکە دەگەیننە کۆتایی.

٤ــ لەبـەر درێـژی هـۆنراوەی داسـتان، بۆیـە لـە ڕووی سـەرواوە داسـتان پـەیڕەوی لـە (سـەروای گـۆڕاو) یـان (جـووت سـەروا) دەکـات، چـونکە بـە پێچەوانەوە ناشێت تەواوی ئەو هـەزار دێڕانـەی بـە یـەك (سـەروای چەسـپاو) بنووسێت.

سیستمی (سەروای گۆڕاو) یان (جووت سەروا) بریتییە لەوەی: هـەر دێـڕە هۆنراوەیـەك بـە درێـژایی هـەموو داسـتانەکە سـەروایەکی تایبـەت بـە خـۆی هەبێت، دەشێت جاری وەها ڕێك بکەوێت دوو دێڕ یـان زیـاتر بـە دوای یەکـدا هەمان سەروایان هەبێت، بەڵام ئەمە بە هیچ شێوەیەك واتای ئەوە نادات، کە ناچاری وای کردبێـت دێـڕی دواتـر لەسـەر هـەمان دێـڕی پێشـووی سـەروادار بکرێت، بەڵکو ئەوە دەربڕینەکە وای دەسەپێنێت.

ئەوەتا بۆ نموونە:

(خانای قوبادی) لە (شیرین و خوسرەو)دا دەنووسێت:

**شەویٚ وێنەی شەمع تەجەللای کۆی تور**

**عەرسەی سەر زەمین ڕەوشەن بیٚ جە نوور**

**چەند چین چەرخ چوون دێبای گوڵ دۆز**

**مە ڕەوشا جە دوور نەجم شەب ئەفرۆز**

**توراب تیرەی ئەرز عەنبەرێن**

**مبەخش شۆلەی شەمس خاوەرین.**[٦٣]

سەرواى ئەم چەند دێڕە بەم شێوەیەن:

١................ ڕ

................ ڕ

٢................ ز

................ ز

٣................ ن

................ ن

(ئەحمەدى خانى)ش لە (مەم و زین)دا بەم شێوەیە دەنووسێت:

**ـ گەر دێ هەبوویا مەژى خودانەك**

**عالى كەرەمەك لەتیفە دانەك**

**عیلم و هونەر و كەماڵ و ئیزعان**

**شیعر و غەزەل و كیتاب و دیوان**

**ئەڤ جینس ببا ل باوى مەعمول**

**ئەڤ نەقد ببا ل نك وى مەقبول.**(٦٤)

ئەم چەند دێڕە هۆنراوەیەى سەروو (سەروا)ى دێڕەكانى بەم شێوەیەن:

١................ك

................ك

٢................ن

................ن

٣................ل

................ل

دەبینین هەر دێڕێك بە پیتێکی جیا لە دێڕەکەی پێشووی خۆی (سەروا)ی بـۆ خـۆی دروسـت کـردووە، داسـتانەکانی دیکـەش هـەر بـە هـەمان سـەروا نووسـراون، وەکـو لـەو نموونانـە دەردەکـەوێت، کـە بـۆ باسـەکانی پێشـتر خراونەتە ڕوو، بۆیە پێویست بە دووبارە هێنانەوەیان ناکات.

بەوەش کەوابێت لە داستاندا وەکو ئاماژەمـان بـۆی کـرد، هـەر دێڕێـك بـە پیتێکی جیا لە دێڕەکەی پێشووی خۆی (سەروا)ی بۆ خۆی دروست دەکـات، هەرچەندە دەشێت هەندێ جار چەند دێڕێکیش لە دوای یەکدا بـێن و هـەمان سەروایان هەبێت.

## چوارەم: لە ڕووی (کێش)ەوە

کێشـی هـۆنراوەی داسـتان لـە شـیعری (گـۆران)دا کێشـی پەنجەیـەو لـە شیعری کلاسیزمیشدا کێشی عەرووزی عەرەبییە، چونکە ئەدەبیاتی (گـۆران) بە زۆری بە کێشی پەنجەیان نووسیوە و نەهاتوونەتە نێو سیستمی عەرووزی عـــەرەبی، بـــەڵام شـــیعرە کلاســـیزمییەکانی کرمـــانجی خـــواروو و ژووروو پەیڕەوییان لە کێشی عەرووزی عەرەبی کردووە، ئەمـە لـە داستانەکانیشـیان کە بەو زارانە نووسراون ڕەنگی داوەتەوە، بۆیە (شـیرین و خوسـرەو) کـە بـە زاری (گۆران) نووسراوە لەسەر کێشـی پەنجـەی دە بڕگەییـە، داسـتانەکانی دیکــەش ئەوانــەی بــە زارەکــانی کرمــانجی ژووروو و خــواروو نووســراون، هەموویان پەیڕەوییان لە کێشی عەرووزی کردووە، ئەوەتا (یوسف و زولێخـا) و (مـەم و زیـن) بـە کێشـی (هـەزەجی شـەش هـەنگاوی ئـەخرەبی مـەقبوزی مـەحزوف) نووسـراونەتەوە، (دمدمنامـە)ش بـە کێشـی (موتـەقاڕیبی هەشـت هەنگاوی مەحزوف) نووسراوەتەوە، بۆ نموونە:

ـ وەختێ کە فەرهاد بەو کێش پڕ وەی
جە سەمت ساقی ئەجەل نۆشا مەی
نە بەحر دەروون شا ئەی پەژارە
نە عەرصەی دەوران مبۆ ئاوارە.[٦٥]

ئەم پارچەیە لە (شیرین و خوسرەو) وەرگیراوە، لەسەر کێشی پەنجەی دە بڕگەییە.

ـ تفلّی وەهە گۆ مەکت تەئەسسوف
– – ب / ب – ب – / ب – –
مفعول / مفاعلن / فعولن

تەفتیش بکەن کراسی یوسف
– – ب / ب – ب – / ب – –
مفعول / مفاعلن / فعولن

ئەڤ ڕەنگە ئەگەر ژ پێش قەتایە
– – ب / ب – ب – / ب – –
مفعول / مفاعلن / فعولن
یوسف کرییە نەهن وەفایە
– – ب / ب – ب – / ب – –

مفـــعول / مـــــــفاعلن / فـــعولن.[٦٦]

ئەم پارچەیە لە (یووسف و زولێخا) وەرگیراوە، وەکو دەردەکەوێت لەسەر کێشی عەروزییە، بەحرەکەی : هەزەجی شەش هەنگاوی ئەخرەبی مەقبوزی مەحزوفە.

وی بیٚ دڵی هەر ل ویٚ مەکان گرت

– – ب / ب – ب – / ب – –

مفـــعول / مـــــــفاعلن / فـــعولن

وی بلبلی بۆ خوە ئاشیان گرت

– – ب / ب – ب – / ب – –

مفـــعول / مـــــــفاعلن / فـــعولن

ئەو بلبل ئەگەرچی پڕ هەوەس بوو

– – ب / ب – ب – / ب – –

مفـــعول / مـــــــفاعلن / فـــعولن

زیندانیٚ بەدەن ل وی قەفەص بوو.[٦٧]

– – ب / ب – ب – / ب – –

مفـــعول / مـــــــفاعلن / فـــعولن

ئـەم پارچـەیە لـە (مـەم و زیـن) وەرگـیراوە، لەسـەر کێشـی عەرووزییـە، بەحرەکەی : هەزەجی شەش هەنگاوی ئەخرەبی مەقبوزی مەحزوفە.

**دا ئم ل چ یا یێ پەز د گێ را**

**– – ب/ ب – ب –/ ب – –**

**مـفعــول مــفاعــــلن فــــعـولـن**

**وی کەل لە ئی خوەش ل وێ د چێ را**

**– – ب/ ب – ب –/ ب – –**

**مـفعــول مــفاعــــلن فــــعـولـن**

**ئەم ما کو ش ڤان د گۆ ب لوو رەك**

**– – ب/ ب – ب –/ ب – –**

**مـفعــول مــفاعــــلن فــــعـولـن**

**ئا ما دە د کر ن شا ت و سوو رەك.**(٦٨)

**– – ب/ ب – ب –/ ب – –**

**مـفعــول مــفاعــــلن فــــعـولـن**

ئــەم پارچــەیەش لــە (لــەیلا و مــەجنون) وەرگــیراوە، لەســەر کێشــی عەرووزییـە، بەحرەکـەی : هـەزەجی شـەش هـەنگاوی ئـەخرەبی مـەقبوزی مەحزوفە.

دەگەڵ خانـــــــــــــــــــــــــــــی کوردان کە داوایەوە

ب – – – / ب – – – / ب – – – / ب –

فعـــولـن / فعـــولـن/ فعـــولن/ فـــــــــــعـو

لەبەر وی ئەبـــــــــــــــــــــــــــەو جۆرە پاڕایەوە

ب – – – / ب – – – / ب – – – / ب –

فعـــولـن / فعـــولـن/ فعـــولن/ فـــــــــــعـو

کە ئەی ڕۆڵەیـــــــــــــــــــــــــــی میری ئازایی کورد

ب – – – / ب – – – / ب – – – / ب –

فعـــولـن / فعـــولـن/ فعـــولن/ فـــــــــــعـو

بە شمشێری ئەو شـــــــــــــــــــــــێری دڕ هەڵدەورد.(٦٩)

ب – – – / ب – – – / ب – – – / ب –

فعـــولـن / فعـــولـن/ فعـــولن/ فـــــــــــعـو

ئـەم پارچـەیە لـە (دمدمنامـە) وەرگـیراوە، لەسـەر کێشـی عەرووزییـە، بەحرەکەی : موتەقارِیبی هەشت هەنگاوی مەحزوفە.

__پێنجەم: لە ڕووی (زمان)ەوە__

١ـ بە زمانی نەتەوەیی دەنووسرێت، لای کورد بـە کـوردی، ئەمـەش وەك چۆن لای عەرەب بە عەرەبی و لای فارس بە فارسی و بەم شێوەیە.

٢ـ داستانە کوردییەکان بە زارە سەرەکییەکانی (گۆران) و (کرمانجی ژووروو) و (کرمانجی خواروو) نووسراون.

٣ـ جگە لە وشەکانی زمانی کوردی سوود لە وشەی زمانانی دیکەی دراوسێی کوردیش وەکو عەرەبی و فارسی و تورکی وەردەگیرێت.

٤ـ شێوازی دەربڕین شێوازێکی ئەدەبی بەرزەو جیایە لە شێوازی ئاخاوتنی ئاسایی خەڵکی.

٥ـ هونەرەکانی ڕەوانبێژی بە زۆری لە دێڕەکانی (داستان)دا سوودیان لێ وەردەگیرێت و بە هۆیانەوە دێڕەکان قەبە و جوان و کاریگەرتر دەکرێن، بۆ نموونە:

ـ ئاخر خوداوەند بەخشندەی بێچوون
کەریم بێ باک کار (کن فیکون).(٧٠)

لەم دێڕەدا بە لانی کەم ئەم هونەرانە هەیە:

١ـ دێڕەکە سێ هەواڵ لە بارەی خوای گەورەوە ئەدات، کە: بەخشندەی بێچوونە، کەریم و بێ باکە، بۆ کارەکانی خۆی بە (کن فیکون)ێك جێبەجێی کردوون، ئەم هەواڵانەش هەواڵی ڕاستن و تەواوی ئایەتە قورئانییەکان و فەرموودەکانی پێغەمبەر (دروود و سڵاوی خوای لەسەر) و بەڵگە ئەقڵی و واقیعی و مەنتقییەکانیش شایەدی ڕاستی بۆ دەدەن و ڕای پێچەوانە هەڵناگرن، بۆیە ئەم هەواڵە (هەواڵی بێگومان ڕاست)ە.

٢ـ (کن فیکون) کە لە دێڕەکە هاتووە، تێلنیشانە بۆ ئایەتی پیرۆزی ﴿إنما امره اذا اراد شيئا أن يقول له كن فيكون﴾.

- (ما كان محمد) ته ڕوتبه
ئه‌فلاك ژ بۆ ته‌نیمی عوتبه.[٧١]

له‌م دێڕه‌دا ئه‌م هونه‌رانه هه‌یه:

١- (ما كان محمد) تێلنیشانه بۆ ئایه‌تی پیرۆزی: ﴿ما كان محمد ابا احد من رجالكم ولكن رسول الله وخاتم النبيين وكان الله بكل شيء عليما﴾.

٢- وشه‌كانی (ڕوتبه) و (عوتبه) ڕه‌گه‌زدۆزی ناته‌واویان درووست كردووه، له جۆری (هاوكێشی).

- ئه‌م غافل و عاتل و گونه‌هكار
ماییینه د قه‌یدی نه‌فسی ئه‌ممار.[٧٢]

له‌م دێڕه‌دا ئه‌م هونه‌رانه هه‌یه:

١- نه‌فسی ئه‌ممار: تێلنیشانه بۆ ئایه‌تی پیرۆزی ﴿ان النفس لأمارة بالسوء الا ما رحم ربي﴾.

٢- غافل و عاتل و گونه‌هكار به‌سه‌ریه‌كه‌وه كۆ كراونه‌ته‌وه‌و كراونه‌ته په‌سنی ئێمه، به‌مه‌ش (كۆكردنه‌وه)یان دروست كردووه.

٣- ڕسته‌كه خۆی هه‌واڵێك ده‌گه‌ینێت، كه بێ ئاگایی و گوناهكاری مرۆڤه، له‌گه‌ڵ كه‌وتن له كۆتی نه‌فسی به‌ددا، ئه‌وه‌ش (خه‌به‌ری بێگومان ڕاسته)، چونكه به‌ڵگه ئاینی و ئه‌قڵییه‌كان گه‌واهی ڕاستی بۆ ده‌ده‌ن.

٤- قه‌ید دراوه‌ته پاڵ (نه‌فسی ئه‌ممار)، ئه‌وه‌ش ڕاست نییه، چونكه نه‌فس قه‌یدی نییه، به‌ڵام به واته: نه‌فس وه‌كو دوژمنێكه ئێمه به قه‌یدی خۆی ده‌به‌ستێته‌وه، به‌وه‌ش خوازه‌ی زمانی له جۆری (خواستن) دروست بووه.

٥ـ غافل و عاتل و گونەهکار (تایبەت)ن، دراونەتە پاڵ (ئێمە)، کە مرۆڤین و (تایبەتدار)ە، ئەوەش (تایبەتی ڕاستەقینە)یە، چونکە ئەم سیفەتانە لە ڕاستیدا هی مرۆڤن.

ـ فیلجوملە چ ئەووەل و چ ئاخر

ئەلقیصصە چ موئمین و چ کافر

هەریەك ژ تەڕا وە بوونە مەزهەر

ئەو ڕەنگە دووان توو بوویی موزمەڕ.(٧٣)

لەم دێڕەدا ئەم هونەرانە هەیە:

١ـ (چ) ئاوەڵناوی پرسە، چوار جار لە پاڵ وشەکانی (ئەووەل) و (ئاخیر) و (موئمین) و (کافر) گێڕدراوەتەوە، بەوەش (گێڕانەوە)ی دروست کردووە.

٢ـ وشەکانی (ئەووەل) و (ئاخیر) و (موئمین) و (کافر) بەیەکەوە دژو پێچەوانەی یەکن و هەریەکەشیان ڕەگێکی سەربەخۆی هەیە، بەوەش (دژیەکی فەرهەنگی)یان دروست کردووە.

ـ ئەڤ غیرەت و ئەڤ علووی هیممەت

بو مانعێ حەملێ بارێ میننەت.(٧٤)

لەم دێڕەدا ئەم هونەرانە هەیە:

١ـ (ئەڤ) دوو جار لە پاڵ وشەکانی (غیرەت) و (هیممەت) گێڕدراوەتەوە، بەوەش هونەری (گێڕانەوە) دروست بووە.

٢ـ وشــەكانی (میننــەت) و (هیممــەت) ڕەگــەزدۆزی ناتــەواو لــە جــۆری (هاوكێشی) دروست دەكەن، چونكە لەسەر یەك كێشن، ئەگەرچی لە زۆربـەی پیتەكانیشیان لێك جیاوازن.

٣ـ دێڕەكـە هـەواڵێك دەگـەینێت، ئـەویش ئەوەیـە كـە ئـازایی و هیممـەت بەرزی كورد بووەتە هۆی ئەوەی میننەتی كەس هەڵنەگرن، ئەوەش (هـەواڵی گوماناوی)یە، چونكە دەشێت شاعیر بە سـۆزی نەتـەوەیی ئـەوەی گوتبێـت، دەنـا هەواڵەكـە ئـەوە نییـە لای هــەمووان چەسـپاو بێـت و ڕای دیكـەش هەڵدەگرێت.

- عیسای دەما د خوەندی ئینجیل
بەحسا وی دكر ب وەحی و تەنزیل
گۆ: (مژدە دەدەم ڕەسولی ئەمجەد
دێ پاشیێ م بیێ بناڤیێ ئەحمەد).[٧٥]

لەم دێڕەدا ئەم هونەرانە هەیە:

١ـ گۆ: (مژدە دەدەم ڕەسولی ئەمجەد
دێ پاشیێ م بیێ بناڤیێ ئەحمەد)

تێلنیشانە بۆ ئایـەتی پـیرۆزی ﴿ومبشـرا برسـول یـأتي مـن بعـدي اسمـه أحمد﴾.

٢ـ هەواڵەكـە (هــەواڵی بێگومــان ڕاســت)ە، چــونكە قورئــانی پــیرۆز و پێغەمبــەری ئیسـلام (درووود و سـڵاوی خـوای لەسـەر) و دەقـە دروسـتەكانی ئاینی مەسیحی (ئینجیل) شـایەدی ڕاسـتی بـۆ دەدەن و لـە خانـەی گومـانی وەدەر دەنێن.

٣ــ وشــەکانی (ئەمجــەد) و (ئەحمــەد) ڕەگــەزدۆزی ناتــەواو لــە جــۆری (هاوکێشی) دروست دەکەن، چونکە ئەگەرچــی لــە زۆربــەی پیتــەکانیان لــێ: جیاوازن، بەڵام هەردووکیان لەسەر یەك کێشن.

- دەعوا خوە دکر ب دەست و ئە زمان

دەستێ وی ب سەیف و دەم بە قورعان.[٧٦]

لەم دێڕەدا ئەم هونەرانە هەیە:

لە نیوەدێڕی یەکەم (دەست و زمان) لەژێر (دەعواکردن)دا کۆکراونەتەوە، بەوەش (کۆکردنەوە) دروست بووە.

لە نیوە دێڕی دووەمدا (سەیف) بۆ (دەست) و (قورعان) بۆ (دەم) دابەش کراوە، بەمەش (دابەشکردن) بەرجەستە بووە.

بەسەریەکەوە دێڕەکە هونەری (کۆکردنەوە لەگەڵ دابەشکردن)ی دروست کردووە.

- شەڕی قارەمانانی دمدم مەکان

دژی زوڵم و یاسایی زەحاکەکان.[٧٧]

(زەحاکەکان) خوازەی زمانییە لــە جــۆری (خواســتنی ئاشــکرا) مەبەســت لێی کەسانێکی شەڕخواز و خوێنڕێژی وەکو (زەحاك)ە.

# ئەنجام

دوای لێکۆڵینەوە لە بنج و بناوانی (داستان) و جۆر و تیۆرەکانی، ئەم باسە بەو ئەنجامانە گەیشت:

١ـ داستان هونەرێکی شیعری کلاسیزم و ئەدەبی ڕەسەنی کوردییە.

٢ـ زمانی دەربڕینی داستان زمانێکی ئەدەبی بەرزو پڕ لە بەلاغەت و سنعەتە، لە بەیت نزیکە، بەڵام لێیشی جیاوازە، لەبەر ئەو وەسفانەی پێشووی، هی سەردەمی سەرهەڵدان و پەیڕەوی کردن لە ئەدەبیاتی هونەری بەرزە، زیاتر لە جۆرێکی هەیە، وەکو قارەمانی و ئاینی (کۆمەڵایەتی) و ئەڤینی، دەکەوێتە خانەی ئەدەبیاتی هونەری بەرزەوە.

٣ـ داستانی کوردی بە زارە سەرەکییەکانی گۆران و کرمانجی ژووروو و کرمانجی خواروو نووسراونەتەوە.

٣ـ داستان هەندێ لە سیمای بەیت لە خۆوە دەگرێت و لە هەندێ ڕووەوە بەو دەچێت، بەڵام لە گەلێ ڕووەوەش لە ئەو جیاوازە.

٤ـ داستان لە زاری (گۆران)دا وەکو زۆربەی شیعری بەرزی ئەو زارە بە کێشی پەنجە دەنووسرێتەوە، لە زارەکانی کرمانجی خواروو و کرمانجی ژووroووش بە کێشی عەرووزی دەنووسرێ.

٥ـ لە ڕووی فۆڕمەوە داستان هۆنراوەیەکی درێژە، پێك دێت لە ژمارەیەك غەزەل، ئەوانە هەموویان بە سەروای گۆڕاو (جووت سەروا) دەنووسرێن.

٦ـ لە ڕووی سەردەمەوە داستان هی قۆناغێکی پێشکەوتووترە لە بەیت.

٧ــ گرنگترین تیۆرەکانی داستان لە ڕووی داڕشتنەوە بریتینە لە: (دەستپێکردن بە ناوی خوا ـ سڵاوبارانکردنی پێغەمبەر (دروود و سڵاوی

خوای لەسەر) ـ داوای یارمەتیکردن لـە خـودا بـۆ سـەرکەوتن لـە هۆنینـەوەی داسـتانەکە ـ داسـتان قارەمـانی بێـت، یـان ئـاینی و ئـەڤینی دوو قارەمـانی هەیـە، لـە داسـتانی قارەمانیـدا قارەمـانی سـەرەکی ئـەو سـەرکردەیە، کـە داسـتاننووس پیـای هەڵـدەدا، قارەمـانی دووەمـیش ئەوەیانـە، کـە دوژمنـی قارەمانی سەرەکییە، لەو بارەشدا داسـتاننووس هەمیشـە سـیفەتە جـوان و بەهێزەکان دەداتە قارەمانی یەکەم و سیفەتە قێزەون و لاواز و خراپـەکانیش دەداتـە قارەمـانی دووەم، بـەڵام لـە داسـتانی ئـەڤینی هـەردوو قارەمـان بـە سیفاتی جوان وەسـف دەکـرێن ـ لـە (داسـتان)دا هەمیشـە بابەتـەکان وەکـو ئەڵقەیەکی بەیەکگرێدراو بە دوای یەکدا دێن، هەمیشە دێڕی دووەم دێڕەکـەی پێشە خۆی و پارچەی دووەم پارچەکەی پێشەخۆی تەواو دەکـات ـ داسـتان بە ڕاناوی کەسـی سـێیەم دەهۆنرێتـەوە ـ داسـتانی کـوردی کۆتاییەکـەی بـە مـەرگی قارەمـان دێـت، واتـە: داسـتان لـە ئـەدەبی کوردیـدا بـە کارەسـات و تراژیدیا بە کۆتا دێت ـ ناوی نووسەر دەخرێتە ناو داستان ـ ساڵی هۆنینەوەی داسـتان ئامـاژەی بـۆ دەکرێـت ـ لـە دوا پەڕەگرافـەکانی داسـتان دوعـای لێخۆشبوون لە خوا دەکرێت.

# پەراوێزەکان

١ـ بڕوانـه: أحمـد أمـين، النقـد الأدبـي، مكتبـة النهضـة المصـرية، الطبعـة الخامسة، القاهرة، ١٩٨٣، ص ٦٩.

٢. د. محمد حسن عبدالله، فنون الأدب، دار الكتب الثقافية، الطبعة الثانية، ١٣٩٨هجرية/١٩٧٨ ميلادية، ص ١٧.

٣ـ شبكة بايدو، دون اسم الكاتب، ٢٠٠٦/٦/٨.

٤ـ شبكة الرأي، ٢٠٠٦/٦/٨.

٥ـ شبكة الرأي، ٢٠٠٦/٦/٨.

٦ـ بڕوانه: هەردوو کتێبی: ئەڕیسـتۆتالس، هونـەری شـیعر (پۆیتیکـا)، و: حەمید عەزیز، سلێمانی ٢٠٠٥.. لەگەڵ: هـۆراس، هونـەری شـیعر، و: حەمیـد عەزیز، چاپی دووەم هەولێر ٢٠٠٥.

٧ـ شیرین و خوسرەو، لا ١.

٨ـ سەلیمی هیزانی، یوسف و زولەیخا، لا ٢٦.

٩ـ ئەحمەدی خانی، مەم و زین، و: هەژار، پاریس، ١٩٨٩، لا ٣.

١٠ـ حارسی بەتلیسی، لەیلا و مەجنوون، لا ٢٥.

١١. مەلا کەریمی فیدایی، دمدمنامه، چاپی یەکەم، سـاڵی چـاپ: ١٣٧٧ی هەتاوی، ئینتیشاراتی سەقز (محەمەدی)، لا ٢٦.

١٢ـ بڕوانه: (مسند امام احمد، ژ: ٨٠٣٥٥).

١٣ـ شیرین و خوسرەو، لا ٥.

١٤ـ یوسف و زولەیخا، لا ٣١.

١٥ـ مەم و زین، لا ١٢و١٣.

١٦ـ حارسی بەدلیسی، لەیلا و مەجنون، لا ٣٠.

١٧ـ دمدمنامە، لا ٣٠.

١٨ـ شیرین و خوسرەو، لا ١٣و١٤.

١٩ـ یوسف و زولەیخا، لا ٢٩.

٢٠ـ مەم و زین، لا ٣٢.

٢١ـ لەیلاو مەجنون، لا ٤٣.

٢٢ـ دمدمنامە، لا ٣٠.

٢٣ـ شیرین و خوسرەو، لا ١٥.

٢٤ـ یوسف و زولەیخا، لا ٣٥.

٢٥ـ مەم و زین، لا ٣٢.

٢٦ـ لەیلا و مەجنون، لا ٤٣.

٢٧ـ دمدمنامە، لا ٢٥١.

٢٨ـ شیرین و خوسرەو، لا ١٧.

٢٩ـ یوسف و زولەیخا، لا ٢٩.

٣٠ـ مەم و زین، لا ٣٢.

٣١ـ لەیلا و مەجنون، لا ٤٣.

٣٢ـ دمدمنامە، لا ٢٥١و٢٥٢.

٣٣ـ شیرین و خوسرەو، لا ١٨.

٣٤ـ یوسف و زولەیخا، لا ٤٣.

٣٥ـ مەم و زین، لا ٣٤.

٣٦ـ لەیلا و مەجنون، لا ٤٥.

٣٧ـ دمدمنامە، لا ٣١.

٣٨- دمدمنامه، لا ٣٢و٣٣.

٣٩- دمدمنامه، لا ٣١.

٤٠- دمدمنامه، لا ٣١.

٤١- دمدمنامه، لا ٣١.

٤٢- دمدمنامه، لا ٢٣٦.

٤٣- یوسف و زولەیخا، لا ٦٣.

٤٤- یوسف و زولەیخا، لا ٨٩.

٤٥- لەیلا و مەجنون، لا ٤٥و٤٦.

٤٦- لەیلا و مەجنون، لا ٤٩.

٤٧- لەیلا و مەجنون، لا ٧٧.

٤٨- لەیلا و مەجنون، لا ٥٠.

٤٩- شیرین و خوسرەو، لا ٦.

٥٠- شیرین و خوسرەو، لا ١٥.

٥١- یوسف و زولەیخا، لا ٣٤.

٥٢- بڕوانە: یوسف و زولەیخا، تەحسین دۆسکی، لا ١٤و١٥.

٥٣- مەم و زین، لا ٢١٧.

٥٤- بڕوانە: حارسێ بەدلیسی، لەیلا و مەجنوون، بەرهەڤکرن: تەحسین دۆسکی، لا ٤٢.

٥٥- بڕوانە: حارسێ بەدلیسی، لەیلا و مەجنوون، بەرهەڤکرن: تەحسین دۆسکی، لا ١٧و١٨.

٥٦- دمدمنامه، لا ٢٥١.

٥٧- شیرین و خوسرەو، لا ٧٩٥.

٥٨ـ بڕوانه: شیرین و خوسرەو، لا ٧٩٥.

٥٩ـ یوسف و زولەیخا، لا ٢٩٤و٢٩٥.

٦٠ـ مەم و زین، لا ٢١٧.

٦١ـ لەیلاو مەجنون، لا ١٣٩.

٦٢ـ بڕوانه: د. شوکرییه ڕەسول، ئەدەبی کوردی و هونەرەکانی ئـەدەب، چاپخانەی تەعلیم عالی، هەولێر، ١٤١٠هیجری، ١٩٨٩ ز، لا ٨٩.

٦٣ـ شیرن و خوسرەو، لا ٨.

٦٤ـ مەم و زین   لا ٢٥.

٦٥ـ شیرین و خوسرەو، لا ٤٠٠.

٦٦ـ یوسف و زولێخا، لا ١٧٨.

٦٧ـ مەم و زین، لا ١٢٠.

٦٨ـ لەیلا و مەجنون، لا.

٦٩ـ دمدمنامە، لا ٢٣٨.

٧٠ـ شیرین و خوسرەو، ١٩.

٧١ـ  یوسف و زولەیخا، لا ٣٢.

٧٢ـ مەم و زین، لا ٥.

٧٣ـ مەم و زین، لا ٧.

٧٤ـ مەم و زین، لا ٢٣.

٧٥ـ مەم و زین، لا ١٣و١٤.

٧٦ـ مەم و زین، لا ١٤.

٧٧ـ دمدمنامە، لا ٣١.

# سەرچاوەکان


**به زمانی کوردی (کتێب):**

١ـ ئەحمەدی خانی، مەم و زین، و: هەژار، پاریس، ١٩٨٩، لا ٣. ئەحمەدی خانی، مەم و زین، و: هەژار، پاریس، ١٩٨٩، لا ٣.

٢ـ ئەرپیستۆتالس، هونەری شیعر (پۆیتیکا)، و: حەمید عەزیز، سلێمانی ٢٠٠٥.

٣ـ هۆراس، هونەری شیعر، و: حەمید عەزیز، چاپی دووەم هەولێر ٢٠٠٥.

٤ـ حارسێ بەدلیسی، لەیلا و مەجنوون، بەرهەڤکرن: تەحسین دۆسکی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ٢٠٠٤، هەولێر.

٥ـ خانای قوبادی، شیرین و خوسرەو، ئا: محەممەدی مەلا کەریم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٥.

٦ـ سەلیمی هیزانی، یوسف و زولەیخا، تەحسین دۆسکی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر.

٧ـ د. شوکرییە ڕەسول، ئەدەبی کوردی و هونەرەکانی ئەدەب، چاپخانەی تەعلیم عالی، هەولێر، ١٤١٠هیجری، ١٩٨٩ ز.

٨. مەلا کەریمی فیدایی، دمدمنامە، چاپی یەکەم، ساڵی چاپ: ١٣٧٧ی هەتاوی، ئینتیشاراتی سەقز (محەمەدی)، کوردستانی ئێران.

**به زمانی عەرەبی (کتێب):**

٩ـ أحمد أمين، النقد الأدبي، مكتبة النهضة المصرية، الطبعة الخامسة، القاهرة، ١٩٨٣.

١٠. د. محمد حسن عبدالله، فنون الأدب، دار الكتب الثقافية، الطبعة الثانية، ١٣٩٨هجرية/١٩٧٨ ميلادية.

**به زمانی عەرەبی (ئەنتەرنێت):**

١١ـ شبكة بايدو، دون اسم الكاتب، ٢٠٠٦/٦/٨.

١٢ـ شبكة الرأي، دون اسم الكاتب، ٢٠٠٦/٦/٨.

# ملخص البحث

## الشعر الملحمي في الأدب الكردي

أدريس عبدالله مصطفى

ان هذا البحث الموسوم بـ(الشعر الملحمي في الأدب الكردي) دراسة نقدية تطبيقية، تعد بمثابة محاولة لتحديد سمات الشعر الملحمي ونظرية تأليفه كأحدى الفنون الأدبية الراقية في الأدب الكوردي، وذلك لتبيان خصائص هذا الفن من غيره خصوصا (البيت) الذي يمثل مرحلة بدائية لهذا النمط من التأليف، وقد تمخض من البحث نتائج عدة، نوجزها في النقاط التالية:

١ـ الملحمة هو فن شعري قومي، يكتب عادة بالوزن (العروضي) وأحيانا وعند شعراء الكوران فقط يكتب بالوزن (السيلابي) القومي، قريب في خصائصه من (البيت)، وهناك فروق كثيرة بينهما، فهو فن القرون المتتالية بعد ظهور الشعر الفني الرفيع، له انواع عدة مثل البهلواني، والديني (الأجتماعي)، والغرامي، وهو يصنف ضمن دائرة الأدب الرفيع الكلاسيكي للكورد.

٢ـ أهم نضريات الشعر الملحمي من حيث التأليف هي:

ـ الأبتداء باسم الله سبحانه.

ـ ومن ثم ذكر الصلاة والسلام على رسول الله (صلى الله عليه وسلم).

ـ ثم الدعاء والتضرع الى الله كي يسهل مهمة الشاعر ويوفقه في تأليف ملحمته.

ـ يتكون الشعر الملحمي من شخصيتين رِئيستين، ففي الشعر الملحمي البهلواني يصف المؤلف البطل الرئيس ويمدح مواقفه ويضفي عليه الصفات الحميدة التي يتميز بها الأبطال في التأريخ، وأما البطل الثاني هي شخصية رئيسة أخرى الا انه لا تحضى بمدح المؤلف بل يكن مصدر سخريته ولا

توصف الا بما يضعف قوتها وشخصيتها، أما الشاعر في الشعر الملحمي الغرامي فيمدح كلتا الشخصيتين الرئيستين فيه، وهما مثلا (ليل و مجنون) أو (مم و زين) وهكذا، فيصف المؤلف كليهما بالصفات الحميدة والمحببة لدى الجميع.

- يتمسك الشعر الملحمي في تقديم أجزائه احيانا بالسرد القصصي وأحيانا بالحوار بين شخصياته، فما من مشهد الا وهو مكمل للمشهد الذي يليه، وهكذا حتى تصل الملحمة الى نهايتها.

- يتحدث الشعر الملحمي بالضمير الغائب وهو ضمير الشخص الثالث.

- غالبا ما ينتهي الشعر الملحمي بمأساة.

- في جميع الحالات يوضع اسم مؤلف الشعر الملحمي وتأريخ تأليفها داخل الشعر الملحمي.

- في المقطع الأخير يدعو المؤلف الباري عز وجل أن يغفره ويغفر لغيره من المسلمين.

٤- لغة الشعر الملحمي لغة متميزة أدبية بليغة، هي لغة النخبة المثقفة ولم تكن اللغة البسيطة التي يتكلم بها الناس البسطاء والأميين.